حوزەیرانی
2006
ســــــاڵی شەشەم

# سەردەم 45

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

—سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

—تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

—بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

—هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.



ناونیشان

سلێمانی — فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك



## فایلی ژمارە (ئەدۆنیس)



## وێستگەكانی سەردەم



**نرخی (1200) دینارە**

# بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

ریاز ئەلزوعبی

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵلا

## دەستپێك

مرۆڤی ئیمرۆ ژیانێکی پڕ شڵەژان بەسەردەبات، گەلێك کێشەی کەڵەکەبوو هەن کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە، جا لە کۆمەڵگەکەی خۆیدا بێت یاخود لەسەر ئەم ئەستێرە خاوەن سەرچاوە سنووردارەی هەڕەشەی لێ دەکات. بۆیە ناچارە بەرەنگاری ئەو کێشانە ببێتەوەو بەدوای ئەو ئەقڵە ڕەخنەگرو داهێنەرانەدا بگەرێت کە دەتوانن چارەسەری نوێ‌و نموونەیی بدۆزنەوە، هەتا شڵەژانەکەی ئارام بکەنەوەو ڕادەی ئەو ململانێیانە کەمبکەنەوە کە بەدەستیانەوە دەناڵێنێ‌و یارمەتیدەری بن بۆ گەشەپێدان‌و پێشخستنی کۆمەڵگەکەی. بەوجۆرە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەو داهێنرانە، بە پێکهاتە جۆربەجۆرەکانیانەوە، یەکێکە لەو مەسەلانەی ڕووبەڕووی توێژەرەکان بەگشتی‌و پەروەردەکارەکان بەتایبەتی بۆتەوە.

(تۆینبی) ساڵی 1962ی زایینی جەختیکردۆتەوە لەسەر گرنگیی پەرەپێدانی تواناکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەو داهێنەرانە بۆ هەر کۆمەڵگەیەك‌و دەڵێت: "ڕەخساندنی دەرفەتی گونجاو بۆ پێگەیشتنی توانا بیرکەرەوەکان، مەسەلەی ژیان یان مردنە بۆ هەر کۆمەڵگەیەك"[1].

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بە زگماکی لە مرۆڤدا نییە، لەبەرئەوەی شارەزایی شتێکە مرۆڤ فێریدەبێت‌و پێویستی بە مەشقکردن‌و ڕاهاتن هەیە. هەروەها بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە گرێدراوی تەمەنێکی دیاریکراو نییە، چونکە هەر تاکێك دەتوانێت بەپێی ئاستی توانا ئەقڵی، هەستەکی، وێناکاری‌و ڕووتکارییەکانی خۆی بەکاریبهێنێ. بەوپێیەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە ئەنجامی شارەزاییەکانی دیکەی وەك لۆژیکی بەڵگاندن‌و سۆراخکاری‌و شیکاری بەدەستدێت‌و سەختە مێشك بێ پشتگیریکردنی پرۆسەکانی بیرکردنەوەی دیکە سەرقاڵی پرۆسەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بێت.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە کلیلی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەیە کە ڕۆژانە ڕووبەڕووی مامۆستاکان دەبنەوە، چونکە ئەگەر

ئەوانە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەکارنەبەن، ئەوا دەبنە بەشێك لە کێشەکە. هەمیشە مامۆستایان ڕووبەڕووی هەڵوێستگەلی وەها دەبنەوە کە ناچارن تیایاندا بڕیاری یەکلاییکەرەوە بدەن. لێرەشدا سازان لەگەڵ ئەو هەڵوێستە نوێیانەو نوێکردنەوەی بەردەوامی زانیارییەکان، بەهانە بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دێننەوە.

لەسایەی ئەو بایەخدانانەدا بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، وەك خەسڵەتێکی ئەقڵیی پێویست بۆ مرۆڤ، ئەم لێکۆڵینەوەیە تاوتوێی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیەی مرۆڤ دەکاتو دەگەڕێت بەدوای ئەو خەسڵەتەدا لە پۆلەکانی قوتابخانەدا.

## پەروەردەکردنی ڕەخنەگرانە

ئامانجی پەروەردەکردنی ڕەخنەگرانە، پێکهێنانی ئەقڵە بەشێوەیەك کە بتوانێت حوکمبدات بەسەر بیروڕاکان، وێناکردنەکانو داوەرییەکانی دیکەیەدا، بۆ زانینی ڕادەی تەبایی و گونجاویان لە ڕووی عەقڵییەوە، پێش پشت پێ بەستنیان. چونکە ئەقڵیەتی ڕەخنەگرانە قبوڵی مەسەلەو ڕووداوەکان ناکات، بەو شێوەیەیەی بۆی دەگێڕنەوەو خێرا بڕوایان پێ ناکات، بەڵکو دەیانخاتە ژێر کاریگەریی تەرازووی ئەقڵو سەنگی مەحەکی ئەزموونەوە، بۆ دڵنیابوون لە ڕادەی ڕاستی یان چەوتیان. بۆیە (دیکارت) لە ڕێسا بەناوبانگەکەیدا: "بێ لێکدانەوە" سوورە لەسەر ئەوەی نابێت مرۆڤ دان بە حەقانیەتی مەسەلەیەکدا بنێت، ئەگەر خۆی لێی دڵنیانەبێت.

پەروەردەی ڕەخنەگرانە پێچەوانەی تەلقیندادانە، چونکە ئەمەی دوایی مرۆڤ دەکاتە قاپێکی وەرگرو هەموو جۆرە کارلێککردنێکی داهێنەرانەی تێدا دەکوژێتو تاقەڕێگەیەکیش بۆ تێوەچوون لەگەڵ کۆمەڵدا، سەرشۆڕکردنی تەواوەتیە بۆ وێناکردنەکانو ملکەچکردنە بۆ ئەو ڕێسایانەی تیرە، خێزان یان هاوەڵی دەیانسەپێنێ، ئەمەش بە لەدەستدانی توانای پێداچوونەوە بە بیروڕا پێشوەختەکاندا یان بەرهەمهێنانی بیروڕای نوێ. بۆ ئەوەی پەروەردە بتوانێت بەهرەی ڕەخنەگرتن پەرەپێبدات، پێویستە چەند دەتوانێت لە تەلقینداندان دوورکەوێتەوە، بەوپێیەی ئەوە ئاستەنگێکی سەرەکیو تگەرەدروستکەرە بۆ هەر خرۆشاندنێکی دەروونیو ئەقڵیو هەنەزای یەکەمی گوێدێریو ملکەچییە.

مامۆستا هەمیشە دەتوانێت هانی خوێندکارەکانی بدات بۆ خوێندنەوەی پشکنێرانەو پەرەبدات بەتوانای وردبینینیان بۆ تابلۆو دەرهاویشتەکانو خۆی پەلەنەکات لە خستنە ڕووی ڕێسا ڕاستو چەوتەکان، کاتێك هێشتا لەلایەن خوێندکارانەوە دەخرێنەڕوو، بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە بەشداربکاتو هانیانبدات بۆ خستەکاری ئەقڵ. لەکۆتاییدا مامۆستا بە پوختەکردنەوەی هەڵوێستەکەو کۆتاییهێنانی بڕواهێن مەسەلەکە جڵەودەکاتو ئەوە دەخاتەڕوو کە بڕیاری ڕاست بەرهەمی بیرکردنەوەو بەشداریکردنی بەکۆمەڵە، ئەگەرچی هەوڵدانی چەوتیشی تێدابێت.

## واتای بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

کاتێك بەو پێناسە جۆربەجۆرانەدا دەچینەوە کە لە بەرهەمە بڵاوکراوەکاندا سەبارەت بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە خراونەتەڕوو، ڕەچاوی ئەوە دەکەین توێژەرەکان بۆ دیاریکردنی واتای بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە جیاوازن. ئەمەش دەشێت بگەڕێتەوە بۆ ئاڕاستەی توێژەرەکانو بایەخدانە زانستییەکانیان لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە بگەڕێتەوە بۆ لایەنەکانو ئاڵۆزیی دیاردەکە.

**لە زماندا:** کرداری "ڕەخنە" لە زمانی عەرەبیدا بەمانای لێوردبوونەوە بۆ جیاکردنەوەی چاكو

خراپ دێت، واتە دۆزینەوەی ساختە. لە فەرهەنگی (الوسيت)دا "ڕەخنەی شیعر" بەمانای خستنەڕووی چاك یان خراپ هاتوە. ئەمەش مانای دەرخستنی چاکەو خراپەکانو پاککردنەوەو گەمارۆدانی ئەوانەیە کە لە ڕاستی لایانداوە.

**لە ڕووی فەلسەفیەوە:** ڕەخنە مانای بەکارهێنانی مەرجو پێوەرەکانی ئەقڵە کە وێناکردنە ڕاستەکان دەستەبەردەکەنو بەهایەکی ڕاست دەدەنە خودی بیروڕاو ڕێساکان.

**لە پەروەردەدا:** چەند پێناسەیەك بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەدیدەکرێت:

چەمکی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری (سوکرات) کە ئاشنابوو بە مانای چەسپاندنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بۆ ناڕاستەکردنی ڕەفتارەکان. لەسەردەمی نوێدا بزووتنەوەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لەگەڵ بەرهەمەکانی (جۆن دیوی) دەستیپێکردوە، کاتێك ئەو بیرۆکەی بیرکردنەوەی ڕەتکراوەو شوێن هەڵگرتنی بەکارهێناوە. لەهەشتاکانی سەدەی بیستەمیشدا فەیلەسووفەکانی زانکۆکان هەستیان بەوە کردوە دەبێت فەلسەفە شتێك بکات بۆ بەشداربوون لە بزووتنەوەی چاکسازیی قوتابخانەکانو پەروەردەدا. ئینجا دەروونزانە مەعریفەخوازەکانو پەروەردەکارەکان دەستیانکردوە بە بنیاتنانی تێڕوانینە فەلسەفیەکانی تایبەت بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەو خستویانەتە ناو چوارچێوەی مەعریفیو پەروەردەکارانەوە، بۆ بەکاربردنی توانا ئەقڵیو مرۆییەکان.[2]

وێڕای بوونی چەندین پێناسە بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، دەشێت ئەو پێناسانە بە دوو شێوە ڕێکخرێن:

یەکەم/ مەبەستی جەختکردنەوەیە لەسەر ئامانجی تاکەکەسی، وەك ئەوەی لە پێناسەکەی (ئینیس *Ennis*)دا هاتوەو دەڵێت: بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، بیرکردنەوەیەکی وێناکارانەی ماقوڵە بۆ ئەو بڕیاردانەی تاك بیری لێ دەکاتەوە یان جێبەجێیدەکات، لەپێناو گەشەدان بە بیرکردنەوەو جڵەوکردنیدا.. بیرکردنەوەی تاکە دەربارەی ئەو شێوازەی بیری پێدەکاتەوە، هەتا بیرکردنەوەکەی ڕاستترو ڕوونتربێتو بەرگریی لێ بکات.

دووەم/ئەوەیە کە جەخت لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە. بەپێی ئەمە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پرۆسەیەکی مێشکە مرۆڤ ئەنجامیدەدات کاتێك داوای لێدەکرێت حوکمبدات بەسەر مەسەلەیەکدا یان گفتوگۆ دەربارەی بابەتێك بکات یاخود هەڵسەنگاندنێك ئەنجامبدات. هەروەها حوکمدانە بەسەر ڕاستیی بیروڕایەك یان باوەڕێكو کاریگەرییدا، ئەمەش لە ڕێگەی شیکردنەوەو لێك جیاکردنەوەو تاقیکردنەوەی زانیارییەکانەوە، بەمەبەستی جیاوازیکردن لەنێوان بیروڕا پۆزەتیڤو نێگەتیڤەکاندا.

(ئینیس *Ennis*) لە پێناسەکەیدا پشت بە دوو گریمانە دەبەستێ[3]:

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە چالاکییەکی مێشکیی پراکتیکییەو بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانە لەخۆدەگرێت. هەروەها بریتییە لە داڕشتنەوەی گریمانەکان، پرسیارەکان، تاقیکردنەوەکان، پلاندانان بۆ تاقیکردنەوەکان.

(ئینیس *Ennis*) خەسڵەتە پراکتیکییە کارڕاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەی بەم شێوەیە دیاریکردوە[4]:

1- ڕاستکردنەوەی گفتوگۆکان.
2- لێکدانەوە.
3- ناسینی گریمانەکان.
4- هەڵسەنگاندن.
5- ئەنجامگیری.

وێڕای ئەوە، (ئینیس *Ennis*) ئامانجەکانی ئەو میتۆدانەی داناوە کە سەر بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەن و کردونی بە دوو جۆرەوە: توانستەکان و تواناکان.

پێناسەکەی (واتسۆن گلاسەر): بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە کۆڵینەوەیە لە بڕواکان و پێشنیارەکان لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەڵگانەی لایەنگیریدەکەن و ڕاستییەکانی پەیوەندیان پێوەی هەیە، لەبری بازدان ڕووەو سەرەنجامەکان.

(واتسۆن) گریمانەی ئەوە دەکات کە بیرکردنەوە سێ لایەن لەخۆدەگرێت:

1- پێداویستی بەو بەڵگەو گەواهیانەی داکۆکی لە بیروڕاو سەرەنجامەکان دەکەن، پێش دانان بەبڕواپێکراوییاندا.

2- دەستنیشانکردنی شێوازەکانی توێژینەوەی لۆژیکیانە کە بەشداریدەکات لە دیاریکردنی بەهاکانداو هەڵسەنگاندنی جۆرە جیاوازەکانی بەڵگەو خستنەڕووی ئەوەی کامیان بەشداریدەکات لەگەیشتنە سەرەنجامگەلی قبوڵکراو.

3- شارەزایی لە بەکارهێنانی گشت ئاقارەکان و بەهرەکانی پێشوودا.

(نیدلەر) [5] لە وتارەکەی خۆیدا دوانزە دانە لە شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دەخاتەڕوو و گریمانەی ئەوە دەکات ناسینی ئەو شارەزاییانە دەشێت ببێتە هۆی گۆڕینی ئەو پرۆگرامانەی دەبنە هۆی پەرەپێدانی شێوازەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە:

1-توانای دەستنیشانکردنی کێشەو مەسەلە ناوەندییەکان کە دەبنە هۆی دیاریکردنی بەشە سەرەکییەکانی سەلماندن یاخود بەڵگەهێنانەوە.

2-لێك جیاکردنەوەی لایەنی لێکچوون و جیاوازی کە بەشداریدەکات لە دەستنیشانکردنی خەسڵەتە جیاکارەکان و پۆلێنکردنی زانیارییەکان بۆ مەبەستی جۆربەجۆر.

3-بێلایەنکردنی زانیارییەکانی تایبەت بە بابەتەکەو کۆڵینەوە لەبارەیانەوەو جیاکردنەوەی زانیارییە سەرەکییەکان لەو زانیارییە پەراوێزییانەی پەیوەندیی کەمیان بە بابەتەکەوە هەیە.

4-دارشتنی ئەو پرسیارانەی بەشداریدەکەن لە تێگەیشتنی قوڵتری کێشەکەدا.

5-توانای پێشکەشکردنی پێوەرێك بۆ حوکمدان بەسەر جۆری تێبینی و سەرەنجامەکاندا.

6-توانای دەستنیشانکردنی ئەوەی داخۆ دەستەواژەکان یان سمبولەکان پەیوەندییان پێکەوەو بە ڕەوتی گشتییەوە هەیە.

7-توانای دیاریکردنی مەسەلە بەڵگەنەویستەکان و ئەو بیرۆکانەی ڕاشکاوانە لە سەلماندن و بەڵگەهێنانەوەکەدا دەرنەکەوتوون.

8-جیاکردنەوەی شێوازە (فۆرمە) دووبارەکان.

9-توانای دەستنیشانکردنی ڕاستیی سەرچاوەکان.

10- جیاکارەکردنی ئاقارو وێناکردنە جۆراوجۆرەکان سەبارەت بە دۆخێکی دیاریکراو.

11- دەستنیشانکردنی توانست، بەسایەتی و جۆرەکانی داتاکان لە چارەسەرکردنی بابەتەکەدا.

12- پێشبینیکردنی سەرەنجامە شیاوو شیمانەکراوەکان لە ڕووداوێك یان کۆمەڵە ڕووداوێکدا.

(پۆڵ)[6] پێیوایە دەبێت خوێندکاران بزانن مەیلێکی سروشتی لای خەڵکی هەیە بۆ بەهێندوەرگرتنی تێڕوانینمان بەرامبەر بەوانی دیکەو دەبێت بەردەوام هەوڵبدرێت بەسەر ئەو مەیلەدا زاڵبین. هەروەها جیاوازیدەکات لەنێوان "مانای لاواز"و مانای بەهێزی بیکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا، چونکە ئەو تاکانەی شارەزایی خۆیان دەخەنەکار بۆ شیکردنەوەو گفتوگۆکردن، بەمەبەستی هێرشکردنە سەر ئەوانەی لەگەڵیاندا

جیاوازن‌و کەمبایەخکردنی بیروڕاکانیان، "مانای لاواز"ی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پراکتیزەدەکەن، بەڵام بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەواتا بەهێزەکەی ئەوەیە کە تاك ڕزگاردەکات لە دۆخی دەستەوستاوبوون بەرامبەر بە دەرککردن بە تێڕوانینی ئەوانی دیکەو وای لێدەکات دەرك بە گرنگیی تاقیکردنەوەو تاوتوێکردنی ئەو بیروڕایانە بکات کە دژی بیروڕاکانی ئەون.

هەروەها (پۆڵ) بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەم شێوەیە پێناسەدەکات: "توانای داڕشتنی بیروڕاکانە لە گرووپگەلی نوێدا، بۆ هێنانەدیی ئامانجێکی دیاریکراو". لەکاتێکدا (مۆر) بیرکردنەوەی داهێنەرانە بەم شێوەیە پێناسە دەکات: "داڕشتنی شیاوی کێشەیەك یان ڕوونکردنەوەی دیاردەیەکە"، بەڵام بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەم جۆرە پێناسەدەکات: "پشکنین‌و هەڵسەنگاندنی ئەو چارەسەر یان ڕوونکردنەوانەیە". بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەو پرۆسە مێشکییە دەچێت کە تاك دەیخاتەڕێوە، کاتێك داوای لێ دەکرێت حوکم بەسەر مەسەلەیەکدا بدات یان گفتوگۆ دەربارەی بابەتێك بکات یاخود چارەسەرو ڕوونکردنەوەکان هەڵسەنگێنێ‌و دەشێت ئەو هەنگاوانە دیاریبکرێن کە تاك هەڵیاندێنێ کاتێك داوای لێدەکرێت حوکمبدات بەسەر مەسەلەیەکدا یان گفتوگۆ لەسەر بابەتێك بکات یاخود هەڵسەنگاندنێك ئەنجامبدات‌و دەکرێت ئەو هەنگاوانە دیاریبکرێن کە فێرخواز هەڵیاندەنێ بۆ **ئەوەی شارەزایی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەی تێدا بێتەئاراوەو** بەم شێوەیەی خوارەوە:

1- کۆکردنەوەی زنجیرە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو زانیاری‌و ڕووداوێك کە پەیوەندیان بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەوە هەیە.

2- خستنەڕووی بیروڕا جۆربەجۆرەکانی پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیە.

3- گفتوگۆکردن دەربارەی بیروڕا جیاوازەکان، بۆ دیاریکردنی ڕاستی‌و ناڕاستیان.

4- جیاکردنەوەی لانی بەهێزی‌و لاواز لە بیروڕا ناکۆکەکاندا.

5- هەڵسەنگاندنی بیروڕاکان بەشێوازێکی بابەتیانەی دوور لە لایەنداریێتی‌و خودخوازی.

6- سەلماندن‌و پێشکەشکردنی بەڵگە دەربارەی ڕاستیی بیروڕایەك یان ئەو حوکمدانەی بڕیاری لەسەر دەدرێت.

7- گەڕانەوە بۆ زانیاریی زیاتر، ئەگەر سەلماندن‌و بەڵگەهێنانەوە پێویستیان پێی هەبوو.

### پێناسەکانی دیکە[7]:

(بریال) پێیوایە بیرکردنەوەی وێناکردنخواز بەشێکە لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە یان ڕواڵەتێکیەتی، چونکە بە کۆمەڵێك خەیاڵکردنەوەی دوور لە شتە هەستییەکانی دادەنێ‌و بە کۆمەڵێك بیروڕای لۆژیکیی دادەنێ کە بەپێی شێوازو ڕێگەی تەقلیدی دەچێتەڕێوە (ڕۆیشتن لە سەرەتاوە بۆ گەیشتن بە گشتگیری). هەروەها پێیوایە زۆربەی تیۆرە زانستییە بەناوبانگەکان وەك بیرۆکەیەکی وێناکردنخوازی دوور لە واقیع‌و لۆژیك دەستپێکردوە، بۆیە بڕوای وایە دەکرێت پەرە بە داهێنان لای خوێندکاران بدرێت‌و دەرفەتیان بۆ بڕەخسێنرێ ئازادانە بیر لە شتە باوەکان بکەنەوەو ئەڵتەرناتیڤەکان‌و شیمانەکان بۆ شتە مەحاڵەکان دابنێن.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پشکنین‌و هەڵسەنگاندنی ئەو چارەسەرانەیە کە خراونەتەڕوو.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە چارەسەرکردنی کێشەکانە یان ساخکردنەوەی شتێك‌و

هەڵسەنگاندنیەتی، پشتئەستوور بەو پێوەرانەی پێشوەخت ڕێکەوتن لەسەریان هەبووە.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، ئەو بیرکردنەوەیە کە پێویستی بە بەکارهێنانی ئاستە مەعریفیە بەرزەکانی پۆلێنکردنەکەی (بلۆم) هەیە، واتە شیکردنەوەو پێکهێنان و هەڵسەنگاندن.

(سمیس) دەڵێت: بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە چەمکێکی گشتیەو گرێدراوی شارەزایی هەمەڕەنگی خوازراوە بۆ حوکمدان بەسەر ڕاستیو وردکاریی ئەو زانیاریانەی تیایدا هاتوون.

(جۆن دیوی) لە کتێبی "چۆن بیردەکەینەوە"دا دەڵێت: بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لەسەرخۆبوونە لە حوکمداناو دواخستنیەتی تاکو کاتی پێچینەوە لە مەسەلەکە.

**لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەدا کە بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە خراونەتەڕوو،** ئەو دوو توێژەرە پێناسەکەی (واتسۆن گلاسەر) پێڕەویدەکەن کە لە ئینسکلۆپیدیای دەروونناسیی پەروەردەکارانەدا لەسەری ڕێکەوتوون. هەروەها دەشێت بگەینە ئەم سەرەنجامانەی لای خوارەوە:

سەختیی دانانی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، چونکە هەندێك بە میتۆدێکی بیرکردنەوەیان داناوە، هەندێکی دیکە بە کۆمەڵێك شارەزایی پێناسەیانکردوە، کەچی گروپێکی دیکە بە پرۆسەگەلی ئەقڵیان ناوزەدکردوە.

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە ئاکارێکی تاکەکەسییە، زانستیبوونی بیرکردنەوە تیایدا هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی کێشەکەیە.

وێڕای زۆریی پێناسەکان بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، کەچی هەموویان لە چەند خاڵێکی هاوبەشدا پێکدەگەنەوە:

1- هەڵسەنگاندنی بەڵگە بەدەستەوەکان و سەرچاوەکانی زانیاری.

2- دوورکەوتنەوە لە بازدان بەرەو سەرەنجامەکان.

3- دەرفەت ڕەخسان بۆ مەشقکردن لەسەر بڕیارسازی.

4- بەکارهێنانی ئەقڵ بەشێوەیەکی زۆر چالاکانە.

### شتی نوێ لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا چییە؟(8)

- سەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوە نوێکان دەریانخستوە کە ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکانی زیرەکی دەربڕی ڕاستەقینەی ئاستی زیرەکی نین، چونکە گەلێك ڕواڵەتی زیرەکی هەن کە کاریگەریان لەسەر بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە هەیەو تاقیکردنەوەکانی زیرەکی نایانخوێننەوە.

- فێرکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بۆتە پێداویستییەکی زۆر پێویستو کارپێکردنی شارەزاییەکانی بیرکردنەوە یارمەتیمان دەدات باشتر ببینە بیریار.

- زانیارییەکان کە لە دەمارزانیو توێکاریی مێشکدا هاتوون هێما بۆ ئەوە دەکەن مێشك وەك ماسولکە وایە، هەتا زیاتر بەکاریبهێنین چالاکتردەبێت.

- شێوازە نوێکانی کارلێککردن لەگەڵ زانیارییەکان لە ڕێگەی موحازەرەکان، خوێندنەوەکان و گفتوگۆ بەکۆمەڵەکانەوە، بۆ چەسپاندنی فێربوون و تێگەیشتن، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پۆزەتیڤانەیە نەك نێگەتیڤانە.

- بایەخدان و مەیلە تاکەکەسییەکان، وەك هۆکاری جوانکاریو چێژبەخشین، ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لەسەر ئاقارە پێویستەکانی بیرکردنەوە.

- بایەخدانی زیاتر بەپرۆسەکانی بیرکردنەوەی لۆژیکی، دەبێتە هۆی بایەخدان بە زانینی چۆنێتی

بەدەستهێنانی بڕیارەکانو سەرەنجامەکانو ڕوونکردنەوەی سروشتی ئەو بڕیارو سەرەنجامانە.

– جەختکردنەوە لەسەر تێگەیشتنی تێڕوانینەکانی دیکەو بەکارهێنانی تێڕوانینی جیاواز بۆ پەرەدان بە توانای بیرکردنەوەی لۆژیکیانە، چونکە ئەقڵە بیرکەرەوەکان بەپێویست لێك ناچن.

– بڕواهێنانی زیاتر بە بیرۆکەی "تاقە ڕێگەیەك بۆ چارەسەر نییە"و "تاقە وەڵامێکی ڕاست نییە". بە دەربڕینێکی دیکە، هەر وەڵامێك لە سیاقی گونجاوی خۆیدا ڕاستە.

– داننانی زیاتر بە بیرۆکەی هەڵە سوودبەخشەکانو شکستخواردنە کاتیەکاندا، هۆکاری سەرکەوتنو پەرەسەندنەو بڕواهێنان بە پرۆسەکانی بەشداریکردن لە هەڵەکردندا کە یارمەتی ئەوانی دیکە دەدات خۆ لە هەمان ئەو هەڵانە بپارێزن.

– پەرەدان بە ستراتیژگەلی نوێ کە یارمەتی ئەوە دەدەن سوود لە میکانیزمی کارکردنی مێشك وەربگیرێت، ئەمەش بریتی دەبێت لە: چۆنێتی پاراستنی زانیارییەکان لە یادی درێژخایانداو پێکهاتنی نەریتی نوێ بۆ بەدواداچوون.

## توانستە پێویستەکان بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

– وردبینی لە ڕەچاوکردنی ڕووداو و پێشهاتەکاندا.

– هەڵسەنگاندنی بابەتیانەی بابەتو مەسەلەکان.

– توانای هەڵهێنجانی سەرەنجامەکان بەشێوازگەلی لۆژیکیی دروست.

– بوونی بابەتێتی لای تاکەکەسو دوورکەوتنەوە لە هۆکارە تاکەکەسییەکان.

## پەرەدان بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە[9]

بۆ ئەوەی بکرێت پەرە بە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بدرێت، ڕەچاوکردنی گەلێك هۆکاری پەیوەندیدار گرنگە، لەوانە:

– ڕەخنەگرتنی زانستیانەو شوێن پێ هەڵنەگرتنی ئەو بیروڕا باوانەی خەڵکی دەیانگوێزنەوە.

– دوورکەوتنەوە لە ڕوانینە مەسەلەکان لە گۆشەنیگای تاکەکەسیو دوورکەوتنەوە لە دەمارگیریی بۆ ئەو گۆشەنیگایە.

– دوورکەوتنەوە لە پێڕەوکردنی تێڕوانینی توندڕەوانە.

– خۆبەستنەوە بە واتا بابەتیەکانەوەو دوورکەوتنەوە لە واتا سۆزدارییەکان.

## پێوەرەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە[10]:

1/ **ڕونی:** ئەگەر دەستەواژەکە ڕوون نەبێت، ئەوا ناتوانین لێی تێبگەینو نازانین مەبەستەکانی قسەکەر چین، سەرەنجامیش ناتوانین بەهیچ شێوەیەك حوکبدەین بەسەریاندا. بۆئەوەی مامۆستا خوێندکارەکانی لەسەر پابەندبوون بە ڕوونیەوە ڕابهێنێ، ئەم جۆرە پرسیارانەیان لێ دەکات:

پ: دەتوانیت بەشێوەیەکی دیکە بیرۆکەکە دەربڕیت؟

پ: دەتوانیت ئەو خاڵە بەدرێژتر ڕوونکەیتەوە؟

پ:مەبەستت چییە لەوەی دەڵێیت...؟

پ: دەتوانیت نموونەیەك لەسەر ئەوە بهێنیتەوە کە باسیدەکەیت؟

2/**ڕاستی:** مەبەست لە پێوەری ڕاستی ئەوەیە دەستەواژەکە ڕاستو باوەڕپێکراو بێت، وەك ئەوەی بڵێیت: زۆربەی ژنانی لای ئێمە زیاتر لە 60 ساڵ دەژین، بەبێ ئەوەی دەربڕینەکە پشتبەستووبێت بە

ئاماری ڕەسمی یان زانیاریی باوەڕپێکراو. بۆ ئەوەی مامۆستا خوێندکارەکانی خۆی لەسەر ڕەچاوکردنی ئەم پێوەرە ڕابهێنێ، دەتوانێت ئەم جۆرە پرسیارانەیان لێ بکات:

پ: ئەم زانیارییەت لەکوێوە هێناوە؟

پ: ئەمە بەکردەوە ڕاستە؟

پ: چۆن دەتوانین ڕاستیی ئەوە بزانین؟

پ: چۆن دەتوانین لەوە بکۆڵینەوە؟

3/**وردبینی:** مەبەست لە وردبینی لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا ئەوەیە بێ زیادوکەم بابەتەکە چارەسەربکرێت یان دەربېڕێت. مامۆستا دەتوانێت لە ڕێگەی ئەم دوو پرسیارەوە خوێندکاران ڕووەو ئەم پێوەرە ئاڕاستەبکات:

پ: دەتوانیت وردبین تر بیت؟ کاتی درێژدادڕی

پ: دەتوانیت زیاتر ڕوونیکەیتەوە؟ کاتی کورتبێژی

4/**پێکەوەبەستن:** پێکەوەبەستن مانای ڕادەی پەیوەندیی نێوان پرسیار، بەدواداچوون، بەهانەو دەستەواژەکانە لەگەڵ بابەتی گفتوگۆکە یان کێشە دەربڕاوەکەدا. پرسیاری یاریدەدەر لێرەدا:

پ: ئایا ئەم بیرۆکە یان پرسیارانە وردەکاریو ڕوونکردنەوە سەبارەت بە کێشەکە دەدەنەدەستەوە؟

پ: ئایا ئەم بیرۆکەو پرسیارانە بەڵگەی لایەنگرانە یاخود ڕەتکەرەوانە دەربارەی کێشەکە لەخۆدەگرن؟

5/**قووڵی:** مەبەست قووڵیی خواستراوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە یان بابەتەکە کە تەبایە لەگەڵ ئاڵۆزیی کێشەکە یان فرە لقوپۆپی بابەتەکەدا.

6/ **فراوانی:** مەبەست ڕەچاوکردنی هەموو لایەنەکانی کێشەکە یان بابەتەکەیە. لەو پرسیارانەی دەشێت بوروژێنرێن:

پ: ئایا پێویستە ڕەچاوی تێڕوانینێکی دیکە بکرێت؟

پ: ئایا لایەنێك یان چەند لایەنێك هەیە دۆخەکە لەگەڵیدا نەگونجێت؟

پ : ئایا ڕێگەیەکی دیکە هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە یان پرسیارەکە؟

7/ **لۆژیك:** یەکێك لە خەسڵەتە گرنگەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە ئەوەیە لۆژیك هەبێت لە ڕێکخستنو بەدوای یەکهاتنو پەیوەندیی نێوان بیروڕاکاندا، بەشێوازێك کە ببێتە هۆی خستنەڕووی مانایەکی ڕوون یان ئەنجامێکی پشتبەستوو بە بەڵگەگەلی ماقوڵ. دەشێت ئەم پرسیارانە بوروژێنرێن بۆ حوکمدان بەسەر لۆژیکیبوونی بیرکردنەوەدا:

پ: ئایا ئەوە ماقوڵە؟

پ: ناکۆکی لەنێوان بیروڕا یان دەستەواژەکاندا هەیە؟

پ: ئایا بەهانەکان یان دەستپێکەکان بەپێویست دەمانگەیەننە ئەو ئەنجامە؟

## پێکهاتەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە[11]:

پرۆسەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پێنج پێکهاتەی هەیە، ئەگەر یەکێك لەو پێکهاتانە ونبوو، ئەوا پرۆسەکە هەرگیز ڕوونادات، چونکە هەر پێکهاتەیەك پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ پێکهاتەکانی دیکەدا هەیە. پێکهاتەکانیش ئەمانەن:

1- **بناغەی مەعریفی:** ئەوەیە کە تاکەکەس دەیزانێو بڕوای پێیەتیو بۆ هەستکردن بەناکۆکی گرنگە.

2- **ڕووداوە دەرەکییەکان:** ئەو کارتێکەرانەی هەستکردن بە ناکۆکی دەوروژێنن.

3- **تیۆری کەسێتی:** ئەو ڕەنگە کەسییەیە کە تاکەکەس لە بناغەی مەعریفییەوە بەدەستیدێنێ، هەتا سروشتێکی جیاکارەی هەبێت (تێڕوانینی تاکەکەسی). ئینجا تیۆری کەسێتی ئەو

چوارچێوەیەیە کە لە سایەیدا ڕووداوە دەرەکییەکان لێکدەدرێنەوەو هەستکردن بە دوورکەوتنەوە یان ناکۆکی بەهۆی نەبوونییەوە دەبێت.

4- **هەستکردن بە دوورکەوتنەوە یان ناکۆکی:** تەنیا هەستکردن بەوە هۆکارێکی هاندەرەو هەموو هەنگاوەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بەدوای خۆیدا دێنێ.

5- **چارەسەرکردنی ناکۆکی:** قۆناغێکە هەموو لایەنە پێکهێنەرەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لەخۆدەگرێت، چونکە مرۆڤ کۆششدەکات بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیو چەند هەنگاوێك دەگرێتەوە. بەو جۆرە ئەمە بنچینەییە لە بنەمای بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا.

## شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

زانایانی دەروونناسیی پەروەردەکارانەو پەروەردەکاران جیاوازن دەربارەی شارەزاییە مەعریفییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەو ژمارەیان لەنێوان دەیانو سەدان دانەدایە، ئەمەش پشتئەستوور بەو شێوازەی پێناسەی هەر شارەزاییەکی پێ دەکرێت. ئەمانەی خوارەوە هەندێك شێوازی پۆلێنکردنی شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەن:

**شێوازی یەکەم:** شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە پۆلێنکراوە بۆ ئەوەی[12]

1- لە هۆکانی کێشەکە بکۆڵێتەوە.

2- بەدوای دەستنیشانکردنی ڕوونی کێشەکەدا بگەڕێت.

3- پشت بەسەرچاوەی باوەڕپێکراو ببەستێ.

4- هەوڵبدات زانیاری ڕاست بەدەستبهێنێ.

5- هەوڵبدات پەیوەندیی لەگەڵ خاڵی سەرەکیدا بپارێزێ.

6- ڕەچاوی تێکڕای هەڵوێستەکە بکات.

7- مێشك کراوە بێت.

8- بەدوای ئەڵتەرناتیڤدا بگەڕێت.

9- چەند دەکرێت هەوڵبدات وردبین بێت.

10- هەڵوێستێکی دیاریکراو وەربگرێت.

11- هەستیاربێت بەرامبەر بەهەستی ئەوانی دیکەو ڕاستیی زانیارییەکان.

12- بەشێوەیەکی ڕێکوپێك مامەڵە لەگەڵ هەر بەشێکی هەڵوێستەکەدا بکات.

**شێوازی دووەم:** پۆلێنکردنی (ئۆدلو دانیالز):

توێژەران (ئۆدلو دانیالز) شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دابەشدەکەن بەسەر سێ توێژداو بەم شێوەیە:

- شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی سۆراخکاری.
- شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ئەنجامگیرانە.
- شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی هەڵسەنگاندنخواز.

## شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی سۆراخکاری:

بیرکردنەوەی سۆراخکاری پرۆسەیەکی بەڵگاندنی ئەقڵییە، ئامانجی گەیشتنە بەو سەرەنجام یان گشتگیریانەی سنووری بەڵگە بەدەستەوەکان یاخود ئەو زانیارییانە دەبەزێنن کە بینینە پێشوەختەکان دەیانخەنە ڕوو. ئەگەر لەسەر ڕێگە دوو تاکسیی بچووکت بینی ترافیك لایتی سوور دەبڕنو دواتر بۆ هاوڕێیەکت باسکردو وتت: "گشت شۆفێرەکانی تاکسیە بچووکەکان سەرپێچیکەرنو ڕەچاوی ترافیك لایتی سوور ناکەن"، ئەوا سنووری ئەو زانیارییە دەبڕیت کە لەڕاستیدا تەنیا بۆ دوو شۆفێر ڕاستەو بەسەر گشت شۆفێرەکانی تاکسییە بچووکەکاندا بەگشتیتکردوە. ئەوەی پێیگەیشتویت سەرەنجامێکی سۆراخکارەو ناکرێت پشتئەستوور بەو بەڵگانەی لەبەر دەستدان ڕاستیی مسۆگەربکرێت. ئەوپەڕی سنوور کە ئەم سەرەنجامە پێی بگات، ئەگەری ئەوەیە کە ڕاست بێت.

بیرکردنەوەی سۆراخکاری بەسروشتی خۆی ئاراستەی دۆزینەوەی ڕێساو یاساکان کراوە، هەروەها ئامرازێکی گرنگە بۆ چارەسەرکردنی کێشە نوێکان یان دۆزینەوەی چارەسەری نوێ بۆ کێشە کۆنەکان یاخود گەشەدان بە گریمانە نوێکان. لەبری خۆدوورگرتن لە سۆراخکاری، پێویستە سەرەنجامگیرییەکانمان تا ئەوپەڕی پلەی شیاو بڕواپێکراوبکەین، ئەوەش بە وریابوون بەرامبەر بە خستنەوەی گشتگیرییەکان یان بارگاویکردنی زانیارییە بەدەستەوەکان زیاتر لەوەی دەرەقەتی دێن، ئەوەش لەترسی کەوتنە هەڵەوە.

پێکهاتەکانی پڕۆسەی سۆراخکاری ئەمانەن:

1- شیکردنەوەی کێشە کراوەکان.

2- دیاریکردنی پەیوەندیی هۆکارانە یاخود بەستنەوەی هۆ بە هۆکارە.

3- گەیشتنە سەرەنجامەکان.

4- بەڵگاندنی نوێنەرایەتیخواز.

5- دەستنیشانکردنی ئەو زانیاریانەی پەیوەندیان بەبابەتەکەوە هەیە. ئەمەش پێویستی بەوەیە: نێوان دێڕەکان بپشکنین، دەستەواژەو هۆکانو بەڵگە لایەنگیرخوازو دژەکانو خەسڵەتو پەیوەندیو نموونەکان لێکبدەینەوە.

6- سەرلەنوێ پێکهێنانەوە یان داڕشتنو چارەسەرکردنی پەیوەندییەکان، ئەم پڕۆسەیەش چەند شێوەیەک لەخۆدەگرێت، لەوانە:

- ناسینی پەیوەندییەکان لە ڕێگەی دەلالەتخوازیی ماتماتیکی یاخود ژمارەییەوە.

- ناسینی پەیوەندییەکان لە ڕێگەی دەلالەتخوازیی زارەکیەوە.

- چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی پێویستیان بە بیرتیژیو ژیریی هەیە.

- ناسینی پەیوەندییەکان لە ڕێگەی دەلالەتخوازیی شوێنییەوە.

## شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی ئەنجامگیرانە :

**بیرکردنەوەی ئەنجامگیری:** پڕۆسەی بەڵگاندنی لۆژیکییە، ئامانجی گەیشتنە سەرەنجامێکی دیاریکراو یان مەعریفەیەکی نوێیە، پشتئەستوور بە گریمانەکان یان دەستپێکە بابەتیەکانو زانیارییە بەدەستەوەکان. سەلماندنی ئەنجامگیرانە شێوەی پێکهاتنێکی سمبولی یان زمانەوانی وەردەگرێت، بەشی یەکەمی گریمانەیەک یان زیاتر لەخۆدەگرێت کە زەمینە بۆ گەیشتنە سەرەنجامێکی حەتمی خۆشدەکات. واتە ئەگەر گریمانەکان یان زانیارییەکان کە لە بەشی یەکەمی پێکهاتەکەدا هاتوون ڕاست بوون، ئەوا سەرەنجامەکانی لە بەشی دووەمدا دێن ڕاستگۆیانە دەبن. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە ئەم نموونەیە دێنینەوە:

گریمانەکان/ دەستپێکەکان:

- گشت یاریزانەکانی تێنسی سەر زەوی وەرزشوانێکی پیشەکارن.

- گشت وەرزشوانەکان خەڵکی خاوەن ماسولکەی بەهێزن.

سەرەنجام:

گشت یاریزانە پیشەکارەکانی تێنسی سەر زەوی خەڵکی خاوەن ماسولکەی بەهێزن.

ئامانج لە سەلماندنی ئەنجامگیرانە، پێشکەشکردنی ڕێنیشاندەرێکە کە شوێنپێی هەڵدەگرێتو بەپێویست دەبێتە هۆی خستنەوەی سەرەنجامێکی دیاریکراو، بەڵام ڕاستگۆیی یان درۆیی سەلماندنەکە دەکرێت بەشێوەیەکی بنچینەیی لە ڕێگەی پشکنینی بیناکەی یان پێکهاتەکانیەوە دیاریبکرێت، چونکە ئەو بینایەی سەرەنجام ناهێنێتەدی، سەلماندنەکە ساختەدەکات، تەنانەت ئەگەر گریمانە یان دەستپێکەکانیشی ڕاستگۆیانە بن.

نموونە:

گریمانەکان/ دەستپێکەکان:

– گشت پشیلەکان ئاژەڵن.

– گشت سەگەکان ئاژەڵن.

سەرەنجام:

گشت سەگەکان پشیلەن.

سادەترین شێوەی سەلماندنی ئەنجامگیرانە ئەوەیە کە بەشێوەی پێوانەکاریی لۆژیکیی گریمانەخوازانە دێتو پێکدێت لە گریمانەیەکی سەرەکی یان دەستپێکێکی مەزنو گریمانەیەکی لاوەکی یان دەستپێکێکی بچووکو ئەنجامێکی هەڵهێنجراو لێیەوە. شێوە ڕاستەکانی پێوانەکاریی لۆژیکیی گریمانەخوازانە ئەمانەن:

1/ گریمانەی لاوەکی جەخت لەسەر دەستپێکی گریمانەی سەرەکی بکاتەوە:

نموونە:

گریمانەی سەرەکی/ دەستپێکی مەزن:

ئەگەر باران باری، ئەوا هەور بەئاسمانەوە دەبێت.

گریمانەی لاوەکی کە جەخت لەسەر دەستپێکی مەزن دەکاتەوە: ئاسمان باران دەبارێنێ.

سەرەنجام: کەواتە هەور بەئاسمانەوەیە.

2/گریمانەکە ناکۆک بێت لەگەڵ بڕگەی دووەمی گریمانەی سەرەکیدا.

نموونە:

– گریمانەی سەرەکی: ئەگەر خالید دەرمانی بخواردایە ئیستا چاکببووەوە.

– گریمانەی لاوەکی دژی بڕگەی دووەم: خالید چاك نەبووەوە.

– سەرەنجام: کەواتە خالید دەرمانی نەخواردوە.بەکارهێنانمان بۆ شێوازی بەڵگاندنی ئەنجامگیرانە زۆر لەوە گرنگترە کە بەمێشکدا دێت، چونکە زۆربەی ئەوانەی هەریەکێکمان دەیزانین لە ڕێگەی شێوازی ئەنجامگیریی لە شتی دیکەوە فێری بووین کە ئاشناین پێیان، جا ئەگەر ئاشنابوونمان تەنیا بۆ ئەو شتانە بوایە کە ڕاستەوخۆو ڕاشکاوانە فێریان بووین، ئەوا بێگومان لە ڕووی چۆنایەتیو چەندایەتیەوە سنووردارەبوو. بەڵگاندن لەڕێگەی شێوازی ئەنجامگیریی لۆژیکیەوە، پرۆسەیەکی بیرکردنەوەی ئاوێتەیەو ئەم شارەزاییانەی بیرکردنەوە لەخۆدەگرێت:

– ناسینی ناکۆکییەکان لەناو هەڵوێستەکەدا.

– بەکارهێنانی لۆژیك.

– چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی پشتبەستوون بە دەرککردن بە پەیوەندییە شوێنییەکان.

– شیکردنەوەی پێوانەکاریی لۆژیکی.

## شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی هەڵسەنگاندنخواز:

**بیرکردنەوەی هەڵسەنگاندنخواز:** مەبەست ئەو چالاکییە ئەقڵییەیە کە ئامانجی دەرکردنی حوکمێکە لەبارەی بەهاو سەلامەتیو چۆنایەتی بیروڕا یان شتەکانەوەو توانستی گەیشتنە دەرکردنی بڕیارو خستنەڕووی داوەرییەکان سەبارەت بە چاکترین ئەڵتەرناتیڤو هەڵبژاردن.

بیرکردنەوەی هەڵسەنگاندنخواز لە سێ شارەزایی بنچینەیی پێکدێت:

1/دۆزینەوەی ئەو پێوەرانەی پرۆسەی خستنەڕووی داوەرییەکان پشتیان پێ دەبەستێت، وەك:

– ناسینی گریمانە بنچینەییەکان.

– ناسینی مەسەلەو کێشە ناوەندییەکان.

– پێشبینیکردنی سەرەنجامەکانی کارێکی دیاریکراو.

– هەڵسەنگاندنی گریمانەکان.

– پلاندانان بۆ ستراتیژە ئەڵتەرناتیڤەکان.

– بەدوای یەکهاتنی زانیارییەکان.

2/سەلماندنی ڕادەی وردبینیی بانگەشەکان، لەوانە:

- حوكمدان بەسەر ڕاستبێژیی سەرچاوەكانی زانیاریدا بەهۆی گەڕان بە دوای ڕاستبێژیی سەرچاوەی نووسراوەوە، وەك ناوبانگیی نووسەر یان كتێبەكەو وردبینیو بواری پسپۆڕییەكەیو پلەی تەبایی لەنێوان ئەوو سەرچاوەكانی دیكەی زانیاریداو پێچینەوە لە نەبوونی بەرژەوەندی یان مەبەستە كەسێتیەكان لەدوای نووسینەكانیەوە.
- بینینو حوكمدان بەسەر ڕاپۆرتەكانی بینینەكاندا.
- پشكنین بۆ لایەنەكانی لایەنداریێتیو شێوازو بیروڕا بێزراوەكان.
- ناسینی زمانی بارگاوی.
- پۆلێنكردنی زانیارییەكان.
- دەستنیشانكردنی هۆ باسكراوو باسنەكراوەكان لە هەڵوێستەكەدا.
- بەراوردكردنی لایەنەكانی لێكچوونو جیاوازی.
- هەڵسەنگاندنی بەهانە یان سەلماندنو مونازەرەكان.

3/ناسینو دیاریكردنی هەڵەكان یان ئەو بیروڕایانەی لەڕووی لۆژیكییەوە چەوتن، وەك:
- لێك جیاكردنەوەی ڕاستییەكانو بیروڕاكان.
- ناسینی ئەو زانیاریانەی پەیوەندیان بە بابەتەكەوە هەیە.
- ناسینی بەڵگاندنی ئەقڵیی چەوت یان سەرەنجامە هەڵەكان.

## خەسڵەتەكانی بیریاری ڕەخنەگر(13)

دەكرێت ئەو خەسڵەتو ڕەفتارانە پوختەبكەینەوە كە توێژەرە پسپۆڕەكان بۆ وەسفكردنی كەسێك بەكاریانبردوە كە ڕەخنەگرانە بیردەكاتەوە، ئەویش ئەوەیە كەسەكە:
- جیاوازی لەنێوان بیروڕاو حەقیقەتدا دەكات.
- كراوەیە بەڕووی بیروڕای نوێدا.
- دەزانێت كەی پێویستی بە زانیاریی نوێیە سەبارەت بە شتێكی دیاریكراو.
- جیاوازیی دەكات لەنێوان ئەنجامێكدا كە "لەوانەیە ڕاست بێت"و ئەنجامێك كە "بێگومان ڕاستە".
- سەرچاوەی زانستیی باوەڕپێكراو بەكاردێنێو هێمایان بۆ دەكات.
- شێوازێكی ڕێكوپێك بەكاردێنێ بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ گرفتەكاندا.
- دەزانێت خەڵكی بیروڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی مانای وشەكان.
- بەهەمان بایەخەوە سەیری لایەنەكانی هەڵوێستەكە دەكات.
- نەرمونیانەو خۆشەویستی هەیە بۆ ئەزموونكردن.
- پرسیار دەربارەی هەرشتێك دەكات قبوڵكراونەبێت.
- بەدوای هۆكانو بەڵگەكانو ئەڵتەرناتیڤەكاندا دەگەڕێت
- هەڵوێستێك وەردەگرێتو كاتێك بەڵگەی بەدەستەوە دەبێت دەیگۆڕێت.
- كێشەكە بە ڕوونی دەناسێ.
- پەلەناكات لە خستنەڕووی داوەرییەكاندا.
- بابەتیبوون دەپارێزێو لە هۆكارە خودییەكان دووردەكەوێتەوە.
- هەوڵدەدات بیركردنەوەی لۆژیكیو بیركردنەوەی سوزدارانە لێك جیابكاتەوە.

## بۆچی خوێندكار فێری بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە دەكەین؟

-خوێندكاران وەرگرێكی خراپی زانیارییەكانن، لەسایەی تەكنۆلۆژیای نوێشدا ژمارەی زانیارییەكان زۆر زۆرەو هەمیشەش لە زۆربووندایە، بۆیە

خوێندكاران پێویستیان بەوەیە فێری چۆنیەتی هەڵبژاردنی زانیارییە پێویستو سودبەخشەكان بن، نەك وەرگرێكی خراپ بن. لەبەرئەوە گرنگە خوێندكار شارەزاییەكانی بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە گەشەپێبداتو چالاكانە لە لێكۆڵینەوە ئەكادیمیەكانداو بۆ چارەسەركردنی گرفتە ڕۆژانەكان بەكاریانبهێنێ.

–بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە پرسیارو پرسیاركردنەوە دەوروژێنێ، ئەمەش بۆ فێرخواز گرنگە، چونكە فێری وروژاندنی پرسیاری چاك دەبێتو دەزانێ چۆن ڕەخنەگرانە بیربكاتەوە، ئەمەش لەپێناو پێشكەوتن لە بواری فێربوونو خوێندنو بواری مەعریفەدا، بەوپێیەی بواری مەعریفی ئەنجامی وروژاندنی پرسیارەكانو چارەسەركردنە جیدییەكان زیندودەبێتو نوێدەبێتەوە.

–فێركردنی بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە بۆ تێگەیشتنی پەیوەندیی نێوان زمانو لۆژیكە، ئەمەش دەبێتە هۆی جڵەوكردنی شارەزاییەكانی شیكردنەوەو ڕەخنەگرتنو بەرگریكردن لە مەسەلەكانو بیركردنەوەی سۆراخكارانەو ئەنجامگیرانەو گەیشتنە سەرەنجامە ڕاستەقینەو واقعییەكان لەڕێگەی ئەو دەستەواژانەوە كە ڕوونن بەلای مەعریفەو بڕواكانەوە.

بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە لە كایە مەعریفیەكاندا ئەم خەسڵەتە هاوبەشانەی هەیە:

1– بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە توانایەكە مامۆستاكان دەتوانن وەك سەرچاوەیەكی فێربوون فێری بن.

2– كێشەكانو پرسیارەكانو بابەتەكان وەك سەرچاوەكانی وروژاندنی هاندەرەكانی فێركردن بەكاردەبرێن.

3– چەقەمەسەلە دەربارەی دامەزراندنەكانو كارنامەیە نەك دەربارەی كتێبی خوێندنو وانەوتنەوە تەلقینكارەكان.

4– ئامانجو شێوازە فێرخوازییەكان جەخت لەسەر ناوەڕۆكی مەعریفی دەكەنەوە نەك تەنیا بەدەستهێنانی مەعریفە.

5– پێویستە خوێندكارەكان بیروڕای خۆیان پێكبهێنو بەنووسین بەهانەیان بۆ بهێننەوە.

6– پێویستە خوێندكارەكان هاریكاری بكەن لەپێناو فێربوونو چەسپاندنی شێوازی بیركردنەوەی خۆیاندا.

## بیركردنەوەی ڕەخنەگرانەو فێربوونی ناو پۆل

**بەڵگەنەویستە پرۆسەی فێربوون لە پۆلدا دوو پێكهاتەی سەرەكیی هەیە:**

**ڕەفتاری مامۆستاو ڕەفتاری فێرخواز.** ڕەفتاری مامۆستا ڕۆڵێكی بنچینەیی دەبینێت لە بەرهەمهێنانی فیكرو ئاكاری داهێنەرانە لای فێرخواز. (ڕۆجرز) لە كتێبی "چۆن دەبیتە مرۆڤ"دا جەخت لەسەر دوولایەنی گرنگی ڕەفتاری مامۆستا دەكاتەوە كە دەبنە هۆی بنیاتنانی واتەیەكی پۆزەتیڤانە لای فێرخواز: تەندروستیی دەروونی خود، سەربەستیی دەروونی، كە دوو مەسەلەی پێویستن لە هەر پرۆسەیەكی فێربووندا. چونكە كاتێك مامۆستا خوێندكاران وەك خۆیانو بێ هیچ مەرجێك قبوڵدەكاتو كەشێك دەخوڵقێنێ كە تیایدا هەستوسۆزی ئەوانی دیكە قبوڵدەكاتو لە خودیان تێدەگاتو لە هەڵسەنگاندنیدا بۆیان پشت بە پێوەرە دەرەكیەكان نابەستێ، ئەوكاتە هانی بیركردنەوەی ڕەخنەگرانە دەدات.

## ڕۆڵی مامۆستا لە فێرکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا

کاتی گفتوگۆکردن سەبارەت بە گرنگیی ڕۆڵی مامۆستا لە کاراکردنی پرۆسەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا لای خوێندکاران، پێویستە دەرك بە ڕۆڵی مامۆستا بکەین وەك پێشەنگێك، ئەوەش لە ڕێگەی ئەو ڕۆڵانەی دەیانگێڕێ بۆ ئەوەی ئاسانکاری بکات بۆ پرۆسەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لای خوێندکاران. لەو ڕۆڵانە:

1- **مامۆستا نەخشەسازی پرۆسەی فێرکردنە:** مامۆستا لە پلانەکانی وانە ڕۆژانەو فەسڵیەکاندا ئامانجەکانی وانەوتنەوەو نموونەی پرسیارەکانو بابەتە فێرخوازییەکانو ئەو چالاکیانە ڕێکدەخات کە دەبنە هۆی دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی خوێندنو ئامرازەکانی هێنانەدیان.

2- **مامۆستا پێکهێنەری کەشی پۆلەکەیە:** کەشی ناو پۆل گرێدراوی چالاکیی گروپەو بەشداریکردنی دیموکراتیانەش کەشێکی بەکۆمەڵی توندوتۆڵ دەخوڵقێنێ کە تیایدا ڕێزی ڕادەربڕین، دۆزینەوەی ئازادانە، هاریکاری، پشتگیریکردن، بڕوابەخۆبوونو هاندان دەگیرێت.

3- **مامۆستا دەستپێشکەرە:** ئەوەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی کۆکتێلێك لە بابەتو چالاکییەکانەوەو ئاشناکردنی خوێندکاران بەو هەڵوێستانەی جەخت لەسەر کێشە ژیانییە ڕاستەقینەکانی خوێندکاران دەکەنەوەو شێوازی دەربڕینی پرسیار بەکاردێنێ بۆ بەشدارییپێکردنی چالاکانەی خوێندکاران.

4- **مامۆستا بەردەوامی دەپارێزێ:** ئاسانترین ئەرکێك مامۆستا جێبەجێیبکات ئەوەیە بایەخدانی خوێندکاران بە مەسەلەگەلی چێژبەخشو ڕاستەقینە بوروژێنێ، سەختییەکە لەوەدایە کە چۆن سەرنجدانیان ڕابگرێت، ئەمەش دەیسەپێنێ بەسەر مامۆستادا ئەو بابەتو چالاکیو پرسیارانە بەکاربهێنێ کە خوێندکاران هاندەدەن.

5- **مامۆستا سەرچاوەی مەعریفەیە:** مامۆستا زۆرجار ڕۆڵی سەرچاوەی مەعریفە دەبینێ، چونکە زانیارییەکان ئامادەدەکات، ئامێرەکان دەستەبەر دەکاتو کەلوپەلە پێویستەکان بۆ خوێندکاران مسۆگەردەکات هەتا بەکاریانبهێنن، بەڵام خۆ لەوە بەدووردەگرێت ئەو وەڵامانە بداتە خوێندکاران کە دەبنە ئاستەنگ لە کۆششکردنی بەردەوامیاندا بۆ گەیشتنە ئەو سەرەنجامانەی یارمەتیاندەدات بۆ خۆیان پێیان بگەنو پێکیان بهێنن.

6- **مامۆستا ڕۆڵی پشکنەر دەبینێ:** ئەوەش لە ڕێگەی دەربڕینی پرسیارگەلی قوڵی پشکنەرەوە، کە پێویستیان بە بەهانەهێنانەوەو داکۆکی هەیە، سەبارەت بە بیروڕاو گریمانەکانو ئەو سەرەنجامانەی پێی گەیشتوون.

7- **مامۆستا ڕۆڵی پێشەنگ دەبینێ:** مامۆستا وەك نموونەیەك ئەو ڕەفتارانە دەنوێنێ کە دەریدەخەن کەسێکی بەبایەخو ئەزموونکارو ڕەخنەگرە لە بیرکردنەوەو خوێندنەوەیدا، هەروەها سەرقاڵێکی کارامە، داهێنەر، هاوسۆزەو لە بیرکردنەوەیدا وێڵە بەدوای بەڵگەدا.

## مامۆستا وەك نموونەیەکی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

ئەم جۆرە مامۆستایە ئەم خەسڵەتانەی هەیە:

- بەجۆرێك مێشك کراوەیە کە هانی خوێندکارەکان دەدات بۆ پێڕەویکردنی بیروڕا تایبەتیەکانی خۆیانو خۆنەبەستنەوەیان تەنیا بەوەی مامۆستاکان دەیڵێن.
- سوورنییە لەسەر هەڵوێستەکانی خۆی، بەتایبەتی کاتێك بەڵگەکان ڕووندەبنو دژی

هەڵوێستەکانی دەبن. هەروەها کاتی پێویست دان بەهەڵەکانی خۆیدا دەنێت.

– بایەخ بە فێربوون دەداتو دەروەست دەبێت پێوەی.

– دەستدەکات بەئامادەکاریو ڕێکخستنی پێویست بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانی فێربوون.

– هەستیارە بەرامبەر بە هەستوسۆزو ئاستی مەعریفەو پلەی ڕۆشنبیریی ئەوانی دیکە.

– ڕێگەدەدات بە خوێندکاران بەشداری بکەن لە دانانی یاساکانو دەرکردنی ئەو بڕیارانەی پەیوەندیان بەهەموو لایەنەکانی فێربوونەوە هەیەو تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنەکانیش دەگرێتەوە.

– داوای پشکنینی بیروڕا دەربڕاوەکانو ڕێکردن بەپێی ستراتیژە سۆراخکارییەکان دەکات.

– داوای ئەڵتەرناتیڤ لە خوێندکاران دەکات.

– دەربڕینی پرسیارگەلی کراوە.

– بەڕێوەبردنی گفتوگۆو دیالۆگی تیۆری دەربارەی بابەتە گشتیەکان، کە تیایدا خوێندکاران ئەو بیروڕایانە دەردەبڕن کە گۆشەنیگای جیاوازیان تێدایەو هەر گرووپێك تێڕوانینێکی دیاریکراوی دەبێتو لەبەرامبەر بیروڕای ئەوانی دیکە بەرگریان لێ دەکات.

– بەکارهێنانی گەمەی ڕۆڵبینین لەو مەسەلانەدا کە ناکۆکی لەخۆدەگرن.

– هاندانی خوێندکاران بۆ ئامادەبوونی کۆبوونەوەکانو بینینی ئەو تەلەفزیۆنانەی بیروڕای جیاواز پێشکەشدەکەن.

– هاندانی خوێندکاران بۆ نووسین دەربارەی شتێکی گرنگی ژیانیانو گفتوگۆکردن دەربارەی ئەوەی نووسیویانە.

– هاندانی خوێندکاران بۆ شیکردنەوەی وتارەکانی ڕۆژنامەکانو دۆزینەوەی نموونە سەبارەت بە لایەنگیریکردن یان دەمارگیری.

– هاندانی خوێندکاران بۆ دەربڕینی ئەو پرسیارانەی زیاتر لە وەڵامێکیان هەیە.

– هاندانی خوێندکاران بۆ خوێندنەوەی ئەو ئەدەبەی تاودەرەوەی بەهاو دابونەریتە جیاوازەکانەو گفتوگۆکردن دەربارەیان.

– بانگهێشتکردنی ئەوانەی بایەخ بە مەسەلە گشتیەکان دەدەنو "هەر یەکێکیان تێڕوانی جیاوازی هەیە"و گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا.

## ستراتیژەکانی فێرکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

(پاول)[14] ستراتیژەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دەکاتە سێ جۆرەوە:

1/ **ستراتیژی شارەزاییە بچووکەکان:** مەبەست ئەو شارەزاییە سەرەتاییە سادانەیە کە پەیوەندیان بە توانای گشتیی منداڵو هەست بەخۆکردنیەوە هەیە، وەك ناساندنی مانای وشەکان بەوردیو زانینی شارەزاییە ژمارەییە سادەکان.

2/ **ستراتیژی سۆزدارانە:** ئامانجی پەرەپێدانی بیرکردنەوەی سەربەخۆیە، واتە پەرەپێدان ڕووەو ئاقاری "دەتوانم ئەم کارە یەکگرتنخوازە ڕاپەڕێنم". بۆ ئەوەی منداڵان فێری ئەم نەریتە بن، پێویستیان بە نموونەیەکی زیندووی گەورەکان (وەك مامۆستا) هەیە، واتە "پێشەنگی چاك". هەروەها ئەگەر بمانەوێ پەرە بە بیرکردنەوەی سەربەخۆیانەی منداڵەکان بدەین، ئەوا پێویستیان بەبینینی ئەوانە هەیە کە سەربەخۆیانە بیردەکەنەوە. چونکە ئەو خوێندکارەی پراکتیزەی یاساکانی وەرزش دەکات لەپێناو خودی یاساکانداو بێ زانینی هاندەرە لۆژیکییەکانی پاش ئەو یاسایانە، ناتوانێت بەشداربێت لە پەرەپێدانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا. لەو پرسیارانەی چاکە دوای تەواوکردنی مەشقکردنەکان لەسەر

بەکارهێنانی یاساکان بکرێن ئەمانەی لای خوارەوەن:

– ئایا ئەوە تاقە شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکەیە؟

– ئایا ئەوە چاکترین شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکە؟

– ئایا ناتوانیت بیر لە شێوازی دیکە بکەیتەوە؟

– چ شێوازێك باشترینە؟ بۆچی؟

دەکرێت ستراتیژی چارەسەرکردنی کێشەکان بەکاربهێنرێت بۆ فێربوونو فێرکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە. (ئال یاسین) شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکان بەمجۆرە پێناسەدەکات: شێوازێکی بیرکردنەوەی زانستیی پشتبەستووە بە تێبینیکردنی هۆشمەندانەو ئەزموونکردنو کۆکردنەوەی داتاکانو زانیارییەکان بۆ گەیشتنە چارەسەرێکی ماقوڵ [15].

دەکرێت هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی کێشەکان بەمجۆرەی خوارەوە پوختەبکەینەوە:

1/**هەستکردن بە کێشەکە:** بیرکردنەوەی زانستی بەبوونی هاندەرێك لای خوێندکاران دەستپێدەکات، ئەویش هەستکردنە بە بوونی کێشەیەك، چونکە ئەو هەستە پاڵ بە کەسەکەوە دەنێت بەدوای چارەسەری کێشەکەدا بگەڕێت.

2/**دەستنیشانکردنی کێشەکە:** ئەم هەنگاوە تێکهەڵکێشە لەگەڵ هەنگاوەکەی پێشوودا، چونکە کاتی هەستکردنی خوێندکاران بەبوونی کێشەیەكو خواستی بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی، مامۆستا ئاڕاستەیاندەکات بۆ دەستنیشانکردنی کێشەکە بەجۆرێك کە ڕووندەبێت لەبەردەمیانداو ئەم هەنگاوە لەخۆدەگرێت: شیکردنەوەی کێشەکە لە هەموو ڕووە جۆربەجۆرەکانیەوە کە وەك کێشەی لاوەکی وەهان.

3/**دانانی گریمانەکان:** گریمانەکان چارەسەرگەلی پێشنیارکراوەو دەبێت بەجۆرێك بێت کە ڕوونو واقعیو دەکرێت لە ڕاستیان بپێچرێتەوە، هەروەها نابێت زۆربنو پرشوبڵاوی بیرکردنەوەو پشێوی کۆششکردنی خوێندکاران بێنێتەئاراوە.

4/**کۆکردنەوەی ئەو داتاو زانیاریانەی پەیوەندیان بە کێشەکەوە هەیە:** مەبەست کۆکردنەوەی ئەو داتاو زانیارییە پێویستانەیە کە پەیوەندیان بەلایەنێکی کێشەی دەستنیشانکراوەوە هەیە. ئەم هەنگاوە لەژێر چاودێرییو بە ئاڕاستەکردنی مامۆستا دەبێت کە چۆنیەتی بەدەستهێنانی داتاو زانیارییەکانو هەڵبژاردنیانو شوێنەکانی بوونیان ڕووندەکاتەوە.

5/**تاقیکردنەوەی گریمانەکان:** لەم هەنگاوەدا ئەم دوو شتە ڕوودەدات: یەکەم/ دڵنیابوون لەو زانیاریو داتایانەی خوێندکارەکان دەربارەی کێشەی توێژینەوەکە کۆیانکردۆتەوەو خۆڕزگارکردن لەوانەی پەیوەندیان بە کێشەکەوە نییە. دوەم/تاقیکردنەوەی هەر گریمانەیەك یان چارەسەرێکی پێشنیارکراو لەڕێگەی ئەو بەڵگانەوە کە لە داتاو زانیارییە کۆکراوەکانەوە بەدەستهاتوون.

6/**گەیشتنە سەرەنجامەکانو گشتاندنیان:** ئەمەش بەقبوڵکردنی ئەو گریمانەیەی بەهۆی بەڵگەکانەوە ڕاستیان سەلماوە. بەوجۆرە مامۆستا خوێندکارەکانی خۆی ئاڕاستەدەکاتو یارمەتیاندەدات بۆ داڕشتنی سەرەنجامە کۆتاییەکانی لێکۆڵینەوەکە دەربارەی کێشەکە کە وەك چارەسەر وایە بە شێوەی گشتاندن یان ڕێسای گشتیی وەها کە گونجاوبێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە هاوشێوەکانی دیکە.

## چۆنیەتی ئامادەکاری بۆ چالاکیی پەرەپێدەری بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە

بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە توانستی تاکە کەسە بۆ دەربڕینی بیروڕای لایەنگیرخواز یاخود

دژی هەڵوێستە جۆربەجۆرەکان، لەگەڵ خستنەڕووی هۆیە بڕواپێهێنەرەکانی هەر بیروڕایەك. لەم پێناسە کارڕاییە سادەیەوە، هەرتاکێك دەتوانێت بەشێوەیەکی خودخوازانە یان کاتی کالێککردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئەم شێوازەی بیرکردنەوە بەکاربهێنێ. لێرەدا بۆ ئەوەی کاسانێك بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە بیربکەنەوە، ئەوە بەسە یەکێك خاوەن ڕابێت بەرامبەر بە مەسەلە دەربڕاوەکان و بەڵگەی بڕواهێنەر بۆ بیروڕاکەی خۆی بهێنێتەوە.

بۆئەوەی بەشێوەیەکی باشتر ئەم توانستە بەدەستبهێنین – خوێندکاران و مامۆستایان– لێرەدا گرنگە بزانین بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دەکەوێتە کوێی پەیژەی مەعریفی (بلۆم)وە؟

(بلۆم) ئاستەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤانەی پۆلێنکردوە بۆ چەند ئاستێك، ئەوانە: مەعریفە، جێبەجێکردن، شیکردنەوە، پێکهێنان و هەڵسەنگاندن. ئەوەی سەرنجڕاکێشە، ناکرێت بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە هەنگاوهەڵهێنێ، ئەگەر پێش ئەوە شیکردنەوەیەکی وردبینانە بۆ ئەو هەڵوێستە نەکرابێ کە مەبەستە ڕەخنەی لێ بگیرێت، هەروەها دەربڕینی بیروڕای لایەنگیرخواز یان دژی هەڵوێستی شیکراوە جۆرێکە لە هەڵسەنگاندن. لێرەوە دەبینین بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە یەکێکە لە ئاستەکانی بیرکردنەوەی باڵا و ئاستی چوارەم و شەشەمی ئاستەکانی (بلۆم) داگیردەکات.

کەواتە وەك دەستپێکێك بۆ ڕاهێنانی خوێندکاران لەسەر بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، پێویستە خۆمان لەسەر دوو شارەزایی نیمچە سەرەکی ڕابهێنین، ئەوانەش شارەزایی شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنە.

**یەکەم/ شارەزایی شیکردنەوە:**

ئەم شارەزاییە لە بواری شیکردنەوەی مەتریالیستانەدا بەم شێوەیە پێناسەدەکرێت:

بەشبەشکردنی گشت بۆ پێکهاتەکانی. کەچی لەبواری شیکردنەوەی چۆنایەتیدا مانای ئەمەیە: بەهای فرمانی و پەیوەندیی هەر پێکهاتەیەك بە پێکهاتەکانی دیکەوە یاخود بەو گشتەوە کە ئینتیمای بۆی هەیە، هەروەها لانی لێکچوون و جیاوازیی نێوان هەموویان. نموونەی ئەوە شیکردنەوەی "ماتۆڕ"ە:

لە ڕووی مادییەوە پێکهاتەکانی ماتۆڕ بریتین لە: سوکان، کورسی، تایەکان و دەبڵەکان...

لە ڕووی چۆنایەتیەوە: بەکارهێنانی ماتۆڕ دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی وزەو پاراستنی ژینگە لە پیسی و دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی تاکەکەس.

**دووەم/ شارەزایی هەڵسەنگاندن:**

بریتییە لە توانستی خستنەڕووی دادوەرییەکان سەبارەت بە تاکێك یان ڕووداوێك یاخود دیاردەیەك پشتئەستوور بەو پێوەرانەی لەسەر بناغەی پێوانەکردن و وەسفکردن بنیات نەنراون.

نموونەی ئەوە: هەڵسەنگاندنی جێبەجێکردنی ماتۆڕسوارەکە، ئەگەر ماوەکەی بە کاتێك بڕی کە گونجاوبێت لەگەڵ ئامانجەکەدا، ئەوا دەوترێت ماتۆڕسوارەکە لێهاتووە، لێرەدا هەڵسەنگاندنەکە پشت بە پێوەرە پێوانەییەکان دەبەستێ. هەروەها ئەگەر ماتۆڕسوارەکە لەسەر کورسیی ماتۆڕەکە دانیشت و بەهێڵێکی ئاسۆیی لێیخوڕی و ڕەچاوی ڕێساکانی هاتوچۆی گرت، ئەوا هەر دەڵێین ماتۆڕسوارەکە لێهاتووە، بەڵام هەڵسەنگاندنەکە لێرەدا پشت بە پێوەرە وەسفکارەکان دەبەستێ.

ئاشنابوون بە هەردوو شارەزایی شیکردنەوەو هەڵسەنگاندن یارمەتیمان دەدات حوکم بدەین بەسەر ڕادەی بێخەوشیبوونی خۆمان و مامۆستاکانمانە لەم بیرکردنەوەیەدا، چونکە وردبینی لە شیکردنەوەی چەندایەتی و

چۆنایەتیداو پشتبەستن بە پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی پشتئەستوور بە پێوانەکاری یان وەسفکردن مەسەلەگەلی گرنگن بۆ حوکمدان بەسەر چالاکیی بیرکردنەوەی رەخنەگرانەدا.

## پەراوێزەکان:

1–سائیب ئەحمەد ئەلئالوسی: شێوازەکانی پەروەردەکردنی قوتابخانەیی لە پەرەپێدانی توانستەکانی بیرکردنەوەی داهێنەرانەدا– پەیامی کەنداوی عەرەب ل75.

2–وەسفی عسفور و محەمەد تەرخان: بیرکردنەوەی رەخنەگرانەو فێرکردنی قوتابخانەییو ناو پۆل، گۆڤاری مامۆستا 1999ی زاینی.

3–یوسف قوتامی: بیرکردنەوەی منداڵان–گەشەکردنو شێوەی فێرکردنی، چاپو بڵاوکردنەوەی الاهلیە، عەمان 1990، ل699.

4–هەمان سەرچاوە ل707.

5–هەمان سەرچاوە ل707.

6–هەمان سەرچاوەی پێشوو.

7–فەتحی عەبدولرەحمان جەروان: فێرکردنی بیرکردنەوە– چەمکەکانو پراکتیکەکان، دار الکتاب الجامعی، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەب، 1999ی زاینی.

8– *Alfaro- Lefevre, Rosalinda: Critical Thinking in Nursing, Saunders Co, 1995, pp13*

9–ئیبراهیم مەحمود وەجیە: فێربوون، قوتابخانەی ئەنگلۆ– میسری، قاهیرە 1976، ل370.

10– فەتحی عەبدولرەحمان جەروان: فێرکردنی بیرکردنەوە– چەمکەکانو پراکتیکەکان، دار الکتاب الجامعی، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەب، 1999ی زاینی.

11– عەزیزە ئەلسەید: بیرکردنەوەی رەخنەگرانە–لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی دەروونزانیو مەعریفەزانی، دار المغرفە الجامعیە، میسر 1995.

12– عەبدولرەحمان عەدەس: دەروونزانیی پەروەردەکارانە– تێروانینێکی هاوچەرخ، دار الفکر، عەمان 1999.

13– فەتحی عەبدولرەحمان جەروان: فێرکردنی بیرکردنەوە– چەمکەکانو پراکتیکەکان، دار الکتاب الجامعی، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەب، 1999ی زاینی ل63–64.

14– ئەوەی لای ئەلحارسی هێمای پێکراوە 1999.

15– مەحمودو ئەوانی دیکە 1996.

## سەرچاوەکان:

1–ئەوانەی لە پەراوێزەکاندا هێمایان بۆ کراوە.

2–ئیبراهیم عاسی سەلیم ئەلمساد: ئاشنابوونی مامۆستایانی خوێندنە کۆمەڵایەتیەکان دەربارەی شارەزاییەکانی بیرکردنەوەی رەخنەگرانەو رادەی پراکتیزەکردنیان، ماستەرنامە– زانکۆی ئەلیەرموك، ئۆردون 1997.

3–یوسف قوتامی: دەروونناسی فێربوونی ناو پۆل، دار الشروق للطباعةو النشر، عەمان 2000.

4–شیت مایرز: فێرکردنی خوێندکاران بە بیرکردنەوەی رەخنەگرانە: مرکز الکتب الاردنی، وەرگێرانی عەزمی جەرار 1993.

5–تۆفیق مەرعیو ئیبراهیم خەریشە ئەلقاعود: پرۆگرامەکانی پەروەردەی کۆمەڵایەتیو شێوازی وتنەوەیان، وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن، عەمان 1993.

## سەرچاوەی بابەتەکە:

ماڵپەری "منتديات العز الثقافية"

# رۆژێك له ئەسینای دێرین

**ولیەم داڤیس**

له ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

### خوێندنی شیعر

بۆ پەرەپێدانی ئاکاری چاك‌و توانستی هزریی نایاب له منداڵاندا، پێویسته پەرەگرافی دوورودرێژی شاعیره مەزنەکانی هێلاس لەبەربکەن. بۆ نمونه سیۆگانی (رەچەڵەکی خواوەندان) که شێوازێکی تەژم‌و پەندئامێزی هەیەو بەرهەمی دانایيه نێودارەکەی هیسیۆدە، لەگەڵ ئەویشدا خوێندنی فۆکیلادێس دەخوێنن له هەموو قوتابخانەیەکی ئاتیکادا باوە[1]. بەڵام مەزنترین تێکست که باڵی بەسەر هەموو تێکستەکانی دیکەدا کێشاوە، هۆمیرۆسە، ئەوەی سەردەمەکانی دواتر پێی دەڵێن"ئینجیلی یۆنانییەکان". تەنانەت لەو قوتابخانه بچووکەشدا که چووین بۆ سەردانی، چەندین قوتابی دەبینین که دەتوانن پێنج لەسەر شەشی داستانه درێژەکەی ئەلیادەو ئۆدێسه لەبەر بڵێنەوە. لەوێ کوڕێکی تۆزێك لەوان گەورەتری لێیه (ئەمەیان حاڵەتێکی تایبەتی بلیمەتانەیە) دەتوانێت وشه به وشه هەموو داستانەکه لەبەر بڵێتەوە[2].

کەواته نەبوونی کتێبەکانی دی به هۆمیرۆس قەرەبووکراوەتەوە. منداڵی ئەسینایی یادەوەرییەکی دەوڵەمەندی هەیە.

تێکستەکانی هۆمیرو "خوێنەرەکانیشی" چەند دڵگیرن! ئای نیهادو گەوهەری بەنرخیان تێدا هەیه بۆ ئەوەی چاویان لێبکرێت: ئەشیل، پیاوێکی دانای رەشبینی شارپەروەری لەدڵا شیرین، لەبەردەرگای ترۆی (تەروادە) دا دەجەنگێت (هەڵمەتبردنەکەی مەرگێکی راشکاوانەی تێدایە) لەچاو ژیانی ناکەسانەی بێڕەنجکێشاندا له ماڵی خۆیان له پیسیا، وەلێ هەر دەچێت. یان ئۆدیسیۆس "پاڵەوانی فرەلایەن" که جۆرەها نەخۆشی‌و ناڕەحەتی دەچێژێت، رێگه نادات تەنانەت کالیپسۆی خوداوەندیش فریوی بدات‌و له خۆشەویستی "پێنلۆپی دانا" پەشیمانی بکاتەوە، هەمیشه بەخۆی‌و چیرۆکێکی زرنگانەوە ئامادەیە، درۆیەکی قایلکەرانەی پێیه، کاتێکیش پێویست بکات، تواناو وزەیەکی دلێرانەی تێدایە. ئەمشەو کوڕان دەڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان‌و له مێشکی

خۆیاندا مکومانە بڕیاریانداوە بەرگەی هەموو شتێك بگرن، بەڵام هەرگیز هاوڕێیەکی لێقەوماوی خۆیان جێنەهێڵن، ئەوانیش وەکو ئەشیل بکەن و جوامێرانە بجەنگن، هەر کە ئەرکی سەرشان بانگی کردن، ئیتر وەکو چۆن ئۆدیسیۆس و هاوڕێکانی وازیان لە خۆشی و رابواردن هێنا، ئەوانیش ئاوا چواریان بەرامبەری چل کەس بوەستنەوە. فەیلەسوفانی وەکو ئەفلاتون، نارەزایی دەردەبڕن: "هۆمیرۆس گەلێك بیرۆکەی بێویقارو ناشایستە دەربارەی خوداکان دەخاتە مێشکی منداڵانەوە"، پیاوی سەردەمێکی دواتریش پێدادەگرێت: "هۆمیرۆس دەربارەی نیکییە رەسەنەکان و راستگۆیی و شەرەفمەندی، هێشتا کەمی پێبووە بیڵێت"[3]. وەلێ هێشتاکە ئیلییاد و ئۆدێسێ دوو مەزنترین کتێبن جیهان بە خۆیەوە بینیبنی. بە دڵنیایی ئەو دوو کتێبە باشترین شتن بۆ منداڵەکان.

بەبۆچوونی ئەفلاتون، پێش ئەوەی منداڵان شیعر بخوێنن سێ ساڵیان پێویستە بۆ فێربوونی سەرەتاکانی خوێندنەوەو نوسین. منداڵەکان چەندین ساڵ بەسەردەبەن کە تێیاندا زۆربەی بەیانیانیان بەڕێزەوە لەبەردەمی مامۆستاکەیاندا دەوەستن و ئەویش لەسەر کورسییەکەیەوەو لە تۆمارەکەی بەردەستییەوە بۆیان دەخوێنێتەوەو لە نوسەرێکەوە دەچێتە سەر نوسەرێکی دی، قوتابییەکانیش جار لەدوای جار لەدوایەوە دەیڵێنەوە، تا ئەوکاتەی بەتەواوی لە بەریان دەکەن، مامۆستاش جارجارە پێیاندەبڕێت تا بە باسکردنی مێژوویەکی ئەندێشەیی، یان پرسیارێکی ئێتیکی، خاڵێکی جوانی میتۆلۆجیایان بۆ روونبکاتەوە.

## گریکەکان زمانی بیانی ناخوێنن

لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکاندا، مەودای خوێندنیشیان بەرینتر دەبێتەوە، وەلێ یەك بابەت لە خوێندنەکەیاندا بەشێوەیەکی نامۆ سنوردار دەمێنێتەوە. لە کۆرسەکانی خوێندنی منداڵانی گریکدا، جێگایەك نیە بۆ خوێندنی زمانی بیانی. گەرچی ئەگەر پیاوێك خۆی تەرخانبکات بۆ سەفەری دوور، پێویستی بە فارسی یان میسری دەبێت، ئەمەش شتێکی بێهودەیە کە لە تەمەنێکی گەورەتردا خوێندنی زمانی پاتۆکۆنی یان پاپیوایی سەرهەڵدەدات[4].

لە دامێنی پێراوسدا، چەند خاوەن مەڕوماڵاتێك هەن کە دەتوانن بە زمانی میسری، فۆنیکی، بابلی بدوێن. ئەوان پێویستیان بە زمان هەیە بۆ بازرگانییەکەیان. بەڵام تەنانەت ئەوانیش هیچ شانازییەك بەوەوە ناکەن کە دەیزانن. زاری ئاخاوتنی پڕجۆش و مانادارو سەرنجڕاکێشەری هیلاس بۆ ئەسینایییەکان بووەتە مایەی ئەوەی ژیانێکی زۆر دەوڵەمەندی ئەدەبی و هزرییان هەبێت. دەرەکی (بەربەری) چی هەیە تا بیبەخشێت بەو؟ زۆرکەس دەڵێن، هیچ، جگە لە چەند پارچەزێڕێك دەبنەهۆی گەنەڵبوونی سیاسەتمەدارەکانیان. هەروەها چەند شتێکی دیکەشیان هەیە، قاڵی، کەلوپەلی جوان، کە بێ ئەوانەش هێلینییەکان دەتوانن بە باشی بەڕێوەبچن. کوڕیژگەی ئەسینایی پێویستی بەوە نیە وەك هی ئەمڕۆ داخی دڵی خۆی بە زمانەکانی لاتین، فەرەنسی، ئەڵمانی یان هەر هاوتایەکی دیکەی زمانی یۆنانی بڕێژێت، چونکە زمانەکەی خۆیان ئەوەندە پێچ و پەناو گرێ و گۆڵ و ئاڵۆزیی تێدایە کە بە دەستییەوە داماوەو دەشبێت فێری ببێت،

چونکە زانینی زمان بە باشی لەوێ بەشێك بووە لە خەسڵەتەکانی ژیانی چاك.

### خوێندنی مۆزیك

ئەسینابییەکان شتێکیان هەیە جێگەی دەسبەرداربوونی زمانەکانی دیکەیان بۆ بگرێتەوە، ئەویش خوێندنی مۆزیکە. زۆرجار لەوە زیاتر دەخوێنن کە بە تەنها بریتی بێت لە زاخاودانی گوێ بە تۆنە خۆشەکان. بەڵکو بریتیە لە خوێندنی ئەوەی کامانەن ئەو هێزە خانەدانانەی لە هەستوسۆزەکانماندا هەن و لە هەموویان باڵاترن[5].

لە راستیدا هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە ناوچەی بەرینی نۆ موسێسەکەوە دێن، تەنانەت رەنگە بەهرەی مێژوونوسینەوەش لەگەڵ ئەواندا دابنرێت. هەرچۆنێك بێت خوێندنی مۆزیك بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی، لەوانەیە مۆزیك وەها دابنرێت کە بریتیە لە خڕبوونەوە لە دەوری ئامێرەکان بۆ ژەنین و گۆرانی وتن. مامۆستای مۆزیك لە ماڵێکی جیا لە مامۆستای پیتەکان دەژی. ئەریسۆفان باس لەو نەریتە دێرینە جوانە دەکات کە بۆ فێرکردنی مۆزیك باو بووە "کوڕانی هەمان گەڕەکی شار بەناو قوڕو لیتەدا دەڕۆن، بەناو بەفرو باوبۆراندا دەگەنە ماڵی مامۆستای هارپژەنین. لەوێ مامۆستا چەند ئاوازێکی نێوداریان فێردەکات، میلۆدییان پێ لەبەردەکات. ئەگەر یەکێك لە منداڵەکان خراپ جوڵایەوە یان لە وتنەوەی میلۆدییەکەدا دەنگی لەرزی و ساز نەبوو، رووبەڕووی ترسی ئەوە دەبێتەوە کە لە مۆزیك بێبەشبکرێت[6].

بۆ هەموو منداڵێك و گەورەیەکیش فێربوونی گۆرانی وتن بەشێوەیەکی باش و لەبار زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بتوانێت لە کۆراڵە مەزنەکاندا بەشداریی بکات، کە پێکهێنەرێکی بەرچاوی فێستیڤاڵە ئاینییەکان بووە، وێڕای ئەوەش زانینی گۆرانی وتن یارمەتییەکی گەورەیە بۆ چێژوەرگرتن لە هۆنراوە لیریکییەکان یان کۆرسەکانی ناو تراژیدیاکان، هەروەها لە فێربوونی زمانپاراوییدا. بۆ فێربوونی گۆرانیوتن ئاوازی تەنها بە دەگمەن سوودی هەیە، شتێکی زۆر خانەدانانە نیە لە گەشەپێدانی کەسەکاندا، چونکە شتێکی زۆر کەمی تێدایە بەکەڵکی لێزان و شارەزایان بێت. هەروەها لەگەڵ ئامێری لەباری مۆزیکدا.

یۆنانەکان، پیانۆ و ئۆرگیان نیە، زیاتر ئامێری مۆزیکی مسینیان هەبوو، فلوت و چەنگیان هەبوو، گەرچی دەنگیشیان زۆر خۆش بوو، بەڵام لەبەردەمی رەخنەی سەدەی بیستەمدا زۆر لاوازن. ژمارەیەکی زۆری ئامێرە مۆزیکییەکان لە ئەسینا هەبوو، وەکو نەریتێك نزیکەی هەموو کەسێکی ئەسینایی چەنگێکی هەبوو، چەنگ باوترین جۆری هارپ بوو، چەنگ زۆر لەباربوو بۆ کوڕێکی تەمەن مامناوەندی. بەڵام قەشەنگترین و رەنگینترین ئامێری مۆزیك کیسارا بوو کە تەرخانبوو بۆ شارەزایان. لاوێکی ئەسینایی چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرا بتوانێت چەنگ بژەنێت و بە دەمیەوە گۆرانی بڵێت، هەروەها بشتوانێت هاوشانی هاوڕێکانی چەنگەکەی بژەنێت

یەکێکی دیکە لە ئامێرە باوەکان فلوت بوو. فلوت لە سادەترین شێوەیدا دووزەلەی دەستی شوانێك بوو، هەموو کەسێك دەیتوانی بە پارچە قامیشێك و چەقۆیەك دانەیەك بۆخۆی دروست بکات. پاشان نۆرەی دەستڕەنگینی دێت، دوو پایپ پێکەوە دەلکێنرێن و سەردەمەکانیان بە تەختە دروست دەکەن، ئەمە ئامێرێکە زۆر شتی

پێدەکرێت، بەڵام لە قوتابخانەکان بەقەدەر چەنگ پەسەند نیە. کێ هەیە ڕۆژانە بەردەوام دەم بنێت بە فلوتێکەوەو خەریکی فووکردن بێت تا چەناگەی خواردەبێت. پاشان کوڕی خانەدانەکان نەیاندەویست شارەزایی تەواو پەیدابکەن، گەلێك فلوتژەنی میللی گەڕۆك لە کۆمەڵگادا هەبوون و ئەوان کارەکەیان دەکرد، ئاوازە خەمڕەوێنەکان ئەوەی دەهێنا بەکرێ بگیرێن بۆ ژەنین.

## خەسڵەتی ئاکاریانەی مۆزیکی یۆنانی

گۆرانی و ژەنینی هارپ یان فلوت پێویستییان بە ئاگادارییەکی باشی کاراکتەری کوڕێژگەکان هەیە. ئەو مامۆستایەی قوتابییەکانی فێری ژەنینی ئاوازی هەژێنەری سۆزو ئەندێشە دەکات (شێوازی لیدیایی)، ڕووبەڕووی تووڕەیی دایکوباوکی منداڵەکان دەبێتەوەو لەوانەیە بێبەریشی بکەن لە سایەو سێبەری خۆیان. چونکە مۆزیکی نەرمو نیان و پڕ نازو میهر ژنانەیەو زیاتر لە بەشی ژنان دەژەنرێت و سوودێکی ئەوتۆی بۆ کوڕان نیە. هەروەها مۆزیکی پڕ هەراو زەناو ئاشوبیش (شێوازی ئایۆنیایی) تەنها بەکەڵکی گۆرانییەکانی کاتی شەرابنۆشین دێن و لە ساتەکانی دیکەدا ژەنینیان ڕێپێدراو نیە[7]. ئەوەی زیاتر پەسەندەو حەزی لێدەکەن، مۆزیکی خەمباری هێمنە، کە شێوازێکی دڵگیری دەرون مەستکەری دۆرییە، ئەم شێوازە وا لە کوڕان دەکات بەهێزو تۆکمەو جوامێر بن. مۆزیکی ئوستادانەی پڕ لەرەو سەدا بە کەڵکی لاوانی ئەوان نایەت. بە سادەیی گوێچکەیەکی مەشقپێدراو لەو ئاوازە نەرمانە چێژ وەردەگرێت، بەڵام هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر کاراکتەری مرۆڤ نیە، جا مۆزیك سوودی چیە ئەگەر وا لە پیاوەکان نەکات چاکتر بن و باشتر هەڵبسوڕێن؟ ئەسینایییەکی مەشقکردوو لەسەر مۆزیك، بەشێکی زۆری مۆزیکی میللی و کلاسیکی سەردەمەکانی دواتری بەدڵ نیە[8].

## فێرکردنی جیمناستیك

سەردانی قوتابخانەو بۆ لای مامۆستای هارپژەنین، بەشێکی زۆری ڕۆژەکەمانی سەرفکرد، لە دەوروبەری پاشنیوەڕۆدا، بەشی سێهەمی بەرنامەی خوێندنیان دەستپێدەکات: مامۆستای جیمناستیك، بە خۆی و زەبرو زەنگییەوە دێتە لایان. لای دایاك و باوکی منداڵەکان، ئەم بەشەی خوێندن لە بەشەکانی دیکە کەمتر نیە. ئەگەر دەستەواژەیەکی ئەسینایییانە بخوازینەوە، دەڵێین (پێویستە منداڵەکانیان لە رووی جەستەییەوە جوان بن)، هەروەها ڕۆژێکیش لە ڕۆژان ببن بە هاوشاری چاك، لە شەڕەکاندا جوامێریی خۆیان بنوێنن. پالاستراس (جێگاکانی زۆرانگرتن) دەکەونە کەناری شارەوە، لەوێ زەوی هەرزانەو هەوای پاك و سازگاریش هەیە. لەوێ مامۆستایەکی پسپۆڕ سەرپەرشتی منداڵەکان دەکات و ڕێنماییان دەکات و فێریان دەکات وەرزشەکانی ڕاکردن، مستبازێن، زۆرانگرتن، هەڵدانی دیسك، رم هاویشتن بکەن. ئەم مەشقانە بۆ ئەوە نین منداڵەکان ببنە پاڵەوانی لێهاتوو، بەڵکو دڵی دایکوباوکیان دەڕەنجێت ئەگەر جەستەیەکی تەندروست لە منداڵەکانیاندا پەروەردە نەکرێت[9]، ئەگەر لانیکەم تا ئاستێکی مامناوەند فێری وەرزش و چەند مەشق و مانۆڕێکی سەربازیی باو نەکرێن. بێگومان ئەو کوڕانەی توانای جەستەیی دیاریان هەیە، ئەوانە بیر لەوە دەکەنەوە لەسەر گەمەو یارییە جیاجیاکان مەشقبکەن، ئەوانەی لە ئۆڵۆمپیا نمایش دەکرێن، ئەمە وێڕای

ئەوەی کە بۆچوونی باو لەگەڵ ئەوەدا نیە کە لە مەشقە وەرزشییەکاندا زێدەڕۆیی بکرێتو زۆر بچنەپێش، بەڵکو زیاتر بە پەروەردەکردنو پێشخستنی هزرەوە خەریکن، هەموویان دەڵێن "ئەی مێشکی مرۆڤ شایستەی ئەوە نیە کە پێشبخرێت؟"[10].

لای ئێوارە مامۆستا منداڵەکان ماندوو و شەکەتو برسی ڕەوانەی ماڵەکانیان دەکاتەوە.

منداڵەکان هەتا گەورەتر بن، دایکوباوکیان دەیانخەنە بەر خوێندنی زیاترو هەمەجۆرتر، هەندێکیان ڕەوانەی لای مامۆستای ڕەوانبێژیو وتاربێژی دەکرێن، سۆکراتی نێودار شێوازی ئاخاوتن فێری لاوان دەکاتو یاریدەیان دەدات لە ڕەفتارو کرداری سیاسیدا بچنە پێشەوە. هەندێکی دیکەشیان دەچن بۆ لای ئەفلاتون، کە لەناو ڕەزوباخەکەی ئەکادیمیادا فەلسەفەکەی خۆی دەووتەوە، یان لەگەڵ هەندێك لە کێبارەکانیدا دەکەوتنە مشتومڕ دەربارەی دانایی تیوریی. بەڵام ئێمە ناتوانین شوێنی هەر هەموویان بکەوینو بزانین چی دەکەن.

## سەربڵندیو خوو و نەریتی کوڕانی قوتابخانە

ئەوە ڕاستییەکی ڕوونە، کە لە دەوروبەری تەمەنی سیانزەساڵیدا، پەروەردەی ئەسینایی کاریگەریی خۆی لەسەر قوتابییەکان داناوە. لەبری ئەوەی ئەو منداڵانە "گیانەوەری کێوی بن" وەك ئەفلاتون بە کەسی نەخوێندەوارو مەشقنەکردوو دەڵێت، ئێستا بووە بە "بونەوەرێکی یەزدانییانەی لەدڵ شیرین". کوڕە قوتابی باش مەشقکردوو ئێستا بە سەربەرزی بەرەو قوتابخانەکەی دەڕوات، قوڵو بازووی لە چیتۆنەکەیەوە ئاڵاندووە، لاسایی گەورەکان دەکاتەوە. ئەگەر کەسێکی لەخۆی گەورەتر قسەی بۆ بکات، بەشێوەیەکی میانڕۆیانە رادەوەستێتو وەکو کچۆڵەیەك کچۆڵەیەك شەرم دایدەگرێتو سەری دادەخات. لە قوتابخانە فێرکراوە خۆی لە ئاگۆرا بەدووربگرێت، خۆ ئەگەر ناچاریش بوو پێیدا بڕوات، ئەوا زۆر نەمێنێتەوە. جیهان پڕە لە خراپەو شتی دزێو، بەڵام ئەو فێری ئەوە کراوە کە چەند دەتوانێت کەم لەوانە ببیستێتو ببینێت. کاتێك پیاوان باس لە ڕەنگی تەندروستی پێستی ئەو دەکەن، سەرنجەدەن لە جوانبوونی جەستەیو لە قوتابخانەی زۆرانبازی سەرسامی خۆیان بە قەدوباڵای دەردەبڕن، پێویستە لەخۆی بایی نەبێت. فێری ئەوەش کراوە کە شتێکی کەم لە کتێبەکانەوە فێر ببێت، بەڵام زۆربەی ئەو شتانەی فێریان دەبێت، لە گوێگرتن لە ئاخاوتنو دەمەتەقێی خەڵکانی زرنگو خاوەن زانیارییەوە بەدەستیان دەهێنێت. لەگەڵ گەورەبوونیدا، باوکی دەیبات بۆ شوێنە گشتییەکانی کۆبوونەوەو فێری دەکات کە "حکومەتی دیموکراتی" ئەسینا چۆن کاردەکات. ئیتر ئەویش وای لێدێت شانازی بە شارەکەیەوە بکات. ئیتر ئەمە تەواوی خوێندنی کوڕەکەیەو لە سەراپای ژیانیدا بەکاریدەهێنێت. بەشی زۆری ئەو دڵسۆزییەی کە لە پیاوێکی گەورەی سەردەمانی دواتردا هەیە، لە نێوان ماڵی خۆیانو کەنیسەکەی، کۆلێجەکەی، شارەکەی، وڵاتەکەیدا دابەشبووە، بەڵام کەسێکی ئەسینایی تەنها باس لە "پۆڵسی خۆم" دەکات، وەك شاری ئەسینا. ماڵی ئەوان شوێنێکە بۆ خواردنو نوستن، قوتابخانەکەی دەزگایەکی مەزن نیە، ئەوپەڕەکەی دووکانێکە بۆ فێربوون، کەنیسەی ئەو ئاینی باب‌وباپیرانێتی، ئاینێکە دەستی لەکاروباری ئیدارەکەیاندا دەڕوات، هۆڵی دادگاییکردنی ئەوانەیە کە لە شەڕگە هەڵدێن، شارەکەیو گەلەکەی پێکەوە شاری سەربەخۆی

ئەسینا پێکدەهێنن. پەرۆشەوە هەست بە وەفاداری دەکات بەرامبەر هیلاس، رقی لە پادشای مەزنی فارس دەبێتەوە، بەوپێیەش داکۆکی لە خاکی خۆی دەکات. لە قەیرانە راستەقینەکانی وەك سالامیسدا خۆی رادەگرێت، لە حاڵەتی ئاسایشدا، ناحەزییەکی زۆری لەگەڵ سپارتەدا هەیە.

## ئیفێبی

کەواتە پەروەردەی ئەسینایی بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش بۆ ئەوە دارێژراوە کە منداڵ بکات بە هاوشاری سودمەندو شایستە، تا وای لێبکات میانڕۆ بێت، زیتو وریا بێت، جەستەی بەهێزو پیاوانە بێت، جوانیی خۆشبوێت، چ لە کردارو چ لە هونەردا. خوێندن نارێکییە تایبەتییەکانی بە تەواوی راست ناکاتەوە، بەڵام بە دڵنیایی گۆشەنیگایەکی پێدەبەخشێت بەرامبەر بە شکۆداریی کارکردن. ئیتر منداڵەکە یان پیاوێکی چاکی خانەدانی لێدەردەچێت، لەوانەی کە لە شەڕوشۆڕو سیاسەتدا یان لە فەلسەفەدا خۆیان دەسەلمێنن، یان ئەگەر لە خێزانێکی هەژارەوە هاتبێت، ئەوا لانیکەم ئیرەیی بە چینی دەوڵەمەند دەباتو هەوڵدەدات لاساییان بکاتەوە.

لە دەوروبەری تەمەنی هەژدەساڵیدا، رۆژانی خوێندنی منداڵانی ئەسینا دەگاتە کۆتایی. لەو تەمەنەدا لە لایەنی باوکییەوە ئاهەنگێکی بچووکی بۆ ساز دەکرێتو بەشێوەیەکی فەرمی لەناو ئەندامانی دیمەکەی خۆیاندا تۆماردەکرێت[11]. قژی سەری کە بەرەو ناوشانی درێژبۆتەوە، کورتدەکرێتەوە. ردێنی درێژدەکاتەوە. لە پەرستگای ئەگلاوروس لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا، سوێندی دڵسۆزیو وەفاداری بۆ ئەسیناو یاساکانی دەخۆن. بۆ ماوەی ساڵی داهاتووش وەك سەربازێك لە پیراوس خزمەت دەکاتو مەشقێکی سەربازیی چاکی دادەدرێت. ساڵی داهاتوو شارەکە نێزەو قەڵغانێکی نوێی دەداتێو ئینجا لە خێوەتگایەکی سەنتتردا ئێشك دەگرێت رووبەڕووی پۆیتیا یان مێگارا[12]. پاشان ئازاد دەکرێت لێرەبەدواوە چیتر ئێفێبوس نیە، بەڵکو هاوشارییەکی تەیارو سازەو هەموو دەروازەکانی ژیانی ئەسینایی لەبەردەمیدا دەکرێتەوە.

## پەراوێزەکان

1. فۆسیلیدێس کە چەند برگەیەکی پەرتوبڵاو لە هۆنراوە ئاکارییەکانی بەدەستی ئێمە گەیشتوون، خەڵکی ئایۆنیا بوو، لە دەوروبەری 560ی پێش زاییندا لەدایکبووە. هۆنراوەکانی ئەو لە قوتابخانەکاندا زۆر پەسەند بوون.

2. لەمبارەیەوە بروانە سیمپۆزیەمەکەی زینۆفۆن 3:5.

3. گومان لەوەدا نیە کە لانیکەم نیکیی پایەداری شکۆمەندی لە پەروەردەی ئەسینابیدا خوێندراوە. درۆکردنو ناپاکی زۆر دزێو و قێزەون بووە، بەڵام وەك لە وردێسێدا هاتووە هەندێجار پێویستە. بۆیە ئەوە شتێکی دروستە ئەگەر بڵێین بەگشتی کوڕانی بەرخوێندن لە ئەسینا جێگای متمانەن. چیرۆکەکەی "جۆرج واشینگتۆنو درەختی گێلاس" لای ئەسینایییەکان هەر گوێشی لێناگیرێت. ڤێرجینیای مەزنیش لای ئەوان تووشی گازاندە دەبوو بەوەی نەیانتوانیوە درۆیەکی لێهاتووانە بدۆزنەوە.

4. ئەم راستییە رێگەی لە یۆنانییەکان نەگرتووە کە رێزێکی بەرچاو دابنێن بۆ فەرهەنگو دابونەریتی گەلانی دی، بۆ هی نمونە میسرییەکان، لە لایەکی دیکەشەوە گەلێك شتیی دەرەوەیان خواستۆتەوەو داهێنانەکانی

ئەوانیان بەکارهێناوە، کەچی هەموو ئەمانە وای لێنەکردوون بیر لە فێربوونی زمانە بیانییەکان بکەنەوە.

5. ئەرەستۆ لە سیاسەت بەرگی پێنجەم یان هەشتەمدا دەڵێت خوێندنی ئەدەب مەشقکردنە بە مێشك، بەڵام مۆزیك گەرچی بۆ هیچ شتێکی پراکتیکی بەکارناهێنرێت، بەڵام ئاسودەگییەکی خۆشو نایابمان پێدەبەخشێت.

6. Aristophanes's "The Clouds". The whole passage is cited in Davis's "Readings in Ancient History," vol. I, pp. 252-255.

7. ئەو مۆدە فریگییانەی لێوەی مۆدی ئایۆنی وەرگیراوە، ئەوساش هەر دڵگیر نەبووەو بە مۆزیکی خەمبار ناسراوەو بە تەنها بۆ چەند بۆنەیەکی ئاینی تایبەت بەکارهاتووە.

8. چەند میلۆدییەکی زۆرکەمی یۆنانیمان پێگەیشتووە، ئەوانیش بەنیسبەتی گوێچکەی مرۆڤی مۆدێرنەوە خۆش نین. تەنها شتێك کە دەتوانین بیڵێین ئەوەیە هێلینییەکان خاوەنی هزرێکی زۆر جوانناسو هارمۆنی بوون، بۆیە مەحاڵە مۆزیکەکەیان نوشوستی هێنابێت لە خانەدانیو جوانیداو میلۆدی راستەقینەیان نەبووبێت.

9. وردەکارییەکانی وەرزشی منداڵان هەر بەو شێوەیەیە کە دواتر گەورەکان لە جیمنازیۆم بەکاریاندەهێنن، لێرەدا زۆر لەسەری نەڕۆیشتووینو هەڵمانگرتووە بۆ ئەو نەسکەی باسی جیمنازیا دەکەین.

10. یەکێکە لەو ناوچە بچووکانەی کە ئاتیکا بۆیان دابەشکراوە.

11. ئەو دوو ساڵەی ئێفێبی کە دەبێت ئەسیناییەکان بچنە بەر خزمەت، لە رووی لیاقەتەوە لە خزمەتی سەربازیی دەچێت کە ئێستا لاوانی ئەوروپایی لەسەرشانیانە بیکەن.

## سەرچاوە

***WILLIAM DAVIS:***

***A Day in Old Athens***

# ڕۆمان وەکو لێکۆڵینەوە

**میشێل بوتۆر**

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

(1)

**ڕۆمان شێوەیەکی تایبەتییە لە گێڕانەوە (*Recit*).**

گێڕانەوە دیاردەیەکە کە بەشێوەیەکی بەرچاو لە قەڵەمڕەوی ئەدەب زیاتر بڕ دەکات و یەکێکە لە بەدیهێنەرە سەرەکیەکانی مامەڵەی ئێمە لەگەڵ واقیعدا. هەتا کاتی مردنمان و لە کاتێکەوە کە هەستمان بە قسەکردن کردووە، بەشێوەیەکی هەمیشەیی بە گێڕانەوە گەمارۆ دراوین، یەکەمجار لەناو خێزاندا، پاشان لە قوتابخانە و دواتر لە ڕێگەی بیستن و خوێندنەوەکانمانەوە.

کەسانی دی بەلای ئێمەوە، تەنها ئەو شتانە نین کە لەوانەوە بەچاو دیومانە، بەڵکو ئەو شتانەشە کە ئەوان لە بارەی خۆیانەوە بۆیان باسکردووین، یان کەسانی دی لە بارەی ئەوانەوە بۆیان باسکردووین. "واتە کەسانی دی" تەنها ئەوانە نین کە بینیومانن، بەڵکو هەموو ئەوانەشن کە لە بارەی ئەوانەوە قسەیان بۆ کردووین.

ئەمە تەنها سەبارەت بە مرۆڤ ڕاست نییە، بەڵکو دەربارەی شت و بۆ نموونە دەربارەی شوێنیش ڕاستە کە من نەچووم، بەڵام کەسانی تر بۆیان باسکردووم.

ئەم گێڕانەوەیەی کە ئێمە تیایدا نقومبووین، چەند شێوەیەکی جۆراو جۆر بە خۆیەوە دەبینێت: لە گێڕانەوەی ناو خێزانەوە، بیگرە واتە لەو زانیاریانەوە کە ئەندامانی خێزان لەسەر مێزی نانخواردن دەربارەی ئەوەی کە ئەو ڕۆژە کردوویانە بەیەکتری دەدەن، تا هەواڵی ڕۆژنامە یان کتێبە مێژووییەکان، هەریەکە لەم شێوانە بەیەکێ لە بوارە تایبەتییەکانی واقیعەوە گرێمان دەدەن.

هەموو ئەم گێڕانەوە واقیعیانە خەسڵەتێکی هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە، بەشێوەیەکی گشتی، قابیلی بەدیهاتنن. دەبێت من بتوانم ئەوەی کە فلان کەس پێی وتووم لەگەڵ ئەو زانیاریانەدا کە لە کەسێکی ترم وەرگرتووە بسەلمێنم و ئەم کارە هەتا سەر درێژە بکێشێت. ئەگەر وا نەبێت مانای وایە من لەگەڵ هەڵەیەك یان لەگەڵ مەسەلەیەکی خەیاڵیدا مامەڵە دەکەم.

لەناو هەموو ئەو گێڕانەوانەدا کە بەشی زۆری ژیانی ڕۆژانەی ئێمە لە سایەیاندا فۆرمەڵە دەبێت،

چەند گێڕانەوەیەك هەن كە بێگومان دروستكراون. ئەگەر بۆ خۆدزینەوە لە هەر جۆرە گومانێك، چەند تایبەتمەندیەك بەو ڕووداوانە بدەن كە باسی دەكەن بۆ ئەوەی ئەم ڕووداوانە لەوانە جیابكەنەوە كە ئێمە خووی بینینمان پێوە گرتوون، مانای وایە ئێمە لە بەرامبەر ئەدەبی خەیاڵیی و ئەفسانە و چیرۆكی پەریان و شتی لەو بابەتەدا وەستاوین. رۆماننووس چەند رووداوێكمان بۆ دەخاتە ڕوو، دەیەوێت وەكو ڕووداوی ڕۆژانە چەند بتوانێت ڕوخسارێكی واقیعیان پێببەخشێت. دەتوانێت لە ئەنجامدانی ئەم كارەدا تا ڕادەی هەڵخەڵەتاندن بڕوات (دانیل دفر).

بەڵام ئەوەی ڕۆماننووس بۆمان دەگێڕێتەوە قابیلی بەدیهاتن نییە و لە ئەنجامدا، ئەوەندە بەسە كە ئەوەی ئەو وتوویەتی بتوانێت ڕوخساری واقیعی بەوە ببەخشێت كە باسی دەكات. ئەگەر من تووشی هاوڕێیەك ببم و ئەو هەواڵێكی سەرسووڕهێنەرم پێبڵێ، بۆ ئەوەی وام لێبكات كە باوەڕی پێبكەم، بەردەوام ئەو دەسكەلایەی بە دەستەوەیە كە بڵێت فلاَن و فلاَنیش شایەت بوون و بۆ خۆشم دەتوانم بڕۆم لە ڕاستی مەسەلەكە بكۆڵمەوە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، كاتێ نووسەرێ لەسەر بەرگی كتێبەكەی وشەی (ڕۆمان) دەنووسێت، بە كردەوە ئەوە ڕادەگەیەنێ كە بەدواداچوونی لێكۆڵینەوەیەكی لەو جۆرە بێهوودەیە. تەنها بە پشت بەستن بە قسەی ڕۆماننوسەكە دەبێت كارەكتەرەكانی ڕۆمانەكە قبوڵ بكرێن و بژین، ئەگەرچی لە واقیعیشدا بوونیان هەبێت.

گریمان ئێمە نامەی كەسێكمان دەستبكەوێ كە جێگەی باوەڕەو لە سەدەی نۆزدەدا ژیاوە لە نامەكەدا بۆ بەرامبەرەكەی نووسیوە ئەو زۆر چاك "بابە گۆریۆ"ی ناسیووەو ئەو كەسێتیە بە هیچ جۆرێ وانەبووە كە بەلزاك بۆی وەسفكردووین و بۆ نموونە لە فلاَن و فلاَن لاپەڕەدا چەند هەڵەیەكی گەورە هەن. بێگومان ئەم بانگەشەیە بەلای ئێمەوە بچووكترین بایەخی نیە، بابە گۆریۆ هەر ئەو كەسەیە كە بەلزاك بۆمان وەسفدەكات و (هەر ئەو كەسەیە كە دەتوانین لە ڕێی بەرهەمەكەی بەلزاكەوە لە بارەیەوە بنووسین و قسەی لەسەر بكەین). من دەتوانم ئیدیعای ئەوە بكەم كە بەلزاك لە هەڵسەنگاندنەكانیدا دەربارەی كەسێك كە خۆی دروستی كردووە، كەوتۆتە هەڵەوەو فلاَن و فلاَن لایەنی لەبەرچاو نەگرتووە، بەڵام بۆ باشتر ڕوونكردنەوەی بانگەشەكەم دەبێ پشت بە ڕستەكانی خودی دەقەكەی بەلزاك ببەستم، ناتوانم بەڵگەیەكی تر بهێنمەوە.

لە كاتێكدا كە گێڕانەوەی واقیعی پشتی بە سەرچاوەیەكی دەرەكی دەبەستێت، دەبێت خودی رۆمان بەس بێت بۆ ئەوەی قایل بین بەو شتانەی كە پێمان دەڵێت. بەم شێوەیە رۆمان قەڵەمڕەوی دیاردەگەرایی "فینۆمینۆلۆجیا"یەكی زۆر بالاَیە، جێگایەكی زۆر گونجاوە بۆ لێكۆڵینەوە لەوەی كە واقیع چۆن لای ئێمە دەردەكەوێ یان چۆن دەتوانێ دەربكەوێ. لەم ڕووەوە ڕۆمان تاقیگەی گێڕانەوەیە.

(2)

بەمپێیە، لە ڕۆماندا ئیشكردن لەسەر فۆرم لە ڕووی بایەخپێدانەوە لە پلەی یەكەمدایە. لە ڕاستیدا، گێڕانەوە واقیعیەكان، كە بەرەبەرە دەبن بە گێڕانەوەی گشتیی و مێژوویی، بە نەگۆڕی دەمێننەوەو دەبن بە شتێكی دۆگما و بەپێی چەند پرەنسیپێكی دیاریكراو بایەخی خۆیان لە دەست دەدەن. (ئەم مەسەلەیە ئەمڕۆ سەبارەت بە رۆمانە كلاسیكیەكانیش ڕاستە، واتە ئەو رۆمانانەی كە مەسەلەیەك تەرح ناكەن). بەرئەنجامێكی تر شوێنی دەرككردنی یەكەمجار دەگرێتەوە كە كەمتر دەوڵەمەندە و بەرەبەرە چەند لایەنێكی لەدەستداوە.

ئەم جۆرە بەرئەنجامە وردە وردە ئەزموونی واقیعی دەخاتە ژێر ڕۆشنایی خۆیەوە و خۆی شوێنی دەگرێتەوەو سەرەنجام دەبێت بە هەڵخەڵەتاندنێکی بە گشتی کراو. لێکۆڵینەوە لە فۆرمە جۆراوجۆرەکانی چیرۆك دەتوانێت لەو فۆرمەدا کەبەلای ئێمەوە بووە بەشتێکی ئاسایی، ئەوە ئاشکرا بکات کە دووبارە و بێبایەخە، دەتوانێت دەمامکی لەڕوو داماڵێت و لەو دەمامکە ڕزگارمان بکات و ئەو توانایەمان پێ ببەخشێت کە لە پشت ئەو گێڕانەوە نەگۆڕەوە، سەراپای ئەوە بەدەست بهێنینەوە کە پەردەپۆشی کردووە یان لە بارەیەوە بێدەنگ بووە، واتە تەواوی ئەو گێڕانەوە قووڵەی کە هەموو ژیانی ئێمەی تێدا دەگوزەرێ.

لەلایەکی دیکەوە، ئاشکرایە کە فۆرم، پرەنسیپێکی هەڵبژێردراوە و (ستایل "شێواز" لەم نێوانەدا یەکێکە لە لایەنەکانی فۆرم و بریتیە لە شێوەی پەیوەندی وردەکارییەکانی زمان لەگەڵ یەکتریدا، واتە هەڵبژاردنی فلاْن وشە یان فلاْن شێوەی دەربڕین لە جیاتی وشە و شێوە دەربڕینێکی تر). لە ڕاستیدا فۆرمە تازەکان، چەند شتێکی تازە کەشفدەکەن هەتا ئەو شوێنەی کە گونجانی ناوەکییان بەنیسیەت فۆرمەکانی ترەوە قابیلی پەسەندکردن بێت و بەهەمان شێوەش فۆرمە بەدەستهاتووەکە جدیتر بێت.

بە پێچەوانەی ئەمەوە، بۆ واقیعە جیاوازەکان، فۆرمی گێڕانەوەی جیاواز گونجاوە. بەڵێ، ئاشکرایە ئەم دنیایەی کە ئێمە تیایدا دەژین بە خێراییەکی زۆر لە گۆڕاندایە. تەکنیکە کلاسیکیەکانی گێڕانەوە لەوەی کە ناتوانن هەموو ئەو ڕاپۆرتانەی کە بەو خێراییە دەگەن لە خۆبگرن. ئەنجامەکەی ناکامڵیی بەردەوامە. بۆ ئێمە مەحاڵە هەموو ئەو زانیاریانە لە دەرونماندا ڕێکبخەین کە هێرشمان بۆ دێنن لەبەرئەوەی ئامرازی پێویستمان کەمە.

گەڕان بەدوای فۆرمە تازەکانی چیرۆکدا کە هێزی پێکەوە گرێدانیان زیاترە، سەبارەت بەو هۆشیارییەی کە ئێمە دەربارەی واقیع هەمانە، ڕۆڵی سێ لایەنەی بلاْوکردنەوە و کەڵك لێوەرگرتن و خولْقاندنەوە دەبینێت. ڕۆماننوسێك کە دژی ئەم کارەیە، لەبەرئەوەی تەقلید تێکناشکێنێ، چاوەڕێی هیچ هەوڵێکی تایبەتی لە خوێنەرەکەی ناکات، ناچاری ناکات کە بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی و گومان لەو بۆچوونانە بکات کە لە مێژە قبوڵی کردووە، بێگومان بە ئاسانی سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، بەلاْم دەبێتە شەریکە تاوانی ئەو کاڵیی و ناکامڵیە قووڵە و ئەو شەوە تاریکەی کە پەلەکوتێ تیایدا دەکەین. کاردانەوەکانی ویژدان دیسان خاوتر و بێداریشی سەختتر دەکات، ناخ بە جۆرێك دەتاسێت کە تەنانەت ئەگەر مەبەستی چاکەخوازانەشی هەبێت، کاریگەرییەکەی لە ژەهرێك زیاتر نابێت.

داهێنانی فۆرم لە ڕۆماندا، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە زۆربەی ڕەخنەگرە کورتبینەکان وێنایدەکەن، بە هیچ شێوەیەك دژی واقعگەرایی "ڕیالیزم" نییە، بەڵکو مەرجی پێویستی واقیعگەرایی پێشکەوتووە.

(3)

بەلاْم پەیوەندیی ڕۆمان لەگەڵ ئەو واقیعەدا کە دەوری داوین، تەنها پەیوەندی بەوەوە نییە کە ئەوەی ڕۆمان بۆمان باسدەکات، بەشێکی خەیاڵیی بێت لەو واقیعە، بەشێکی جیاو شایانی بەدەست هاتن کە دەشێت لە نزیکەوە لێی بکۆڵیتەوە. جیاوازیی لە نێوان ڕووداوەکانی ڕۆمان و ڕووداوەکانی ژیاندا تەنها لەوەدا نییە کە ڕووداوەکانی ژیان قابیلی لێکۆڵینەوە و بەدیهاتنن، لە کاتێکدا ڕووداوەکانی ڕۆمان تەنها لە ڕێگەی دەقێکەوە کە خولْقاندوونی قابیلی بەدەست هێنانن، بەڵکو ڕووداوەکانی ڕۆمان، بە قسەی هەمووان، زۆر

سەرنج ڕاکێشترن لە ڕووداوە واقیعییەکان. پەیدابوونی ئەو ڕووداوە خەیاڵییانە، وەڵامی پێویستیەك دەداتەوەو کاریگەرییەکی هەیە. کارەکتەرە خەیاڵییەکان بۆشاییەکانی واقیع پڕ دەکەنەوە و لە بارەی ئەو بۆشاییانەوە هۆشیاریمان پێدەبەخشن. نەك تەنها داهێنانی ڕۆمان، بەڵکو خوێندنەوەشی جۆرێکە لە خەون بینین لە بێداریدا، لەم ڕووەوە بەردەوام پێویستی بە جۆرێك لە دەروونشیکاریی هەیە بە مانای فراوانی وشەکە. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر من بمەوێ تیۆرێکی دەروونزانیی و کۆمەڵناسیی و ئاکاریی و هتد باس بکەم، زۆر جار بۆ من ئاسانترە کە نموونەیەکی دروستکراو بهێنمەوە. کارەکتەرەکانی ڕۆمان بە باشترین شێوە ئەم ڕۆڵە دەبینن و من دەتوانم ئەم کارەکتەرانە لە نێوان هاوڕێ و ئاشناکانمدا بناسم و ڕەفتاری ئەو کەسانە بە حسابکردن بۆ بەسەرهاتی کارەکتەرەکان روونبکەمەوە، هتد..

ئەم هاتنەوەیەی "هاوئاهەنگیەی" ڕۆمان لەگەڵ واقیعدا، لە ڕادەبەدەر ئاڵۆزە و "ڕیالیزمی" ئەوەو ئەو مەسەلەیەی کە ڕۆمان وەکو بەشێکی خەیاڵیی ژیانی ڕۆژانە خۆی دەنوێنێ، تەنها لایەنێکی تایبەتییە لە ڕۆمان، لایەنێك کە بواری ئەوەمان دەداتێ کە ڕۆمان وەکو ژانرێك، لە واقیع جیابکەینەوە.

من ئەو پەیوەندیانەی هەیە لە نێوان ئەوەی کە ڕۆمان بۆمان باسدەکات و ئەو واقیعەی کە تیایدا دەژین ناودەنێم "سەمبۆلیزمی ڕۆمان".

ئەم پەیوەندیانە لە هەموو ڕۆمانەکاندا وەکو یەك نین و پێموایە ئەرکی سەرەکی ڕەخنەگر ئەوەیە کەلەیەکیان جیابکاتەوە و وەها ڕوونیان بکاتەوە کە بتوانرێ هەموو ئەو فێرکردنەی کە لە بەرهەمێکی تایبەتیدا هەیە دەربهێنرێت.

بەڵام لەبەرئەوەی لە خوڵقاندنی ڕۆمان و لەو خوڵقاندنەوەیەی کە لە بە وردی خوێندنەوەیدایە، سستمێکی ئاڵۆز لە پەیوەندی دال و مەدلوولی زۆر هەمەجۆر تەجروبە دەکەین، ئەگەر ڕۆماننووس بەسووربوونەوە بیەوێت ئێمە لە ئەزموونەکەیدا بەشدار بکات، ئەگەر واقیعبینی ڕۆماننوس زۆر قووڵ بێت، ئەگەر ئەو فۆرمەی بەکاریدەهێنێت وەك پێویست سەرتاپاگیر بێت، بەناچاریی، ئەم پەیوەندییە هەمە جۆرە دەخاتە ناو بەرهەمەکەیەوە. سەمبۆلیزمی دەرەوەی رۆمان دەیەوێت لە جۆرێك سەمبولیزمی ناوەوەدا ڕەنگبداتەوە. لەم ڕووەوە چەند بەشێك لە رۆمان لە پەیوەندی لەگەڵ کۆی رۆمانەکەدا هەمان رۆڵ دەبینێت کە ئەو کۆیە لەگەڵ واقیعدا هەیەتی.

ئەو پەیوەندییە گشتییەی (ئەو واقیعەی) کە رۆمان باسیدەکات لەگەڵ ئەو واقیعەی کە دەوری داوین، خۆی لە خۆیدا دەستنیشانکەری ئەو شتەیە کە بە ناوەرۆك یان بابەتی رۆمانەکە ناودەبرێ و ئەو بابەتە وەکو وەڵامێك وایە بۆ باری تایبەتی هۆشیاریی. بەڵام بینیمان کە ئەو ناوەڕۆك یان ئەو بابەتە، لە شێوەی خستنە ڕوویدا، لەو فۆرمەدا کە بۆ دەربڕین بەکارهاتووە، قابیلی جیابوونەوە نییە. لە پێگەیەکی نوێدا، لەگەڵ هۆشیارییەکی نوێدا سەبارەت بە وەزعی ڕۆمان و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ واقیعدا هەیەتی، چەند بابەتێکی تازە گونجاون و لە ئەنجامی چەند فۆرمێکی تازە لە ئاستە جیاوازەکانی، زمان، شێواز، تەکنیك، تەرح و بینادا، بە پێچەوانەوە، گەڕان بە دوای فۆرمی تازەدا کە بابەتی نوێ دەهێننە ئاراوە، پەیوەندییەکی تازەش دەهێنێتە ئاراوە.

بەپێی بنەمای پلەیەکی تایبەتی بیرکردنەوە، ڕیالیزم و فۆرمالیزم و سەمبۆلیزم لە رۆماندا وەها خۆیان دەنوێنن کە یەکێتیەکی لە جیابوونەوە نەهاتوو پێکدەهێنن.

ڕۆمان بە سروشتی خۆی حەز دەکات و دەبێ حەز بکات کە خۆی ڕوونبکاتەوە. بەڵام چاك

دەزانین، کە چەند هەڵوێستێك هەن کە ناتوانن ڕەنگبدەنەوە و تەنها لە ئەنجامی وێناکردنێك کە لە دوای خۆیان بەجێی دەهێڵن دەمێننەوە. ئەو بەرهەمانەی کە ئەو یەکێتییە ناتوانێت لە ناوەڕۆکیاندا دەربکەوێت گیرۆدەی ئەو هەڵوێستانەن و ئەو ڕۆماننوسانەش کە نایانەوێت دەربارەی سروشتی کارەکەیان و ئەو متمانەیەی ئەو فۆرمانەی کە بەکاری دەهێنن بیر بکەنەوە. چەند فۆرمێك کە لەگەڵ ڕەنگدانەوەی تاوتوێ نەکردنیان و درۆینە بوونیان دەردەکەون، ئەو فۆرمانەی کە وێناکردنێکی واقیعمان دەدەنێ، لە ناکۆکیەکی ئاشکرادان لەگەڵ ئەو واقیعەدا کە خوڵقاندویانەو دەربارەی ئەو واقیعە بە بێدەنگی ماونەتەوە. لەم کارەدا چەند ساختەکارییەك هەیە کە ڕەخنەگر دەبێت ئاشکرایان بکات، چونکە ئەو بەرهەمانە، وێڕای ڕاکێشان و توانایان، تاریکی دەهێڵنەوە و تۆختری دەکەن، هۆشیاری بەنغرۆیی لەناو ناکۆکیەکانیدا دەهێڵنەوە و ترسەکەش لەوەدایە کە ئەم ڕەفتارە کوێرانەیە مەسەلەکە بە شوومترین بێ سەروبەریی بگەیەنێ.

لە هەموو ئەوەی کە وتمان بەو ئەنجامە دەگەین کە هەر گۆڕانێکی ڕاستەقینەی فۆرمی چیرۆك، هەر جۆرە لێکۆڵینەوەیەك لەم بوارەدا بهێنێتە ژێر بار، تەنها لە کاتێکدا دەتوانێت ئەنجام بدرێت کە لەناو گۆڕانی چەمکی ڕۆماندا بێت کە ئاسایی زۆر بەخاوی، بەلاّم لە ڕووی پێویستییەوە، بەرەو جۆرێك لە شیعری تازە و لە هەمان کاتدا حەماسی و فێرکاری دەگۆڕێت (هەموو ڕۆمانە گرنگەکانی سەدەی بیستەم شایەتی ئەم قسەیەن) هەروەها لەناو مەحاڵیی چەمکی خودی ئەدەبدا (نەك تەنها وەکو کات بەسەربردن یان موجامەلە، بەڵکوو وەکو ڕۆڵی سەرەکی ڕۆمان) و لە ناخی کاریگەریی کۆمەلاّیەتیدا و وەکو ئەزموونێکی میتۆدیانە.

## سەرچاوە:

ارغنون،
فصلنامه فلسفی، ادبی، فرهنگی
سال سوم/ شماره 9 و 10/ بهار و تابستان 1375
ص 315–320

## سەرچاوەی ئەسڵی:

ئەم وتارە بریتییە لە وەرگێڕانی یەکەم وتاری کتێبی *Essais sur le Roman*ی میشێل بوتۆر (*Michel Butor*) کە لە کۆمەڵەی *TEL* لە دەزگای چاپ و پەخشی گالیمار لە ساڵی 1992 بلاّوکراوەتەوە.

# ڕای گشتی و میدیاكان

عەبدولڕەحمان عالم

لە فارسییەوە: دلاوەر عەبدوڵلا

(خۆسێ ئۆرتێگا – Jose Ortega) وتویەتی، هەرگیز كەس نەبوە لە جیهاندا حوكمڕانێتی كردبێت (ئەگەر ئەو حوكمڕانیەی پشتی بەشتێكی وەك ڕای گشتی نەبەستبێت)، بەڵام ڕیشە و سەرچاوەی دەستەواژەی (ڕای گشتی – هزری گشتی) بە نهێنی ماوەتەوە. ڕۆمیەكان زیاتر دەستەواژەی (هاوڕایی گشتی – Consensus populi)یان بۆ چەمكی قەزایی بەكارهێناوە تا ناوەڕۆكە سیاسیەكەی خۆی. یۆنانیەكانیش بۆ هاو واتایەكی لەو جۆرەیان بەكارهێناوە. (مكیاڤیلی) لە (تێزەكاندا – گۆرەكاندا) بە پشتبەستن بە دروشمەكانی سەدەكانی ناوەڕاست (Vox populi, vox dei) دەنگی خەڵك بە (دەنگی خوا) ناو دەبات. دواتر ئەم دەستەواژەیە (ڕای گشتی) لەلایەن سیاسەتمەدارانی ئەوروپاییەوە وەك فاكتەری سنورداركردنی سیاسەتی گشتی پەسەندكراوەو بەكارهێنراوە. (ڕۆسۆ) لەسەروبەندی شۆڕشی فەرەنسادا بۆ یەكەمجار ئەم دەستەواژەیەی بەكارهێناوە. لەو قۆناغەی گەشەكردنی دیموكراسیدا ڕەفتاری سیاسی لە ژێر ڕۆشنایی بیروڕاو هزری گشتیدا پیادە كراوە. (مادریاڤەر) نوسیویێتی: (چالاكی بێكۆتای ڕای گشتی دینامیكی دیموكراسییە). لە ڕوی بیروڕای گشتیەوە لە هەلومەرجی ئێستای حكومەتە دیموكراسی و حكومەتە نادیموكراسیەكاندا جیاوازی فراوان هەیە. لە حكومەتی نادیموكراسیدا هەموو ئەو شتەی حكومەت دەیەوێت تەسلیم بوون یان ڕەزامەندی پۆزەتیڤانەی خەڵكە، بەڵام حكومەتی دیموكراسی چاوەڕوانی ئەوەی لێدەكرێت بەپێی ڕای گشتی بجوڵێتەوە.

## 1-ڕای گشتی چییە؟

بیروڕای خەڵكی لە تیۆر یان ڕوداوە جۆراوجۆرە هەستیارەكانەوە سەرهەڵدەدات (بریس) وتویەتی، كە هەندێك لە ڕوداوەكان (لە ڕوداوەكانی دی خێراتر ڕوودەدەن، چونكە لە كرۆكیدا بیروڕای زیاتر یان بەهێزتر هەیە، هەر كاتێك بیروڕایەك بە ئاشكرا بە هێزترین بیروباوەڕ

بێت به ڕای گشتی ناو دەبرێت..). کەواتە ڕای گشتی ئەو دیدەیە کە خەڵکی بەگشتی لە کاتێکی دیاریکراودا بەرامبەر بە پرسێکی وابەستەی بەرژەوەندی گشتی هەیانە.

بەڵام ئەم دەربڕینە پرسەکە چارەسەر ناکات، چونکە دەکرێت پرسیار بکرێت: خەڵکی کێن؟ بە بڕوای (سایت) هەموو ئەو کەسانەی لە کۆمەڵگەدا هەن ناتوانن کاریگەرییان لەسەر پێکهێنانی ڕای گشتی هەبێت. دەبێت کەمایەتی بەلاوەبنرێت و جگە لەچەند ئاوارتەییەکی دی، وەک پەناهەندەکان، هەموو کۆی پێگەیشتوان، بەدەر لەوەی مافی دەنگدانیان هەیە یان بە هاوڵاتی دادەنرێن دەبێت لە پێکهێنانی ڕای گشتیدا بەشدار بن[1].

(فاینەر) لەو بڕوایەدا بوە پێناسەکردنەکانی ڕای گشتی ئاماژە بۆ یەکێك لەم سێ شتە دەکات:

1–پێشبینیکردنی ڕوداوێك

2–باوەڕ

3–خواست.

ڕای گشتی وەك پێشبینیکردنی ڕوداوێك ئاماژەیە بۆ ڕاگەیاندنێکی سادە، وەك: (فلأنە ولأت بۆمبێکی تۆقێنەری ئەزمونکردوە). ڕای گشتی وەك باوەڕێك، ئاماژەیەکی ڕوت نییە وەك خاڵی یەکەم، بەڵکو هەڵسەنگاندن و پێشبینیکردنی ڕوداوەکانی ئایندەیە، وەك (لەو وڵاتەدا جەنگی ناوخۆ ڕونادات). ڕای گشتی وەك خواستێك جەخت لەسەر ڕەوتی کارێك دەکاتەوە، بۆ نمونە کاتێك پرسیار دەکرێت کە (ئایا فلأنە وڵات بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی دەبێت لەگەڵ فیسارە وڵاتدا بکەوێتە جەنگەوە یان نا؟) ئەو واتایە لەخۆ دەگرێت، کە بەدواداچونی ڕەوشی کارێك بەهای هەیە.

یەکێك لە پرسە گرنگەکانی جێ سەرنجی گشتی ئەمەیە کە زۆر ئایدیۆلۆژیاو تیۆری جیاواز هەیە و هەندێکیان ئاڵۆز، دژبەیەك و ناڕێکخراون. لێکۆڵینەوە و ڕوناکبیریەکان ئاڵۆزی و جیاوازیەکانی کەم کردۆتەوە، بەجۆرێك کە تیۆرە پەیوەندیدارەکان فۆرمێکی دیاریکراو پەیدا دەکەن – لە نێو ئەو تیۆرانەدا، ئەو تیورەیەی کە لای زۆربەی هاوڵاتیان هەیە بە ڕای گشتی ناودەبرێت. بە بڕوای (لاول) هەموو هزرێك هەڵبژاردەی نێوان دیدی جۆراوجۆرە کە دەکرێت بەشێوەیەکی لۆجیکانە وەربگیرێت. بەڵام هەندێك لەو بڕوایەدان کە ڕای گشتی دەکرێت ئەقلأنی بێت یان پشتی بە باوەڕێك بەستبێت یان لە هەست و ئەنگێزەیەکەوە سەرچاوە بگرێت.

لە نێو فاکتەرە جۆربەجۆرەکانی پێکهێنەری ڕای گشتیدا، خەڵکی بە یەکەمین فاکتەر دادەنرێت. لە نێو خەڵکیدا هەندێك ڕۆڵی گرنگتر لەوانی دی دەگێڕن کە دەکرێت بە داڕێژەرانی ڕای گشتی دابنرێن. ئەو کەسانەش وەك نوێنەرانی خەڵك لە دەسەڵاتی یاسادانان، ڕۆژنامەنوسان، بەڕێوەبەران یان سیاسەتمەدارانی پرۆفیشناڵ، بەشێوەیەکی جدی لەگەڵ پرسە گشتیەکاندا پەنجە نەرم دەکەن. دەتوانرێت بیریاران و توێژەرەوانیش بخرێتە سەر ئەو لیستە کە لە ڕوانگەی تایبەتەوە سەروکاریان لەگەڵ پرسە گشتیەکاندا هەیە. بەشێوەیەکی گشتی ئەمجۆرە کەسانە بە پیشاندانی کاردانەوە بەرامبەر سیاسەتەکان و ڕوداوەکانی ڕودەدەن، ڕای گشتی دەسازێنن و چوارچێوەی پێدەبەخشن. ئەم جۆرە تاکانە کەسانێکن مەیل و ئارەزوو یان هەستی ئەرکی سیاسی و مەدەنی ئامادەی کردون تا دەستوپەنجە لەگەڵ پرسی گشتی نەرم بکەن و هەڵبەتە بەپێی بەرژەوەندیەکان ڕەنگە جیاوازی لە نێوان هزرەکاندا بکەن: هەروەها ڕەنگە کۆمەك بە

گەشەکردنی هزرێك بکەن کە جێخواستیانە و دەیانەوێت. بەڵام زۆرینەی هەرە زۆری خەڵك بەرامبەر بە پرسە گشتییەکان بێباکن! کەمتر دەخوێننەوە تەنانەت کەمتر لەوەش بیردەکەنەوە. پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانە لەناو کۆمەڵگایەکی پشتئەستور بە ململانێ (رقابت) یان لەناو سیستەمی سەرمایەداریدا، کاتێکی ئەوتۆیان بۆ ناهێڵێتەوە تا سەرنج لە مەسەلە گشتییەکان بدەن یا بەشێوەیەکی گشتی بیرورایەکی گشتی ئامادە، لە کەسانی دیەوە وەردەگرن کە رەنگە ئەو کەسە رابەر یان دراوسێ یان کەسێکی دی بێت کە جێی سەرنجی ئەون.

ئەم گروپەی خەڵك (بریارانی سازێنەری هزر، ریفۆرمخواز یان بەرزکردنەوەی ئەو بیرو هزرانەبێت، بەڵکو تەنها قەبارەی گەورە دەکەن). بەمپێیە هزری لەمجۆرە، لە چەند کەسێکەوە سەرچاوە دەگرێت و هەندێکی زۆریش پەسەندی دەکەن و دەیکەن بە رای گشتی. بەڵام دەکرێت پرسیار بکرێت بۆچی لە جیاتی ئەم رایە رایەکی دی پەسەند دەکرێت؟ ئەم پرسیارە گرنگە، چونکە هەموو بیروراکان لە کۆمەڵگەدا پەرش و بڵاون، بە جۆرێك کە هەر کەسە و زۆرترین لیستی فراوانی هەڵبژاردنی لەبەردەستدایە. وەڵامی (سایت) بۆ ئەم پرسیارە زۆر واقیع بینانەیە. ئەو لەو بروایەدا بوە کە هەموو کەسێك ئەوە وەردەگرێت بۆ خۆی دەگونجێت، ئەو شتەش ئەوەیە کە ئەنگێزە و بەرژەوەندییە ئابورییەکانی بە باشترین شێوە تێر بکات (Ibid).

## 2-پروپاگەندە

هەمیشە ئەو بیرورا ئامادەو سازکراوە لەبەردەستدا نییە کە خەڵك دەیخوازێت، بەڵکو هزرەکان لە رێگای پروپاگەندەیەکی لێزانانەوە دەخرێتە روو. گروپی زۆری جۆراوجۆر هەن، کە بۆ سودی ئەم یان ئەو بابەت پروپاگەندە دەکەن و رەوشەکانیان هەندێکجار ئاشکراو راستەوخۆیە و هەندێکجارییش شاراوەو گومانلێکراوە. بەبروای زۆرێك ئامانجی سەرەکی پروپاگەندەکان ململانێی سیاسی نێوان گروپ و چینە کۆمەڵایەتیەکان نییە، بەڵکو بۆ دامەزراندنی یەکپارچەییە. (دوڤرژە) وتویەتی: (ئامانجی پروپاگەندە ململانێی نێوان چین و گروپە کۆمەڵایەتیە پێکهێنەرەکانی نەتەوە نییە، بەڵکو بەلایەنی کەمەوە بە رەواڵەتیش بێت باس لە یەکێتی گەل دەکات. پروپاگەندە چەکێك نییە بۆ جەنگی سیاسی یان بەلایەنی کەمەوە دەوڵەت بەو جۆرە بانگەشەی بۆ دەکات.. راگەیاندن ئامرازێکە بۆ هەماهەنگی یان نیمچە هەماهەنگی کۆمەڵایەتی)[2]. بەڵام هەر بەو جۆرەشی کە خۆی دانیپێدادەنێت لە راستیدا حکومەت بەشێوەیەکی ئاسایی لە دەستی چینێکی کۆمەڵایەتیدایەو سود لە پروپاگەندە بۆ لێدانی دەسەڵاتی چینەکانی دی وەردەگرێت. بە بروای (ڤاڵتەر لیپمن)، گرنگترین شۆرش لە سەردەمی ئێستادا ئەو شۆرشەیە کە لە ئەفراندنی رەزامەندیدا لە نێوان حکومەت کراوەکاندا روودەدات. لە ژیانی ئەو نەوە نوێیەی ئەمرۆ لە زۆر رووەوە کۆنترۆڵ کراوە، هاندان و بزواندنی هەست و سۆزەکانی بووە بە هونەرێکی هۆشیارانەو رەوشێکی باو یان بوەبە حکومەتی گشتی. پروپاگەندە ئامرازێکی کارای گەیشتنە بە خەڵك. (ئەندرێ سیگفرید) وتویەتی: (وەسوەسەکان زۆر زۆرن و چەکەکان زۆر کاران)، سەبارەت بە ئەگەری مەترسیەکانی پروپاگەندە لە ئەمریکا وتویەتی: رای گشتی چەکێکی مەترسیدارە: (شێوازەکانی رێکخستنی، فۆرمەلەکردنی و

هەڵئاوسانی تا خاڵی خرۆشان و هیستریایی هێندە باش ناسراوە و هونەرەکانی بەڕادەیەك كامڵ بوە، کە وا دەردەکەوێت بەهۆی نەرمونیانی و گونجاوی خەڵکەوە هیچ ئاستەنگێك بۆ ئاراستەکردنیان لە ئارادا نەبێت).

بەڵام دەکرێت لەگەڵ (سایت)دا هاوڕابین کە سنورداریی هەیە و ناکرێت خەڵکی بەرەو سەرو ئەو سنوردارێتیە ئاڕاستە بکرێن: (پڕوپاگەندە تەنها بۆ ماوەیەکی کورت کاریگەرە، مەگەر لەگەڵ جۆرێك لە پاشینەی ڕای گشتی یان خولیای کۆمەڵایەتی هۆمۆجین و ئاوێتە بێت، ئەگەر دژ بە پاشینە و خولیای کۆمەڵایەتی بێت سەرکەوتوو نابێت)[3]. لێرەوە ڕەنگە بەهای ئاژیتاسیۆن بۆ ماوەیەکی کورت بێت. بە گوتەی (سایت): (هەر کاتێك ئاژیتاسیۆنێك لەگەڵ ئەو خولیای کە هەیە پێچەوانە نەبێت بۆ ماوەیەك لە ڕووداوە تازەکاندا ڕەنگە هۆکاری ڕەزامەندی خەڵك بێت،.. بەڵام بەهەمان شێوەی کە ئەفلاتون و ئەرستۆ بڕوایان وابوو پێدەچێت مێژوش گەواهی دەربێت "توندڕەوی تۆوی کاردانەوە دەچێنێت"[4]. ئایا (لینکۆڵن) دروستی نەوتوە کە ناتوانرێت تاسەر هەموو خەڵك فریو بدرێت، درەنگ یان زوو حەقیقەت دەردەکەوێت: (کاتێك هیچ دەنگێك بۆ نەیاریی نوزەی نەیەت و کاتێك نەتوانرێت حەقیقەت جیابکرێتەوە، درۆکردن ئاسان دەبێت. لە کاتێکیشدا درۆکردن بە گران تەواودەبێت کە دەنگی دی بگەنە گوێ و وتەکانی دی ڕاست بکەنەوە)[5].

پڕوپاگەندە لە مەیدانی جیهانی سیاسەتیشدا بە فراوانی بەکاردێت و هەموو دەوڵەتەکان بۆ کارتێکردن لە گروپە تایبەتەکانی جێمەبەستن لە دەوڵەتانی دیدا، پەنای بۆ دەبەن. لەمڕووەوە لە نێوان بەرژەوەندی نیشتمانیی وڵاتە نەیارەکاندا سازش ناکرێت، بەڵکو ئامانجەکە دەسەبەرکردنی بەرژەوەندی ئەو وڵاتەیە پڕوپاگەندە دەکات[6].

**أ)چاپەمەنی**

ڕۆژنامە بە تایبەتی و چاپەمەنی بە گشتی لە پێکهێنانی ڕای گشتیدا زۆر کاریگەرن. بۆ دەرخستنی گرنگی سیاسیانەی چاپەمەنی ناوی (دەسەڵاتی چوارەم – دیموکراسی) یان لێناوە[7]. (لیپمن) ڕۆژنامەی بە (کتێبی پیرۆزی دیموکراسی) ناوبردووە. ڕۆژنامە سەرچاوەیەکە خەڵکی بەهۆیەوە بەڕاستیەکان دەگەن. ڕۆژنامەکان بەشێوازی ڕەنگدانەوەی هەواڵەکان، یان ئەو دەستکاریەی کە تیایدا دەکەن، و بە وتوێژ لە بارەی ڕوداو و سیاسەتی گروپە سیاسیە جیاوازەکان، لە هەوڵی ئەوەدان کار لە ڕای گشتی بکەن. خوێنەری ئاسایی ڕۆژنامە، کە زانیاری پسپۆڕانەی زانستیانە نییە و لە کاتی بەتاڵیدا بەردەوام ڕۆژنامە دەخوێنێتەوە مەیلی بەلای پەسەندکردنی تیۆر و ئەو پەردەپۆشکردنانەدا دەچێت (لا 369)، کە بۆ مەبەستێك سازکراون. شێوازی هونەریانەی پێدانی هەواڵیش بڵاوبونەوەی جۆرێك لە ڕۆشنبیریی واقیعی لە نێو خەڵکدا فەراهەم دەکات. هەندێك سیستمی هەواڵدەری هەوڵدەدەن خەڵك لە جیهانێکی داخراوو لەسەر ئاستێکی هزری زۆر نزم بهێڵنەوە. ئامانجی ئەو سیستمانە ئەوەیە خەڵك بە (نەزانی) بهێڵنەوە. لەو جۆرە سیستمانەدا بەهۆی ڕاگەیاندنی گشتییەوە، هەوڵدەدرێت خەڵکی لە ژینگەیەکی ناواقیعی، دروستکراو، سەرنجڕاکێش و پوچدا بمێننەوە و لەو ڕێگایەوە لە پرسە واقیعیە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگە بەدوربن. بەڵام ئەگەر سیستمی هەواڵدەری لە قەیدو بەندی ڕاگەیاندن و بەرژەوەند پەرستی ئازاد بێت، دەتوانێت چالاکی پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییەکی مرۆڤدۆستانە وازی

بکات و شوێنەواری بە (نەزانکردن)ی هەندێك سیستمی هەواڵدەری بسڕێتەوە.

ڕۆژنامە لە دەوڵەتی دیموکراسی نوێدا هێزێکی سەرشۆڕهێنەرە. بە وتەی (دڤورژە): (سەرهەڵدانی چاپەمەنی لە سەدەی ڕابردودا (سەدەی نۆزدە –و) بەشدارییەکی گەورەی لە گەشەکردنی دیموکراسیدا هەبوە). ڕۆژنامەکان ئەو توانایە بە دەوڵەت دەبەخشێت درێژە بە پەیوەندیکردنی بە خەڵکەوە بدات و پێشنیاز و ڕەخنەکان بۆ چاککردنی کاروبارەکان بخاتە ڕوو. ڕۆژنامەکان تەنها سکالآکان تێناپەڕێنن، بەڵکو هەوڵدەدەن ببنە ڕەنگدەرەوەی هەست و دیدەکانی خەڵك بەو جۆرەی تێیدەگەن. بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆڵی گرنگیان لە فۆرمۆلەبونی ڕای گشتی دەبێت هەوڵبدرێت ئەو ئامرازی ڕاگەیاندن و میدیایانە نەکەونە ژێر چنگی خەڵکی خاوەن بەرژەوەندی بە گشتی ئەو دیدە کۆدەنگی لەسەرە کە چاپەمەنی ئازاد و بێلایەن بۆ سەرکەوتنی حکومەتی دیموکراسی پێویستە. لە هەمووی گرنگتر دەبێت هەواڵەکان دروست بخرێنە ڕوو تا ئەو توانایە بە هاوڵآتیان ببەخشێت دادوەرییەکی دروست و تەندروست بکەن. بەڵآم بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هیچ ڕێگەیەك پێناسە نەکراوە.

چاپەمەنیەکان لەبەرئەوەی وابەستەی تیۆر و بەرژەوەندی هەواڵنێران، دوچاری ڕەخنە لێگرتن بون. هەروەها بەهۆی پەنابردنی بۆ ئاسان خرۆشاندنی خوێنەرەکانی، بە لەبەرچاوگرتنی ژمارە زۆری ئەو خوێنەرانە، لەوانەیە بکەونە سەرزەنشت کردن. بەڵآم لە ڕوانگەی (سایت)ەوە ئەم ڕەخنەلێگرتنە ڕەوا نییە: (خاوەنی ڕۆژنامە دەبێت وەك کاندیدی پلەیەکی سیاسی هونەرەکانی شەیداکردنی کۆمەڵ بەکاربهێنێت. ڕۆژنامەنوسی و سیاسەت ڕەنگدەرەوەی میزاجی گشتیە. ڕۆژنامە ئەو شتە بە خوێنەران دەبەخشێت کە خواستیانە و مافی ئەوەیان هەیە بیزانن)[8]. خەڵکی ئاسایی توانای تێوەگلانیان لەگەڵ پرسە ئاڵۆزەکانی حکومەتدا نییە. (لیمپن) و (نۆرمان ئەنجل)یش لەو باوەڕەدابون هەموو ئەو شتەی خەڵکی دەتوانن و دەبێت ئەنجامی بدەن ئەوەیە کە تەنها دەرئەنجامی کۆتایی پەسەند بکەن. لەلایەکی دیەوە بەشێوەیەکی گشتی چینی سەرمایەدار خاوەنی چاپەمەنیە و ڕێنوێنی دەکات و هەر لەبەر ئەمەش وتوێژگەلێکی زۆر لە بارەی قازانجی سەرمایەداران و لە ڕاستیدا سیستەمی سەرمایەداری لە چاپەمەنی بەشێوەیەکی گشتی و سیستەمی هەواڵدەرییە تایبەتی دەکرێت.

بۆ نمونە (مۆریس دڤورژە) لەو بارەیەوە وتویەتی: (سیستمی هەواڵدەری سەرمایەداری دەیەوێت هاوڵآتیان لە باری ئاساییدا کە پێویستە بێدار و وریابن، سست و خەواڵوو بکات و کاتێکیش، کە خرۆشاو پەشۆکاون و پێویستە ئارامیان بکاتەوە، دەیانبزوێنێت..)[9]. (کوری) لەو باوەڕەدابوە: (پەیوەندی بازرگانی و دیموکراسی لەلایەن چاپەمەنیەوە هەڕەشەیەکی جدییە بۆ دیموکراسیەت) (فاینەر) نوسیویێتی: (ڕادەی کۆنکرێتی هەواڵی دروست و هزری یەکسان بەگشتی کەمە و چاپەمەنی زیاتر بەهۆی گەورەکردن و کەمتر بەهۆی ڕیفۆرمی کەموکوڕییەکانیەوە دەسەڵآتێکی نائاساییان بەدەستهێناوە)[10]، بەڵآم ئەگەر خەڵکی باش پەروەردە بکرێن و ڕۆشنبیر بن باشیان لە خراپ پێباشترە.

### ب) کۆبونەوەی گشتی

کۆبونەوە گشتیەکان بۆ ڕابەرەکان هەلێکی گونجاون تا پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵك ببەستن. سازدانی ئەمجۆرە کۆبونەوانە بۆ ئەو

ولاَتانەی کە بەشی زۆری دانیشتوانەکەی نەخوێندەوارن یان هێشتا خوێندەوارەکانی خوێندنەوەی ڕۆژنامە نەبۆتە نەریت لەلایان و هێشتا ئاماژە بۆ گۆڤار و نوسراو ناکرێت، ئەمجۆرە کۆبونەوانە گرنگن. ئەمجۆرە گردبونەوانە یاریدەدەرێکی گەورەیە بۆ دەسڕاگەیشتن بە خەڵك و ئەرکی پەروەردەکردنی سیاسیانەیانە. بۆ کاریگەریی دانان لەسەر ڕای گشتی سود لە شێوازی زمان وەردەگیرێت. ڕابەرانی وتاربێژ سەبارەت بە پرسە سیاسییە ژیانیەکان ڕای گشتی دەبزوێنن. بەڵام بۆ ئەوەی ئەمجۆرە کۆبونەوە گشتیانە بینە فاکتەری پێکهێنانی ڕای گشتی کاریگەر، دەبێت ئازادییە مەدەنییەکانی وەك ئازادی کۆڕ و کۆبونەوەو ڕاگەیاندن بۆ خەڵکی دەسەبەر بکرێت.

**پ) پارتی سیاسی:**

پێشتر بەشێوەیەکی دوورو درێژ باسی ڕۆڵی پارتی سیاسی لە ژیانی سیاسی و پێکهێنانی ڕای گشتیدا کرد. پارتەکان لە پێناوی پاراستنی هزر و سیاسەتە تایبەتەکاندا پێکهاتون. بەشێك لە ئەرکەکانیان بریتییە لەوەی سەبارەت بە پرسە جۆراوجۆرەکان، بیروڕا دەربڕن و لایەنگران بۆ دیدەکانیان دروست بکەن. دەبێت لایەنگرانیش بڕوایان بە دروستی هەڵوێستی حیزبی لە بارەی پرسە جۆراو جۆرەکان هەبێت.

**ت)دەسەڵاتی یاسادانان – پارلەمان:**

دەسەڵاتی یاسادانان بە ئاوێنە و قاڵبی ڕای گشتی وەسفکراوە. لێکۆڵینەوەی گەرموگوڕ دەربارەی سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی وڵات، توێژینەوە لە کاتی دانیشتنەکان بۆ دەنگدان لەسەر بودجە، هەڵپەساردنی کاتیانەی دانیشتنەکانی ئەنجومەن، ڕەخنەگرتن و نەبەخشینی متمانە لەڕێگا بەرچاوەکانن بۆ کاریگەری دانان لەسەر ڕای گشتی خەڵك و ئەو توانستەیان پێدەدەن تا لە بارەی پرسەگرنگە زیندوەکانەوە فۆرمەلەی بیروڕا بکەن.

**ج)دامەزراوەی پەروەردەیی:**

دامەزراوە پەروەردەییەکانی وەك قوتابخانە، زانکۆ، دامەزراوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەش کاریگەری ڕاستەوخۆیان بەسەر ڕای گشتیەوە هەیە. لە ڕاستیدا ئەم دامەزراوە پەروەردەیی و توێژینەوانە ئامادەکاری هاولاَتیانی ئایندەن. لە قۆناغی فۆرمگیریشدا هۆشیارییە مەدەنیەکانیان تێدا گەشە پێدەدرێت. لە ماوەی ئەو قۆناغەدا جیهانبینی تایبەتیان تێدا پەروەردە دەکرێت و دواجار وەك هاولاَتی هۆشیار و خاوەن دیدی سەربەخۆ و هزری پەیوەست بەخودەوە، گەورە دەبن.

**چ)ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و سینەما:**

ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و سینەما میدیای کۆپەیوەندین و بەهۆیانەوە کاریگەری زۆر دەخرێتە سەر خەڵك. ئەوەی ڕۆژنامە دەینوسێت ئامرازە بێسیمەکان بەشێوەیەکی زارەکی بەخەڵکی دەگەیەنن. لە ڕێگەی پەخشکردنی هەواڵ و تیۆرەکانەوە خەڵکی نەخوێندەواریش ئاگادار دەکرێنەوە و لەوەی لە ناو وڵات و جیهاندا ڕوودەدات بە ئاگا دەبن. لە ڕاستیدا تەلەفزیۆن و ڕادیۆ پەیوەندییەکی ژیاو لە نێوان خەڵك و حکومەتدا دروست دەکەن. (کوری) نوسیوێتی: (هەندێك لە چاودێران تا ئەو ڕادەیە دور ڕۆشتون کە ڕایانگەیاندووە، ڕادیۆ دوبارە ئەو پەیوەندییە ڕاستەوخۆیەی لە نێوان ڕابەرانی سیاسی و لایەنگرانیان بەرقەراركردووە، کە ئاماژەی دیاری دیموکراسی یۆنان بوو). (دڤورژە)ش نوسیوێتی: (ئەمڕۆ میدیا بیستراوەکان (ڕادیۆ) و بینراوەکان

(تەلەفزیۆن، سینەما و هەفتانەی وێنەدار) بە هەمان ئەندازەی چاپەمەنی نوسراو کاریگەرن: ئەوانەش بەشێکن لە دەسەلاتی چوارەم. وا بلاوە کە ڕێگاکانی گەیاندنی هەواڵ و بیروڕاکان، کە دەرئەنجامی شێوەی هونەریی نوێیە، بە (ئامرازی هەواڵی گشتگیر) ناوزەدکراوە، چەکێکی سیاسی زۆر کاریگەر پێکدەهێنن)[12].

بەلام گوتراوە کە نابێت ڕادیۆ چەکی پڕوپاگەندەی حکومەت بێت: (ئاساییە لە حکومەتە ستەمکارەکاندا ئامرازەکانی هەواڵی گشتگیریی) لە ژێر چنگی دەوڵەتدایە. ئەم ئامرازانە ڕاگەیەنراوەکانی دەوڵەت پەخش دەکەن، ڕاگەیاندنێکی لەگەڵ پۆلیسدا بە بنەمای بنچینەیی دەسەلات دادەنرێت. ئامانجی ئەو پڕوپاگەندانەش گردکردنەوەی کۆ دەنگی هاولاتیانە بۆ حکومەت)[13].

**ح)کارەکانی دی:**

ئەنجومەنە جۆربەجۆرەکان و گروپە دەسەلاتدارەکانیش هەوڵدەدەن کاریگەربن و ڕای گشتی بەپێی خواستی خۆیان لە قالب بدەن.

**خ)ئاستەنگەکانی بەردەم دروستبونی ڕای تەندروست:**

ئەو شتەی دەبێتە ڕێگری بەردەم کارکردنێکی سەرکەوتوانەی دیموکراسی دەشبێتە ئاستەنگی بەردەم دروستبونی ڕای گشتی تەندروست، بەلام دەکرێت ئاماژەش بۆ هەندێك فاکتەری گرنگ بکرێت: ئەو بلاوکراوانەی هیچ پەروای چاکە و خراپە نین یان دەغەلکارن، ئەو بەرپرسانەی زانیاری درۆ دەدەن، محافیزەکاری وەهم پەرستی و مەزهەبی، جیهانبینی دەستەگەر و گروپچی و نەبونی ئازادی مەدەنی، نەبونی پەروەردە، پێنەگەیشتویی سیاسی و جیهانبینی هاوسەنگ و بێهودەیی سیاسی. ڕێگەی دروستبونی ڕای گشتی تەندروست ئەوەیە هەوڵ بۆ لەناوبردنی فاکتەرەکانی زیانگەیاندن بە ڕای گشتی بدرێت.

**د) چۆنیەتی دیاریکردنی ڕای گشتی:**

بە بڕوای (بریس) بۆ ناسینی ڕای گشتی چاپەمەنیەکان ڕێنیشاندەری باش نین، چونکە هەڵسوڕانی کارەکەی وەك پێویست ئاماژە نییە بۆ پەسەندکردنی دیدەکانی. کۆبونەوە گشتیەکانیش ئاماژەی باش نین، چونکە لە سەنتەرە قەرەباڵغەکاندا هەموو گروپێکی پڕ وزە دەتوانێت گوێگری زۆر کۆ بکاتەوە. بە بڕوای ئەو باشترین ڕێگەچارەی ئازادانە لە نێو خەڵکدا وەرگرتنی دید و بۆچونیانە سەبارەت بە پرسە گشتیەکان. بە بڕوای (بریس) بیروڕای زۆرینە ڕای گشتی نییە، هەروەها بیروڕای گروپێك یان ناوچەیەکیش بە هەمان شێوە ناکرێت بە ڕای گشتی ناوببرێت. بۆ ئەوەی ببێتە ڕای گشتی پێویستە پەی بە ئەقڵ و لۆژیکی ئامانجی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە ببرێت. لێرەوە (بریس) وەك ئیرادەی گشتی، (ڕۆسۆ) ڕای گشتی بە لێڵ و ئاڵۆز دەکات و دواجار بۆ هەموو مەبەستێکی پراکتیکی بە بێسودی دادەنێت.

بەهۆی برەودان بەشێوازی ئامار لە ئەندازەگیری ڕاگشتیدا ڕەوشی نمونە هێنانەوەی سەرتاسەری برەوی پەیداکرد. ئاشکرایە بەهای ڕیفراندۆمی لەو جۆرە وابەستەی ڕەوشی نمونە گیری، فۆرمی پرسیار، هەلومەرج و بارودۆخ و هەروەها ڕەوتی ئەنجامی چاوپێکەوتنەکەیە. ناکامبونی هەندێك دامەزراوەی گەورەی ڕیفراندۆم لە پێشبینی کردنی ئەنجامی هەڵبژاردنی (ترومن) لە (1948) بۆ سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا، خستنیە بەر ڕەخنەی توند و بوە هۆی لاوازی و دواکەوتنیان. ئەم ڕەوشانە لە باری چاکبون و کامڵبوندا تا

زانیاری متمانەدارتر سەبارەت بە ڕای گشتی بەدەسبهێنن.

پێشئەوەی بتوانرێت ڕای گشتی لە ڕوی سیاسییەوە حسابی بۆ بکرێت دەبێت دەستڕۆیشتویی خۆی ئاشکرا بکات. ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە ڕای گشتی لە هەمبەر زۆر پرسی سیاسی گشتیدا دابەش و پەرشوبلاوە، بیروڕای جیاواز ئەو واقیعەیە کە دەبێت لەبەرچاو بگیرێت. ڕووبەڕوو بونەوەی هزری یان مشتومڕ، مەیدانەکانی هاوڕابون یان نەبون و فەرامۆشی ئاشکرا دەکات، ئەوەش بەرپرسیارێتی بونیادی دیموکراسییە کە بۆ بەدەستهێنانی کۆ دەنگی یان دروستکردنی هاوسەنگی لە نێوان بیروڕا جیاوازەکان و بەرژەوەندیەکاندا بەشێوازێکی وا کاربکەن، کەلایەنی زۆریی ڕەزامەندی خەڵك دەستەبەر بکەن.

## دەوڵەتی خۆشگوزەران

چەمکی دەوڵەت وەك کارگوزارێکی خۆشگوزەرانیی مرۆڤ یادگارێکی دێرینە. (ئەرستۆ) وتویەتی: (دەوڵەت لە پێناوی ژیاندا دێتە ئاراوەو لە پێناوی ژیانێکی باشتردا درێژەی دەبێت). لە دیدی هەندێك لە بیریارانی ئەخلاقیشەوە دەبێت دەوڵەت بە بێوەستان درێژە بە ڕەفتاری باش بدات، کۆنترۆڵ و ریفۆرمی ئەخلاقیانەی مرۆڤ بکات و خاك و ئاو بۆ مرۆڤ ساز بکات و بۆ ژیان بیگونجێنێت. هەر لە کۆنەوە دەوڵەت وەك بونیادێك و ڕێنماییەکی ئەخلاقی و لە قاڵبدەری ژیانی ئەخلاقی تاك سەیر کراوەو لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی جۆری مرۆڤ لە دارمانی جەستەیی و ئازاری ڕۆحی ڕۆڵی گرنگ و سەرەکی گێڕاوە. دەوڵەت بەهۆی پەرەپێدانی بە پەروەردە لە ڕوی پەروەردەکردنی هێزی زهنی ڕۆڵێکی زیندووی گێڕاوە، عەداڵەتی کۆمەڵایەتی دەسەبەرکردووە و بەختیاریی لە نێوان هاوڵاتیاندا زیاتر کردووە.

ئەرکەکانی دەوڵەت یان حکومەت پلە بە پلە زۆرتر بوە. لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا حکومەت پۆلیسێك بوو. تاکگەرایی تاڕادەی کامڵبون هەبوە و ڕێگر بوە حکومەت یان دەوڵەت کەمترین بەشداری لە کارەکاندا بکات. (جان ئیستوارت میل) نوسیوێتی: (پێویستە ڕێگە لە خراپی زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت بگیرێت. هەر کارێکی نوێش بۆ کارەکانی دەوڵەت زیاد بکەین دەبێتە هۆی زیادبونی کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر خواست و ئومێدەکانی خەڵك و بە تێپەڕبونی کات تاکی چالاك و بەهیمەت بۆ کەسانێك دەگۆڕێت کە پشت بە دەوڵەت ببەستن و ببنە نانخۆری یان پشت بە پارتێك ببەستن، کە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێت دەسەڵاتی دەوڵەت بەدەستەوە بگرێت)(14). بەڵام زۆر درێژەی نەکێشا کە دیدەکان بۆ دەوڵەت یان حکومەت گۆڕانی بەسەردا هات. لە سەدەی بیستەمدا حکومەت بۆ جۆرێك هاوکاری خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی گۆڕاو ئیدی تەنها وەك پۆلیسێك ئەژمار نەدەکرا. ڕۆڵی مامۆستا، پەرستار بەڕێوەبەر و گەورە پیشەکارانی لە خۆ گرت. لە ئەستۆگرتنی ئەم ئەرکانە بوە هۆی هەڵاتنی سەردەمی سۆشیالیزم. ئەو دەوڵەتانەی کە سۆشیالیزمیان هەڵنەبژارد بوو، بیرۆکەی خۆشگوزەرانیان گەلاڵە دەکرد. لەم ڕێگەیەوە چەمکی دەوڵەتی خۆشگوزەران هاتە ئاراوە و چەمکی دەوڵەتی تاکگەرای مەحکوم کرد، کە ئامانجی پاراستن بوو، نەك پێشکەوتن. هەروەها چەمکی دەوڵەتی کۆمۆنیستیشی ڕەتکردەوە کە تیایدا خۆشگوزەرانی بە لەدەستدانی هەموو

ئازادییە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ دەهاتە دی. چەمکی دەوڵەتی خۆشگوزەران دەستی لە ناسایستەییە سەرەکیەکانی هەردوکیان داشۆری و لە هەمان کاتیشدا بوە خاوەنی چاکە و باشەکانیان. بەمجۆرە نمونەیەکی بالاّ لە دەوڵەتی نویّ خرایە ڕوو، کە چاکە و باشیەکانی دیموکراسی و سۆشیالیزمی لەخۆ دەگرت. (هابمن) دەوڵەتی خۆشگوزەران بە دەرئەنجامی: (پێگەیشتنی تاکگەرایی سەدەی نۆزدە بە سۆشیالیزمی سەدەی بیستەم) وەسف کردووە. (گوپتا)ی توێژەرەوەی هندستان نوسیویێتی: (چیرۆکی پەرەسەندنی ئەرکەکانی دەوڵەت لە کارگوزارێکی یاسا و سیستمەوە بۆ کارگوزارێکی خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی چیرۆکی بە واقیعی بونی کەسێتی مرۆڤە)[15]. بیریارانی ئینگلیزی لەو باوەڕەدان کە بیرۆکەی دەوڵەتی خۆشگوزەران سەرەتا لە ئینگلتەراوە سەری هەڵداوە. (هابمن) وتویەتی: (ئەوە هەڵەیە گەر وا وێنا بکرێت کە چەمکی دەوڵەتی خۆشگوزەران وەك خوانێکی ئامادە لە ئاسمانەوە بۆ هزری خەڵکی چاو لە ڕێگا دابەزیبێت. دەوڵەتی خۆشگوزەران بەری ڕەنجی پەیوەندی ئارەزوی سیاسی بەریتانیا و گەشەکردنی پلە بە پلەی ئەو درەختەبوە کە چوار سەدە و نیو لەوەو بەر (شۆڕشی شکۆمەندی 1688) نێژرابوو)[16].

### 1-دەوڵەتی خۆشگوزەران چییە؟

بیرۆکەی دەوڵەتی خۆشگوزەران ئەمەیە کە قورسایی پایەی سەرەکی دەوڵەتی خۆشگوزەران تاکە و دەوڵەتی خۆشگوزەران لە پێناوی گەشەپێدانی هارمۆنی ئەودا گەلاّڵەکراوە. بەمپێیە ئامانجی دەوڵەتی خۆشگوزەران دەسەبەرکردنی ڕادەی بەرزی پێشکەوتن و خۆشیی تاکە. هەموو چالاکیەکانی بە خۆشگوزەرانی گشتییەوە بەندە. (کول) نوسیویێتی: (دەوڵەتی خۆشگوزەران کۆمەڵگەیەکە بەلایەنی کەمەوە ئاستی ژیان و هەل تیایدا ڕەخساوە و لە پشکی هەموو هاولاّتیاندایە). (ئارتۆر شلزنیگ) بەمجۆرە پێناسەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی کردووە: (سیستمێکە حکومەت بەڵێن دەدات ئاستی دیاریکراوی کار، دەرامەت، پەروەردە، کۆمەکی تەندروستی و دابینکردنی کۆمەلاّیەتی و نیشتەجێبون بۆ هەموو هاولاّتیانی دەسەبەر بکات)[17]. بە بڕوای (هێربرت لەهمەن): (دەوڵەتی خۆشگوزەران دەوڵەتێکە خەڵکی ئازادن توانا تاکایەتیەکانی خۆیان پەروەردە بکەن و لە بەرامبەر ڕەنجەکانیاندا پاداشتێکی ڕەوا وەرگرن و بەدوی خۆشبەختی و بەختیارییەوە بن بێئەوەی ترس لە برسێتی، بێلانەیی یان ستەمکاریی بەهۆی نەژاد و بیروباوەڕو ڕەنگەوە ڕێگریان بێت)[18]. بە گوتەی (کانت): دەوڵەتی خۆشگوزەران ئەو دەوڵەتەیە ڕشتەیەکی بەرفراوانی خزمەتگوزاری پێشکەش بە هاولاّتیانی بکات). بە بڕوای (ئابراهام): (دەوڵەتی خۆشگوزەران کۆمەڵگەیەکە دەسەلاّتی دەوڵەت بۆ هاوسەنگ کردنی کارکردنی ئاساییانەی هێزی ئابوریی بەشێوەیەکی هەڵسەنگێنراو بەرکار دەخرێت تا دابەشکردنێکی باشتری دەرامەت، لانی کەمی بنچینەیی، بە چاوپۆشی لە بەهای بازاڕی کار و دارایی بۆ هەموو هاولاّتیان بەدەست بێت)[19].

(مارشاڵ) تاکگەرایی زۆر و گشتگەرایی بە تایبەتمەندی بنەڕەتیانەی دەوڵەتی خۆشگوزەران دادەنێت. تاکگەریی ئاماژە بۆ مافی رەهای تاك بۆ گەیشتن بە خۆشگوزەرانی دەکات ئاماژە بۆ تاکگەرایی دەکات و گشتگەرایش دەهاویژێتە ئەستۆی دەوڵەت تا هەموو کۆمەڵگە، کە مومکینە لە

کۆی خواستەکانی تاك باڵاتر بێت، بەرەو پێش ببات و بیپارێزێت[20].

(پیت تیۆنس – Piet thoenes) لەو بـاوەڕەدا بوە دەوڵەتی خۆشگوزەران فۆرمێکی نوێی کۆمەڵگەیەکە جیاوازی لەگەڵ دەوڵەتی لیبرالی، کە پێش ئەوبوەو دەوڵەتی سۆشیالیستی، کە نەیاری بوە، هەیە. دەتوانرێت تا ڕادەیەك بەهۆی تایبەتمەندێتی دیموکراسی و تاڕادەیەك بەهۆی ئەو کەمە جەختکردنەی بۆ گشتگەرایی هەیەتی لە خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی فۆرمەکانی کۆمۆنیستی و فاشیزم جودا بکرێتەوە. بە واتایەکی دی (تیۆس) وەك (مارشاڵ) دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بە تێکەڵە یەك لەنیوە سۆشیالیستی و نیوە لیبرالیزم داناوە.

ڕاڤەکردنی ئەو پێناسانەی سەرەوە ئەوە پیشاندەدات کە دەوڵەتی خۆشگوزەران ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەی هەیە:

1–لە دەوڵەتی خۆشگوزەراندا تاك شوێنگەیەکی محوەری هەیە،

2–لایەنیکەم ژیان و دەرفەت بۆ هاولاّتیان دەسەبەر دەکات، بەبێ گوێدان بە نەژاد، بیروباوەڕ یان ڕەنگ.

3–دەسەبەری خزمەتگوزاری بەرفراوان و هەمەچەشنە بۆ هاولاّتیان دەکات.

4–دەسەبەری دابەشکردنێکی عادلانەی دەرامەت بۆ هاولاّتیان دەکات.

لەم سەدەیەدا دەوڵەتی خۆشگوزەران لایەنگرییەکی زۆری هەیە. هەندێك لە دیموکراسییە دواکەوتوەکان و ئەوانەشی لە باری گەشەکردندا دەستیان داوەتە بیرۆکەی دەوڵەتی خۆشگوزەران. لەبەرئەوەیە (ئارنۆڵد توینبی) مێژوونوسی هاوچەرخ پێشبینی کردووە: (لە ئێستاوە بۆ سێ سەدەی داهاتوو سەدەی بیستەم لە یادا دەمێنێتەوە، ئەوەش نەك بە هۆی جەنگەکان، تۆقێن و تاوانەکانیەوە، بەڵکو بەهۆی ئەو واقیعەی کە یەکەمین خولی مێژوە مرۆڤ بوێریی ئەوەیان کردوە بیر لەوە بکەنەوە ئەگەر هەیە هەموو نەژادەکانی مرۆڤ لەو شارستانیەتەی کە هەیە، سودمەندبن).

## 2–ئەرکەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەران.

دەوڵەتی خۆشگوزەران تەنها کارو ئەرکی پاراستنی یان پۆلیسیانە هەڵناسوڕێنێت، بەڵکو جەخت لەسەر کارو ئەرکی خۆشگوزەرانیانەش دەکاتەوە. دەوڵەت یان حکومەتی خۆشگوزەران تەنها وەك پۆلیس ناجوڵێتەوە، بەڵکو وەك فیزیکزان، ئەندازیارو مامۆستاش خزمەتگوزاری پێشکەش دەکات. هەروەك ئامازەی بۆ کرا لێکۆڵینەوەکان دەوڵەتی خۆشگوزەرانیان بە پێگەیشتنی بنەڕەتیانەی نێوان تاکگەرایی سەدەی نۆزدەو سۆشیالیزمی سەدەی بیستەم وەسف کردوە.

**أ–ئەرکەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەران:**

***1–ئەرکی پاراستن:***

أ–پاراستنی حوکمڕانیی لە بەرامبەر ئاژاوە ناوخۆیی و دەرەکیەکان،

ب–دارشتنی یاسایەك لە پێناوی پاراستنی دەسەلاّت و پەرەدان بە ملکەچی و فەراهەمکردنی هەلومەرجی ئاسایشی تەواو،

پ–پاراستنی بونیادەکانی وەك خێزان و خاوەندارێتی،

ت–ڕێکخستنی پەیوەندیو بارکردنو گواستنەوە، دروستکردنی بینا و ڕێگاکان، ئەنجامدانی کاریپۆستەوگەیاندن بەباشترین شێوە.

ح–ڕێکخستنی کاروباری بازاڕەکان و بەدواداچون لە باری کێش و ئەندازەکان،

ج-پاراستنی پەیوەندییە دیپلۆماسیەکان لەگەڵ وڵاتانی دی،

چ-گردکردنەوەی دارایی و سزادانی ئەوانەی خۆیان لە باجدان دەدزنەوە.

***2-ئەرکەکانی خۆشگوزەرانی.***

دەوڵەتی نوێی خۆشگوزەران خۆی تەنها بە گردکەرەوەی باج یان پۆلیس نابینێت، بەڵکو برەو بە خۆشگوزەرانیش دەدات. (رایسۆن) سەبارەت بە ئەرکەکانی خۆشگوزەرانی نوسیویێتی: (لە نێو هەموو خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیەکاندا خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی فراوانترین پانتایی داگیر کردووە، چونکە تارادەیەك هەموو تاکەکان، هەر لەبێوەژنانەوە بگرە تا منالانی مەحروم، بەتەمەنانی بێتوانا، ژنانی تەڵاقدراوی خاوەن منال، زیندانیانی پێشوی بێکار، کەسانی نەخۆشی جەستەیی و سایکۆلۆژی، کۆچبەرانی بێنیشتمان و خێزانی گرفتاوی، لەخۆدەگرێت)[21].

لە هەلومەرجی لەو بابەتەدا دەوڵەتی خۆشگوزەران ئەم ئەرکانە ڕادەپەڕێنێت:

أ-گەشەپێدانی کەسێتی تاك. هەروەك وترا دەوڵەتی خۆشگوزەران هەوڵ دەدات گەشەیەکی هارمۆنی بە کەسێتی تاك بدات. ئەم دەوڵەتە یان حکومەتە هەموو تاکەکان بەیەکچاو سەیر دەکات و دەرفەتی گونجاو بۆ خەڵك دەسەبەر دەکات. هیچ ئاستەنگێکی دروستکراو لەبەردەم گەشەکردنیان بەرەوا دانانرێت و ئاوڕێکی تایبەت لە بەشە هەژارەکەی خەڵکی دەدرێتەوە.

ب-سەرەڕای هەموو ئەوانەش هەموان خاوەنی ئازادی بنەڕەتین، واتە ئازادی بیرکردنەوە، ئازادی ڕاگەیاندن، ئازادی بیروڕا و هاوشێوەکانیان و ئازادی کۆمەڵایەتیان هەبێت بۆ گەیشتنە ئامانج و مەبەستە هاوبەشەکانیان. ئەم سودمەندبونە لە ئازادییە بنەڕەتیەکان ئەو توانستە بە مرۆڤ دەبەخشێت هێزی داوەریکردنی خۆی لە پێناوی چاکەی گشتیدا بخاتە کار.

دەکرێت بە کورتی ئەرکەکانی خۆشگوزەرانی دەوڵەت بەمجۆرە ڕون بکرێتەوە:

1-چاککردنی باری تەندروستی. دەوڵەت لە پێناوی دەسەبەرکردنی تەندروستی بۆ خەڵك هەنگاوی پێشوەختانە و خۆپارێزیی دەنێت. بە ئاشکرا ئەوە دیارە کە تاکی بەهێز و تەندروست دەتوانن وڵات گەورە و بەهێز بکەن. لەبەرئەوە وەزیرانی تەندروستی هەوڵی چڕوپڕ دەبێت بدەن تا ڕێگری لە نەخۆشییە پەتاییەکان و بڵاوبونەوەی بکەن یان لە باری هەبوندا ڕووبەڕوی ببنەوە. لە پێناوی کۆتاییهێنان بە چەوساندنەوەی کرێکاران و چاکترکردنی هەلومەرجی گشتی شوێنگەی کاریان یاسای سەعاتی کارکرد و هەموارکردن دابڕێژرێت. بۆ نموونە، کارکردنی مێردمنالانی خوار چواردەساڵ لە کارخانە و مانیفاکتۆرە مەترسیدارەکاندا قەدەغە بکرێت.

2-پەرەپێدانی پەروەردە و فێرکاریی. دەوڵەتی خۆشگوزەران هەوڵدەدات پەروەردە و فێرکردن بۆ هەموان فەراهەم بکات. لە دەوڵەتی لەمجۆرەدا فێرکاری تایبەت بە خێزانی دەوڵەمەند نییە، بەلایەنی کەمەوە هەموان لە خوێندنی سەرەتایی سودمەندن و خوێندنی باڵاش بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە توانای هزریان هەیە. بەرنامەی پێدانی کۆمەك بۆ خوێندن پیادە دەکرێت تا تاکە شایستەکان درێژە بە خوێندن بدەن. ئەوە تەواو سەلمێنراوە کە بەبێ پەروەردە و فێرکاری تاکەکان بەدواکەوتویی و نەزانی دەمێننەوە و کەسایەتی تاك گەشە ناکات. لەمڕووەوە دەوڵەتی خۆشگوزەران بڕیار بۆ سیستمی پەروەردە و

فێرکاریی دەدات، سەرەتایی و باڵا، گشتی و هونەری – تا هەموو ئەو کەسانەی ئارەزوویانە بخوێنن بە خواستەکانیان شاد بن.

3–ئاسایشی ئابوریی. ئەگەر وەزعی خەڵکی لە ڕوی ئابورییەوە باش نەبێت ئەوا دەوڵەتی خۆشگوزەران لەوەهمێك زیاتر نابێت. دەبێت جیاوازی گەورەی نێوان هەژار و دەوڵەمەندان کۆتایی پێبهێنرێت و بۆ هەموان مادەی خۆراکی گونجاو، جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێ بۆ گوزەران و پشودان فەراهەم بکرێت. دەبێت هەژاریی لەناوببرێت بەبڕوای (ڕایسن): (لەنێوبردنی بنچینەی هەژاریی ئامانجی سەرەکی دەوڵەتی خۆشگوزەرانەو هەر دەوڵەتێك ئەو توانایەی هەبێت و جێبەجێی نەکات ناتوانێت وەك دەوڵەتێکی خۆشگوزەران ڕێز بەدەست بهێنێت). تا ئەوپەڕی توانا هەوڵ بۆ لەناوبردنی بێکاریی بدرێت و هەلومەرجی کرێکارانیش چاك بکرێت. سەعاتەکانی کارکردن کەم و دەسکەوتەکان گونجاو بن. دەبێت پانتایی شوێنی کارەکان تەندروست بن بۆ بێتوانایی و بەتەمەن بون بڕیاری گونجاو دەربکرێت. دەبێت کۆتایی بە چەوساندنەوەی کرێکاران لەلایەن خاوەن کارگە و بازرگانە گەورەکانەوە بهێنرێت. جوانکاری و خۆ دەرخستن بۆ گروپێکی بچوك و بەدبەختی و چارە ڕەشیش بۆ باقیاتی کۆمەڵگە کۆتایی پێبهێنرێت. (هاکرس – Hackers) سەبارەت بە ئەرکەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەران وتویەتی: (دەوڵەتی خۆشگوزەران قۆناغی بەرایی سۆشیالیزمی کاملە و لە ئەمڕۆدا ئەڵتەرناتیڤی نێوان کاپیتالیزم و سۆشیالیزمە).

4–خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی. مەرجی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی شیاو ئەرکێکی دی دەوڵەتی خۆشگوزەرانە. وڵاتە خۆرئاواییەکان لەو بوارەدا نمونەی باڵایان هەیە. فەرەنسا و ئەڵمانیا لە وڵاتە گەورەکان بون کە سیستمی پەروەردە و فێرکاریی دەوڵەتیان تەبەناکرد. بەریتانیا بیمەی بێکاری نیشتمانیی بە زۆری بەرقەرار کرد. ڕاپۆرتەکەی (بێڤریج – Lord Beveridge) سەبارەت بە بیمەی کۆمەڵایەتی کە لە 1942دا بڵاوکرایەوە، یەکێکە لە بەڵگەنامە هەرە گرنگەکانی هاچەرخ (بێڤریج) ئەو ڕاپۆرتەی لە بەریتانیا ئامادەکردبوو کە زۆر خزمەتگوزاری و کۆمەکی لەخۆ گرتبوو، کە دەبوو دەوڵەت بۆ گروپە مەحروم و بێتوانا و بێکارەکانی خەڵکی دەسەبەر بکات.

پێشەکی یاسای بنەڕەتی ساڵی 1946ی فەرەنسا جەخت دەکاتەوە کە: (بۆ هەموو خەڵك و بەتایبەتی بۆ مناڵان، دایکان و کرێکارانی بەتەمەن دەبێت چاودێریی تەندروستی، ئاسایشی مادیی، پشوو کاتی بەتاڵیی فەراهەم بکرێت).

ئامانجی یاسای (نیودیل – تێزی نوێ)، کە (ڕوزفڵت) بە دەنگی گەیاند بریتی بوە لە چاککردنی خۆشگوزەرانی لەسەرانسەری ئەمریکادا.

هەروەها وڵاتە ئەسکەندەناڤیەکانیش تێزی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتیان بە ئامانجی چاکترکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی خەڵك پیادە کردووە. سەرەڕای ئەوانەش دەوڵەتی خۆشگوزەران شکۆفە بە هونەرەکان دەکات و ئاسانکاریی نڤاری هونەریی دەئافرێنێت. هەرچەندە گەلەریی هونەریی، مۆزەخانە و کتێبخانەکان لە دێرینەوە هەبون. بەڵام ئەمڕۆ دەوڵەتی خۆشگوزەرانی نوێ لە فەراهەمکردنی ئەو توانستانەی دەبنە هۆی لادانی نیگەرانی و توندوتیژیەکان زۆر پێشکەوتوە. دەوڵەتی خۆشگوزەران نەك تەنها ئەرکی پارێزگاریکردنی لەئەستۆیە، بەڵکو لە پێناوی چاکترکردنی تەندروستی، شکۆفەکردنی

پەروەردە و فێرکاریی، دەسەبەرکردنی ئاسایشی مادی لە ڕێگای ڕێکخستنی چالاکیە ئابورییەکانەوە و لەناوبردنی دژوارییە کۆمەڵایەتیەکان هەوڵدەدات. ئەرکی واقیعیانەی دەوڵەتی خۆشگوزەران ڕایی کردنی سودمەندبونی هاوڵاتیانە لە ئازادیی واقیعانە.

هەروەها ڕێگر و ئاستەنگیش لەسەر ڕێگای چالاکی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیش هەیە. ئاستی نزمی بەرهەمهێنانی نیشتمانی، زیادبونی دانیشتوان، نەدانی باج و نیگەرانی لە باجی زۆر و وەفاداریی تەسکبینانە، مومکینە ببنە ئاستەنگی بەردەم دەوڵەتی خۆشگوزەران.

هەندێك ڕەخنەیان لە دەوڵەتی خۆشگوزەران گرتوەو گوتویانە کە دەوڵەتی خۆشگوزەران بۆ وڵاتە هەژارەکان شیاو نییە، چونکە دەبێتە هۆی تێچونێکی زۆر بەسەر دەوڵەت یان حکومەتەوە، سەربەخۆیی تاك لەناو دەبات و هزرێکی بێناوەڕۆکی بۆ دەئافرێنێت. بەجۆرێکی ناڕەوا بیروکراسی لە وڵاتدا تەشەنە دەکات و حکومەت بەبێ تێبینیکردن دراو بە خەرج دەدات، کە زیان بە جێگیریی ئابوریی دەگەیەنێت. مارکسیستەکانیش ڕەخنە لە دەوڵەتی خۆشگوزەران دەگرن و بە دەوڵەتێکی سەرمایەداریی دادەنێن کە ئامانجی چەوساندنەوەی چینە زەحمەتکێشەکانەو دەیەوێت کۆنتڕۆڵیان بکات. لە دیدی ئەمانەوە دەوڵەتی خۆشگوزەران جگە لە کۆمیتەیەکی ڕاپەڕاندنی بورژوازیی شتێکی دی نییە.

## پەراوێزەکان:

1-Edward M. Sait, political Institution; A proface (New york: Appleton Contury, 1938) p. 502.

2-دوورژە، اصول علم سیاست، پێشو ل 165

3-Sat,op. Cit. p.511.

4-Ibid. p.516.

5-دوورژە، اصول علم سیاست، پیشو ل 165.

6-بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر دەربارەی ڕاگەیاندن وەك ئامڕازێکی کرداریی دەوڵەتەکان، بڕوانە: فرانکل، پێشو ل 180-186.

7-دوورژە، اصول علم سیاست، پێشو.

8-Sait. Op. cit. p517.

9-دوورژە، اصول علم سیاست، پێشوو ل 169.

10-Finer, op. Cit. p 385.

11-J.A. Corry, Democratic Government and politics (Toronto: University of Toronto press, 1947) p. 377.

12-دوورژە، اصول علم سیاست، پێشوو ل 165.

13-هەمان سەرچاوە.

14-جان استوارت میل، در ازادی، ترجمە محمود صناعی (تهران: سازمان کتابهای جیبی، 340) ص 255.

15-B.D, Gupta, welfarestate in India (New Delhi: chand and Co; 1963) p.2.

16-D. L. Hobman, The welfare state 2nd ed (London: Allen and unwin, 1971)p. 10.

17-Ibid. p 10.

18-Ibid. p 9.

19-Agarwal, op. cit. p 48.

20-T.H. Marshall, Socology at the Cross Road (New york: the Me Millan Co. 1963) p. 284.

21-william Arobson, welfares state and welfares society: (I llasion and Reality newyork: Mac Millan Co. 1957) p. 31.

## سەرچاوە:

بنیادهای علم سیاست،
عبدالرحمن عالم، ل 365-381.

# هەڵە خۆرئاواییەکان و خۆخەڵەتاندنە خۆرهەڵاتییەکان

## دیالۆگ لەگەڵ (سادق جەلال ئەلعەزم)ی فەیلەسوفی ڕەخنەگردا

لە عەرەبییەوە: کارزان محەمەد

*بەڕێز پرۆفیسۆر ئەلعەزم، تۆ پسپۆڕی فەلسەفەی خۆرئاوایت، بەرلەهەمووان کانتناس و پسپۆڕی لە فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا؟ تۆ پێگەی ڕۆشنگەری لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی ئەمڕۆدا چۆن دەبینیت؟

-مێژووی مۆدێرنی عەرەبی هیچ مانایەکی بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ ئەوروپادا نییە. ڕۆشنگەری، ئایدیاکان، بەهاکان و پرۆژە ڕۆشنگەرییەکان بەتایبەتی لەڕێگوزەری شۆڕشی فەرەنساو هێرشی سەربازی ناپیلیۆن لەسالی (1780) بۆ میسرو فەلەستین، گرنگیان پەیدا کرد. لەمیسر بزووتنەوەیەك هەبوو کە بە بزووتنەوەی (بێداریی عەرەب) ناوزەد کرا. مۆدێرنیزمی عەرەبی هەبوو، ڕێنسانسی عەرەبی لە هزر، لە تیۆلۆجی، ریفۆرمکردنی ئەنیستیتۆکان و داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبوو. لیبراڵیزم، دەوڵەتی دەستور، مافەکانی هاوڵاتێتی، دابەشکردنی دەسەڵاتەکان، هەموو ئەم ئایدیایانە دواتر لە تێکۆشان دژ بەدەسەڵاتی ئەوروپاییەکاندا هاتنەئارا. شۆڕشی (1919) دژ بە دەسەڵاتی ئیستیعماری ئینگلیز لەمیسر، ئەزموونێکی لیبڕاڵی بوو لە کۆمەڵگای عەرەبیدا.

*بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە لەئێستادا چ پێگەیەکی هەیە؟

-دوو نابینایی دەربارەی ئایدیا ڕۆشنگەرییەکان هاتەئارا. یەکێکیان لەژێر کاریگەری کۆمۆنیزم و مارکسیزمدا لەژێرسایەی ئەم وەهمەدا دەرکەوت کە دەبێ بەسەر ڕۆشنگەریدا زاڵ بێت تا بگەنە شتێکی باشترو بەهەمان شێوەی کە دەزانیت، ئەمە شکستی خوارد.

ستەمی دواتر ڕەتکردنەوەو نکوڵی کردن بوو لەڕۆشنگەریی، جۆرە ئەنتی- ریفۆرمێکی سروشتی لە دەستەی ئیخوان ئەلموسلمیندا کە خوازیاری بنیاتنانەوەی سیستەمی کۆنی خەلافەتی

ئیسلامی بوون. ئەمە تا ئەمرۆش لەفۆرمێکی توندوتیژئامێزدا بەردەوامەو ئەلقاعیدە تەنها نمونەیەکییەتی.

*ئایا تۆ لە هیچ شوێنێکدا ئەنتی رۆشنگەری نابینیت؟

-ئەمڕۆ دوای هەڵوەشانەوەی وڵاتە کۆمۆنیستییەکان، شایەتحاڵی زیندووبوونەوەی بەها رۆشنگەرییەکانین. ئەمڕۆ ئایدیاکانی وەك مافەکانی مرۆڤ، دیموکراسی، ئازادییە مەدەنییەکان، حکومەتی مەدەنی، دابەشکردنی دەسەڵاتەکان، هەڵبژاردن، چاودێریی دیوانسالاریی لەلای چینێکی بەرفراوانی کۆمەڵگا عەرەبییەکان بە بەها کلیلییەکان ناودەبرێن و رێگای چوونەوە دەرەوەیە لەو بارودۆخە شێواوەی کە وڵاتە عەرەبییەکان دووچاری بوون. لەمبارەیەوە تورکیا زۆر شیاوی گرنگی پێدانە. ئەم واقیعییەتە گرنگییەکی کاریگەری هەیە کە ئیسلامی سیاسی لەتورکیا توانی ببێتە بەشێك لە سیستەمی دیموکراسی بەبێ ئەوەی کارەساتێك روو بدات. لەمیسر تازە رێکخراوی ئیخوان ئەلموسلمین بەرنامەیەکی ستراتیژیانەی داڕشتووە. ئەم بەرنامەیە بەنزیکەیی هاوشێوەی ئایدیاکانی دیدرۆیە! ئەوان چاوپۆشیان لە خواستی هەبوونی خەلیفەو بەئەلتەرناتیڤکردنی قورئان لەجێی دەستور کردووە. نمونەی تورکیا لەجیهانی عەرەبیدا بۆتە مایەی باس‌وخواسێکی بەرفراوان دەربارەی هەموو ئەم بەهایانە.

*وادێتەبەرچاو لێتێگەیشتن لەنێوان جیهانی دنیایی- مەسیحی‌و جیهانی ئیسلامیدا هێندە پێشڤەچوونی نەبێت. گەورەترین بەدحاڵیبوون، باوترین بەهەڵەتێگەیشتنەکان دەربارەی جیهانی ئیسلامی کە لەخۆرئاوا رووبەرووی تۆ دەبنەوە چیە؟

-یەکەمین هەڵە گوزارشتە لە گریمانەی (هۆمۆ ئیسلامیکۆس- مرۆڤی ئیسلامی) کە هاوشێوەی (هۆمۆ ئیکۆنۆمیکۆس- مرۆڤی ئابوری)ی خۆرئاوایە. بەپێی ئەم گریمانەیە ئاراستەی رەفتاری مرۆڤە موسڵمانەکان تەنهاو تەنها لەسەربنەمای فێربوونە ئاینییەکانە. لەکاتێکدا کە مرۆڤی موسڵمان مرۆڤێکە خاوەنی جۆرەها پاڵنەرو چاوەڕوانێتی جیاوازە! لەژیانی پراکتیکیانەیاندا زۆربەیان لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە، بەڵام تۆ لە خۆرئاوا پێتوایە کە موسڵمانان هێندە ملکەچی ئیسلام‌و وەفادارن بۆی کە هیچ کاتێك کارێکی دژ بە دەستورە ئاینییەکان ئەنجام نادەن. ئەم گریمانەیە من بۆ نمونە لەم شوێنەدا لەزانکۆی ئەنتۆرپ لەناو خوێندکاراندا دەیبینم.

دووەمین گریمانە ئەم هەڵەیەیە کە ئیسلام وەك تاکە ئایین‌و نەریتێکی باڵا، بەتەواوەتی لەگەڵ ئایینەکانی تر بەتایبەتی لەمەسیحییەت‌و یەهودییەت جیاوازە. بەڵام ئیسلامیش ئایینێکی مێژوویی‌و ستراکتورەکەی‌و کاردانەوەکانی بەپێی مێژوو فۆرمەڵەبووە. شتێکی بەجێیە ئیسلامیش وەك هەر ئایینێکی جیهانیتر لەبەرچاو بگیردرێت.

سێیەم، ئەوروپاییەکان دەیانەوێت ئەوە فەرامۆش بکەن - بۆ نمونە لەمشتومڕ دەربارەی دەستور لەگەڵ بەها مەسیحییەکاندا- کە مەسیحییەت ئایینێکی ئەوروپایی نییە بەڵکو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە سەریهەڵداوە. ئەم فەرامۆشکارییە یاریدەی بەهێزکردنی گریمانە رەگوڕیشەدارەکان دەکات، بەهەمانشێوەی کە ئەوروپای خۆرئاوا لەهەمبەر کۆمۆنیزمدا وای کرد کە گوایا کۆمۆنیزم بە نەریتی ئەوروپایی نامۆیە. بەهەرحاڵ نازناوی (خۆرهەڵاتی)یان پێبەخشی.

*تۆ لایەنگرێكی بەدیهێنانی عەلمانییەت، جیاكردنەوەی دەوڵەتو ئاینیت. سەرەنجام وادێتەبەرچاو كە گوایا تێگەیشتنی عەلمانییەت لەجیهانی ئیسلامیدا ئێستا كەمتر لە واقیعدا قبوڵ دەكرێت؟ بۆچی ئایدیای دەوڵەتی عەلمانی بەوچەشنە لە ڕازیكردنی كۆمەڵگا ئیسلامییەكانی ئەمرۆدا لاوازە؟

-من لێرەدا پێویستە جارێكیتر بگەڕێمەوە بۆ نمونەكەی توركیا. بەهەرحاڵ سەرنجڕاكێشە كە تاكە كۆمەڵگای ئیسلامی حیزبێكی ئیسلامی دیموكراسی بهێنێتەئارا كە لە هەڵبژاردنیشدا بیباتەوەو دەست بەسەر فەزای وڵاتێكدا بگرێت كە تا دواپلە ئایدۆلۆژیایەكی سایكۆلاری هەیە. بەمپێیە دەتوانرێ بەم چەشنە بخوێندرێتەوە كە كۆمەڵگایەكی عەلمانی مەرجێكی پێویستە بۆ بزووتنەوەیەكی ئیسلامی سیاسی. لەوڵاتە عەرەبییەكان، واتا لە زادگای ئیسلامدا، هیچ ئایدۆلۆژی یا حیزبێكی لایەنگری عەلمانییەت بوونی نییە، بەڵام ئاستێكی باڵای عەلمانییەت بەخشكەیی لە ئابوری، سیستەمی یاسایی، لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا هەیە بەبێ ئەوەی كە بەچەشنێكی بینراو جیاكردنەوەی مزگەوتو دەوڵەت ڕاگەیەندرابێت، بەهەمانشێوەی لە توركیا كرا. بەمپێیە فەندەمێنتالیستەكان بۆ نمونە لە میسردا چ كۆمەڵە داواكارییەكیان هەیە؟ جێبەجێكردنی خێرای یاسای شەرع واتا یاسا ئیسلامییەكان. بەڵام ئەمە بەم مانایەیە كە ئەوان سیستەمە یاساییەكەی ئێستا بە عەلمانی ناوزەد دەكەن. ئەوان دەیانەوێت سیستەمی فێركردن لە سوریاو لەمیسر بكەنە ئیسلامی. ئەمە بەم مانایەیە كە سیستەمی فێركردن بەواقیع عەلمانییە بەڵام نەك بەجۆرێكی بینراو. كەواتە ئیسلامگەراكان دووچاری دژیەكی بوونەتەوە، ئەوان دەیانەوێ كۆمەڵگا (ئیسلامی)یەكان ئیسلامیزە بكەنەوە، ئەو كۆمەڵگایانەی وەك كۆمەڵگا موسڵمانەكان هەژمار دەكرێن.

* ئەمە بەم مانایەیە كە دوورنماكانی جیاكردنەوەی بینراوانەی دەوڵەتو ئایین نارۆشنە؟

-لەوڵاتە جۆراوجۆرە عەرەبییەكاندا (لە عەرەبستانی سعودییەشدا) ئەم عەلمانییەتە خشۆكە ڕۆڵێكی زۆری هەیەو فەندەمێنتالیستەكان لەهەمبەر ئەودا كاردانەوە نیشان دەدەن. لەمڕووەوە ئەوان دەیانەوێت موبارەك لە میسر لەناوبەرن. ئایدیای جیاكردنەوەی مزگەوتو دەوڵەت ڕووبەڕووی بەرگرییەكی توند بۆتەوە. بەعەلمانییەتكردن وەك كۆمۆنیزم، بووە بەعەیبە. ئەو خەڵكەی خوازیاری جێبەجێكردنی بینراوانەی عەلمانییەتن، لەبەرئەم هۆیە لە حكومەتی مەدەنی دەدوێن نەك لە بەعەلمانییەتكردن.

*بۆچی وادێتەبەرچاو ئیسلام كەمتر لە ئایینەكانیتر ئامادەیە ڕووبەڕووی ئاستەنگەكانی مۆدێرنێتە ببێتەوە؟.

-من بەڕاستی لەم بڕوایەدام كە پێكدادانی مۆدێرنێتەو نەریتگەرایی مۆدیلێكی فكریی باشە تا هەلومەرجی ئێستا لە خۆرهەڵاتی نزیكو ناوەڕاستدا ڕوون بكاتەوە. مۆدێرنێتە كاریگەرییەكی باڵای لەسەر ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەكان هەیە، بەشێوەی بینراو بەجۆری هەمەچەشنە قبوڵ دەكرێت. لەمڕووەوە نەریتگەرا خاوەن نفوزەكان لە وڵاتانی ئیسلامیدا لەو بڕوایەدان ئەمە دوازۆرانبازییە. ئەگەر ئەوان ئەم زۆرانبازییە بدۆڕێنن، ئەوكاتە مۆدێرنێتە سەردەكەوێتو هەرئەوانیش دۆڕاون.

*مۆدێرنێتە لەلای ئیسلام وەك دەسەڵاتێكی نامۆ لەگەڵ ئیستیعمارو ئیمپریالیزمدا لەدەرەوە هاتووە.

لەئـــەوروپاش خەباتگـــەلێك لـــەپێناو بـــەدیهێنانی مۆدێرنێتەدا ڕووی داوە، هێندە بەسە بنۆڕیتە تێکۆشانی ڕووناکبیری بسمارك، بـەڵام مۆدێرنێتـە لـەم شـوێنەدا کامڵبوونێکی ناوخۆییانە بوو نەك دەرەکی...

–هێشتا وێنا نەریتییەکانی ئێمە بۆ خودمان لـەڕێی مۆدێرنێتــەدا ڕاوەســتاوە. ئێمــەی عــەرەب هەمیشـــە دەمانـــەوێت پیاوگـــەلێکی مـــەزن بـــین، ئاشـــتیخوازە گـــەورەکان، دیلکـــەرە گـــەورەکان، گـەورەیی لەهـەموو شـتێکدا. بـەرگریکردنێکی زۆر زۆر هەیە بۆ ئەوەی ئەم وێنا سایکۆلۆژییە بۆ خود لەهەمبـــەر واقیعییـــەتی ئـــەمڕۆدا هەڵبســـەنگێنن. خـۆلادان لـە تەفسـیرە نوێیـەکان بـۆ ناوەرۆکـەکانی قورئـان، بـەم ڕێگایـە کۆمەڵـە کێشـەیەك دێنێتـەئارا. نمونەیەك دەهێنمەوە، ئەمڕۆ کۆیلایـەتی لـە دەوڵەتـە ئیسلامییەکاندا لەناوچووە، بەڵام لەواقیعدا باسێك لەمبارەیەوە ناکرێت کەواتە ئێستا دەبێ چی بکـەین لـەو هـەموو دەسـتورانەی لەقورئانـدا سـەبارەت بـە کۆیلایـەتی هەیـە. یـا مەسـەلەی مـافی کەمینـەکان، مەسـیحی و جولەکـەکان لەئیسـلامدا لەبەرچـاوبگرە. ئەوانە پێشتر هـاوڵاتی پلـە دوو بوون، ئێسـتا ئـەوان هاوڵاتی پلەیەکن. ئەمە لێرەشدا باس لـەم دژییەکیـە نـەکراوە کـە مەسـیحییەکان لـە سـوپادا خزمــەت دەکـــەن، لەکاتێکـــدا ئـــەوان لـــە جـــەنگی دژ بەئیسرائیلیشـدا گیانیـان بـەخت کردووە– بـەپێی ڕۆحـی قورئـان ئەمـە هـەرگیز شـیاوی قبـوڵ کـردن نییـە. یـاخود جیهانناسـی قورئـان لەبەرچـاو بگـرە، جیهـان بــەر لــەتیۆری کۆپــەرنیکۆس، لاپەڕەیەکــە خــۆری لێهەڵــدێت و ئــاوا دەبێــت. بەشــێوەیەکی سەرســوڕهێنەریش مــوفتی گــەورەی عەرەبســتانی سعودییە لەساڵی (1985)دا لەکتێبێکدا ئەو هـەموو ئـەم شـتانە بـە دروسـت ناودەبـات، بەپێچـەوانەی سەرسوڕمانەکەی منەوە هیچ دەنگدانەوەیەکی لەناو زانایـانی موسـڵماندا نـەبوو کـە لەگـەڵ ئـەودا ناکۆك بـــوون. ئاگاداربـــە! ئەمـــە ئەحمەقانەیـــە! لـــەبری ئــەوەی کــە چــاویان بنۆڕنــە چــاوی کێشــەکەیان فەرامۆش کرد. ئەمانە هـەموو یاریـدەی تێگەیشـتنی ئـەو کەسـانە دەدات کـە ئیسـلام بەدژەمۆدێرنێتـە دەبینن.

## سەرچاوە:

سایتی (www.iran-imrooz.net)

# میوانی کۆشك

## چاوەڕوان نەکراو هەمیشە دێ..

"ئەندرێ مۆروا"

**ئەندریە مۆروا**

**لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی**

ووتی: چەند ساڵێکە نەخۆشیەکی خراپم گرتووە، تێبینیم کردووە هەموو شەوێ هەمان خەون دەبینم. لە لادێیەکدا پیاسە دەکەم و لە دوورەوە کۆشکێکی سپی دەبینم ماڵێکی نزم و فراوان چواردەوری بە کۆمەڵەدار زەیزەفونێك گیراوە لەلای چەپیەوە لەوەڕگایەکە بەدارکالیپتۆز دەوردراوە کە لووتکەی دارەکان لە دوورەوە بەسەر دار زەیزەفونەکاندا سەمایان دەکرد، منیش لەو خەونەمدا بەشێوەیەك کە بە دەستی خۆم نەبوو بەرەو ئەو ماڵە کێش دەبووم و بەرەو ئەوێ دەکەوتمە ڕێ..

لەبەردەم دەروازەکەیدا دەرگایەك هەبوو بە ڕەنگی سپی بۆیە کرابوو. دوای ئەوەش بە پێچکردنەوەیەکی کەمدا ڕاڕەوێك دەهات، ڕاڕەوەکە دەوروبەری گیرابوو بەدار و لە ژێر دارەکانیشدا گوڵی بەهاری هەبوون لە جۆری: (عەناقیە و شقارو زەعدە) ئەو گوڵانە لە خەونمدا هەر کە دەستم بە لێکردنەوەیان دەکرد، سیس دەبوون. لە کۆتایی ڕاڕەوەکەشدا کە چەند هەنگاوێك لە خانووەکەوە دوور بوو. لاکێشەیەکی بەفریز داپۆشراو بەجیا ڕاخرابوو وەکو زەوی بەگیا داپۆشراوی ئینگلیزی، هیچ شتێ بێ گەردیی ئەم سەوزاییە کراوەی تێك نەدابوو جگە لە ڕاڕەوێکی تەسك کە بە گوڵە وەنەوشەی بچووك ڕاخرابوو.

بەڵام کۆشکەکە لە بەردی سپی دروست کرابوو سەربانیشی لە لەوحی ئەردواز بوو دەرگاکەش لە داربەڕوو دروست کرابوو، بە دوو لەوحی لەسەر هەڵکۆڵراو دەور درابوو دەکەوتە لای خواری پەیژەی دەروازەکەوە. منیش حەزم دەکرد سەردانی ماڵەکە بکەم، بەڵام کەسێك لەوێ نەبوو وەڵامی

بانگەوازەکانم بداتەوە. ئیتر بە تەواوی بێ هیوا بووم.. زەنگم لێداو هاوارم کرد.. تا لە کۆتاییدا خەبەرم دەبوویەوە. ئەمە ئەو خەونەیە کە مانگێ زیاترە بە هەمان ووردەکاری و بە ئەمانەتەوە لێم دووبارە دەبێتەوە.. تا ئەو بڕوایەم لا دروستبوو کە ڕەنگە لە دەمی منالێمدا شتێکی وەکو ئەم کۆشك و باخچەیەم بینیبێ. تا ئەو بیرەم لا دروست بوو کە بۆی بگەڕێم تەنانەت بڕیاریشمدا ماوەی پشووەکەم بەسەر ئەو ڕێگا زۆرانەی فەرەنسا بەسەربەرم، پاش ئەوەی فێری سایەقی بووم سەیارەیەکی بچکۆڵەم کڕی تا ئەو گەشتانەم بۆ مسۆگەر بکا کە بەدوای ئەو خانووەدا دەگەڕام کە لە خەوندا بینیبووم. ئەو گەشتە زۆرانەتان بۆ ناگێڕمەوە. سەردانی هەرێمەکانی (نورماندی و تۆرین و پواتۆ)م کرد، بەلأم هیچ شتێکم دەست نەکەوت لەگەڵ ئەوەشدا شتەکەم لا سەیر نەبوو. و لە مانگی تشرینی یەکەمدا گەڕامەوە بۆ پاریس. بەلأم بە درێژایی وەرزی زستان بە بەردەوامی خەونەکەم لێ دووبارە دەبوویەوە و لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا گەشتەکانم دەست پێ کردەوە بە گەڕەکەکانی فەرەنسادا، و ڕۆژێکیان کە لە دۆڵە نزیکەکەی (ئایل دی ئادەم) دەپەڕیمەوە لە پڕ هەستم بەشتێکی لەپڕ کرد بەلأم هەستێکی خۆش و بەلەززەت بوو. ئەو هەستە نامۆیە بوو کە لە بینین و ناسینەوەی هەندێ کەس یان شوێندا تووشمان دێ کە پێشتر پێیانەوە پابەندبووین و پاش دابڕانێکی زۆر دووبارە پێیان شادبینەوە، ئەگەرچی من لە ژیانمدا پێشتر نەهاتبووم بۆ ئەم ناوچەیە، بەلأم بە تەواوی ئەم دیمەنەم بینیوە کە بە دەستەڕاستمدا ڕاکشاوە، هەمان لووتکەی دارکالیپتۆزەکان بوو کە دەیانڕوانی بەسەر دار زەیزەفونەکاندا دەشمتووانی ئەو ماڵە بدۆزمەوە کەلەپشت گەلأسەوزەکانەوە بوو.

ئیتر ئەو کاتە زانیم کۆشکە وون بووەکەم دۆزیوەتەوە. ئەو کۆشکەی کە لە هزرمدا ئامادەیە. ئەوەشم دەزانی کە ڕێگایەکی تەسك هەیە دوای نزیکەی سەد مەترێك ڕێگا سەرەکیەکە دەبڕێ. و ڕێگاکەش هەبوو. پاشان ئەو ڕێگایەم گرت و گەیاندمیە ئەو دەرگایەی کە بۆیەیەکی سپی کرابوو. لەوێشەوە سەرەتای ئەو ڕاڕەوەبوو کە چەندین جار پیا ڕۆیشتووم. و لە ژێر دارەکاندا بەسەر سووڕمانەوە لەو ڕەنگە ناسکانە ڕادەمام کە گوڵەکانی (زەعدەو عەناقید و شقار) بەرجەستەیان کردبوو. کاتێکیش ئەو گومەزەم تێپەڕاند کە گوڵە زەیزەفونەکان بەرجەستەیان کردبوو. زەمینێکی سەوزی بە گژوگیا داپۆشراوم بینی. و ئەو پەیژەیەش کە لە کۆتاییەکەیدا ئەو دەرگایەیە کە لە دار بەڕوو دروست کراوە. لە سەیارەکەم دابەزیم و بە پەیژەکەدا سەرکەوتم خێرا لە زەنگی دەرگاکەمدا. وە دەترسام لەوەی کە کەس وەلأمم نەداتەوە. بەلأم خێرا خزمەتکارێ دەرکەوت، پیاوێکی بەتەمەن و روومەتی دڵتەنگ دیاربوو جلێکی ڕەشی لەبەردابوو، زۆری بەلاوەسەیر بوو کە بینیمی بەبێ ئەوەی تەنانەت ووشەیەکیشی لێوەبێ زۆر بە گرنگی پێدانەوە سەیری دەکردم. ووتم: شتێکت لێ داوا دەکەم ڕەنگە بەلاتەوە نامۆبێت، من خاوەنی ئەم کۆشکە ناناسم، بەلأم زۆر سوپاسگوزارو دڵخۆش دەبم گەر ڕێگایان بدابایەم سەردانێکی ئەم کۆشکەم بکردایە.

خزمەتکارەکە وەکو پەشیمان بێتەوە وەلأمی دایەوە: خاتوونەکەم، ئەم کۆشکەدانراوە بۆ کرێ، منیش بۆ ئەو مەبەستە لێرەم.

ووتم: بۆ کرێ..؟ ئای چ ڕێککەوتنێکی دەگمەنە. ئەی خاوەنەکانی بۆ لەم کۆشکە جوانەدا ناژین..؟

ووتی: خانم خاوەنەکانی لێرە دەژیان ، و لەوەتی تارماییە ڕۆح لەبەرکانی تیا دەژین، ئەوان جێیان هێڵاوە.

ووتم: تیا دەژین.؟ ئەمە ڕێم لێ ناگرێ. نەمدەزانی کە هێشتا لادێ نشینانی فەرەنسا بڕوایان بە تارماییە رۆح لەبەرکان ماوە.

بەدڵنیاییەوە ووتی: خانمەکەم منیش بڕوام نەدەکرد تا چەند جارێك، بەشەو ئەو تارماییەم لە باخچەکەدا بینی.. تا وای لە نیشتەجێیانی ئەم کۆشکە کرد کە لێی هەڵبێن.!

هەوڵم دەدا پێبکەنم و ووتم: ئای چ حیکایەتێکە!!

پیرەمێردە خزمەتکارەکە بە دەنگێك کەنبرەیەکی لۆمەکردنیشی تێدابوو وەڵامی دایەوە: دەڵێی حیکایەت، ڕەنگە واش بێت، بەڵام بەتایبەتی تۆ نەئەبوو گاڵتەت بەوە بکردایەو پێی پێبکەنیتایە، چونکە خانم، ئەو تارماییە جگە لە تارمایی تۆ.. تارمایی هیچ کەسێکی تر نەبوو!!

## سەرچاوە:

گۆڤاری (الثقافة الاجنبیە) ژمارە 3/4ی ساڵی 1991 لاپەڕە 116-117.

**تێبینی:** ناوی گوڵەکان هەروەکو لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەدا هاتووە دانراوە.

# بوولێڵە

مەنسوری یاقوتی

لە فارسییەوە: حەمە رەسووڵ حەسەن پوور

بۆ خەڵکی کە نادی سیروان!

لە بوولێڵەی بەیانیدا ئەسپەکە بە ئیحتیاتەوە سمی لەسەر شووشەی بریقەداری سەهۆڵەکە، لە کەناری چۆمەکە، لە بوارەکەدا دانا. ئەو هەڵمەی لە کونە تفنکانی دەهاتەدەر وەك مژێکی خەست لە پێش چاوەگەشوو رەشەکانی رادەوەستا.

مام سەلیم دەمووچاوی بە جامەدانەکەیدا پۆشیبوون و کەڵاشینکۆفێکی لەسەر شانی راستی لەسەر قەمسەڵەکەی قوورسایی دەکرد و لەسەر کەوانی زینەکەی خوارببۆوە، بە میهرەبانییەوە دەستی بەسەرویاڵی ئەسپەکەیدا هێناو وتی:

-مەترسە برۆ!

شووشە سەهۆڵەکە بە قرچە قرچ لە ژێر پێی ئەسپەکەدا شکاو ئەسپ تەزووی بە لە شیدا هات، لەوبەری چۆمەکە رێگەیەکی بەفرگرتوو بەدی دەکرا کە بەرەو سەرووی چیایەکی خامۆش هەڵدەکشاو لەولاترەوە دەچووە نێو دەربەندێکی پێچاوپێچ و سامناکەوە. ئەسپەکە یاڵی راوەشاند و بە چەند تەکانێك لە چۆمەکە پەرییەوە و سەهۆڵە شکاوەکانی بە نێو چۆمەکەدا پەرشوو بڵاوکردن. نە دەنگی باڵندەیەك و نە خشپەی گیانەوەرێکی وەحشی دەهاتە بەرگۆی.

چۆلگەیەکی خامۆش و بێدەنگو ترسناك، ئەگەر لە بنارە پڕ لە بەفرەکانی چیاکان خەتگەلی پێچاو پێچ و تێکەڵووپێکەڵی ئەو گیانلەبەرە دڕندانەی شەوانە بەدوای نێچیرێکەوە وێڵن، لە هەوراز و نشێوەکان بەدی نەکردبان، مرۆڤ دەهاتە سەر ئەم بڕوایە کە جیهان هەیاهوو دەنگە دەنگی لێبڕاوەو تەنیا پیرە پیاوێك بە ئەسپێکی خەنەیی بێدەنگییەکە تێکدەشکێنێ.

مام سەلیم تەمەنی 50 ساڵ زیاتر نەبوو، بەڵام نیشانەی بەد خۆراکی و ژیانێکی سەخت و تاقەت پڕووکێن بە دەمووچاوییەوە دیاربوو، لاواز و باڵا نێوەند، چاوی زیت و وشیار، سمێڵی زل و تەواو سپی بوون، ئێستا سواری ئەسپێکە کەشەو بە باشی پشووی داوەو تێری لە ئالیك خواردووە، تەنیا چاوە زەردەکانی لە مژۆڵی چلوورە گرتووی دادەجووڵان.

با بەفرەکەی هەڵدەگرتوو رەنوە تیژەکانی بەدەمووچاوی پیاو و ئەسپەکەیدا دەدا. هێشتا

هەوا ڕووناك نەبوو بوو بۆ ئەوەی لە دورەوە دۆستو دوژمن لێك دیاری بکرێت. ئەسپەکە لە تەپۆڵکەیەکی سەرولێژەوە هەڵوێستەیەکی کردو گوێی قیت کردن و سەری بەرز کردەوە. مام سەلیم سەری بەرز کرد و بە چوار دەوری خۆیدا ڕوانی. لە خوارەوە جەنگەڵی سپیداری چڕو پڕ سەریان بەیەکەوە نابوو کە دواییەکەیان بەرەو گوندی "تووە سپی" دەچوو، ئاواییەکە نەدەبیندراو دوور بوو، دواییەکەی دۆڵی "هەزار کەو" بوو، سەرەوەکەی گوندێکی سەوزاوسەوز بوو. مام سەلیم زانی ئەسپەکەی هەستی بە گورگێك کردووە، چاوی لە دەورووبەری خۆیکرد بە دیتنی جێی پێی خوێناوی، جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشا، لە ئەسپەکەی دابەزی و تفەنگەکەی لەسەر بەفرەکە ڕۆناو پشتێنەکەی کردەوە، برینێکی قووڵ و درێژ بوو، تەزوویەکی مەرگ هێنەری بەلەشیدا هات، گۆرەوییەکانی خەڵتانی خوێن بووبوون و پێڵاوەکانی پڕبوون لە خوێن. چەند جارێك سووڕا تاکوو پشتێنەکەی بە تەواوی بۆوە. بە لەپی دەستی بەفری سەربەردێکی ڕاماڵی، چەرخە نەوتییەکەی لە گیرفانی دەرهێناو هەڵیکرد و لە ژێر پشتێنەکە ڕایگرت، پشتێن گڕی گرت، چەرخەکەی دەگیرفانی ڕۆکردەوە و قەڵەمبڕە تیژەکەی دەرهێناو نیوەی پشتێنەکەی بڕی. ئەسپەکە لە سووچێك وێستا بوو سەیری ئاگرەکەی دەکرد کە بەرەبەرە پشتێنە درێژەکەی هەڵدەلووشی تا کردییە خۆڵەمێش، هەوا بەرەو ڕووناکبوون دەچوو لەسەر سینگی بێگەردی ئاسماندا، ئەستێرەکان خامۆشبوون، قاسپەی خاسە کەوێك لە چیاکان دەنگیدەدایەوە، مام سەلیم بێ ڕاوەستان جوێنی دەدان و هەڕەشەی تۆڵە ئەستاندنەوەی لە هێرشبەران دەکرد:

—من نامرم.. دەژیم، باوکتان لە گۆڕ دەردێنمەوە.. خەیاڵی چیتان کردووە؟ لە چنگی سەلیم دەرناچن، فیشەکم بەزایە ناچێت، لەعنەت لە ئێوە کە دۆست و دوژمن لێك ناکەنەوە.

ئاگرەکە گشت قوماشەکەی کردە خۆڵەمێش، سەلیم ئەو لایەی پانتۆڵەکەی کە فیشەکی بەرکەوتبوو، دڕاندی و خۆڵەمێشی پشتێنەکەی لەسەرخۆ و بە تەواوی کۆکردەوە و لە زاری برینەکەی کرد و بە باقی پشتێنەکەی برینەکەی توند پێچا، تفەنگەکەی هەڵگرت و ئەسپەکەی دەنگدا:

—وەرە پێشەوە (سیروان) پێویستە هەتاو نەکەوێ بگەینە ئاوایی.. ئەسپەکە چۆ پێشەوەو مام سەلیم بە دژواری سوار بوو.

—بڕۆ!

لە گردێکی چیاکەی ئەولاترەوە دێڵە گورگێك داخزییە خوارەوە، جووتێك خاڵاو لەسەر سپیدارەکان فڕین، هێڵێکی زەعفەرانی و ئاڵتوونی بەلای ئاسۆدا کێشرا، بوولێڵە ڕەنگی دەبزڕکا، پێی چەپی دەلاکەلەکەی ئەسپەکەی کوتا:

—بفڕە سیروان!

لەسەراو لێژێکی سەخت تێپەڕبوو، دۆڵی هەزارکەو وەك دیوارێکی بەرز دەرکەوت، مام سەلیم دڵی داخورپا و هەستیدەکرد جەستەی چووکدەبێتەوە، ئازارێکی تاقەت بڕ ئەزیەتی دەدا، ددانی دەچیڕەوە بردن، خوێن ڕژان کەمتر ببۆوە، بە مەودای کەم، تۆپەڵە بەفری خوێناوی لەسەر سپیایی بەفرەکە وێنەیان دەکێشا، بە پاژنەی پێی دەکەلەکەی ئەسپەکەی کوتا:

—مەترسە، بڕۆ، چەکم پێیە!

ئەسپەکە سمی دەنێو بەفرەکە نا، مام سەلیم بەخۆیوت:

"نەدۆست دەناسێت نە دوژمن!"

ئەو، دوو جووت گۆرەوی خوری لە پێدابوون و دەستیشی دەنێو دەستەوانەی خوریدا هەستیان

بەسەرما نەدەکرد. دەرپێیەکی گەرم و نەرمیشی لە پێدا بوو (بە کورتی باش بە خۆی ڕاگەیشتبوو!)

جگە لە مام سەلیم ڕێویی کوێستان کەی دەیتوانی نامەی تایبەتی بگەیەنێتە برادەران؟

لەلایەکی بەفرەکە وەك مەرجانی سووریان وەشاندبێت، جێی پێی خوێناوییەکە بەرەو ژووری تەپۆڵکەکە دەچوو بەرەبەرە باریکتر دەبۆوە.

بۆنی خوێن ئەسپەکەی پەرێشانکردبوو چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت:

(بڕۆ شەوێکیش خوێنی من و تۆ کارەباکە ئاگر دەدات).

ئەستێرەیەکی گەشوو پرشنگدار لەسەر لووتکەی چیا دورەکە دەدرەوشایەوە و با لە دۆڵەکاندا ناڵە ناڵیبوو، تەمێکی خەست چیا ڕووبەرووەکەی لە نێو خۆیدا گومکردبوو، مام سەلیم گۆرانییەکی لەبن لێوانییەوە دەچڕی:

"ئەو کێوەت دیوە، تەم دایگرتووە، هەموو ئەو تەمە، خەمە و بەسەرمندا باریوە.."

لە نزیك سپیدارەکانەوە کە با دەیشەکاندنەوە، ئەسپەکەی سەری بەرزکردەوە، گوێی تیژکردن و حیلاندی، مام سەلیم بیری کردەوە: "خۆ دوژمن لێرە نیە، گیانلەبەرێکیش بەدی ناکرێ دز و جەردەش بەم سۆز و سەرمایە لە ماڵدەرناکەون مەگەر ئەوەی.؟"

تەقەی تفەنگێك ئەسپەکەی خستە سەر پاشوان، بە پاژنەی پێی چەپی دەکەلەکەی ئەسپەکەی وەژاند، تفەنگەکەی لە شانی داماڵی و سووڕا و بێ نیشانە گرتن تەقەی کرد، ئەسپەکە وەغاردان کەوت، مام سەلیم جوێنی دەدان و تەقەیدەکرد.

ڕیزێکی لێ کراو سینگی تەپۆڵکە بەرانبەرەکەی ئاژن ئاژن کرد، لە پاشان چەند دانە تەقەی دیکە و هیچیانی وێنەکەوتن.

بەلابەلایەکی تەپۆڵکەکەدا ئەسپەکەی بایدایەوە.

لەسەر بەفرەکە جێگا پێیەکی خوێناوی بەدیدەکرا، بێدەنگییەکی سامناك لە چیاکاندا جێگەی خۆی دا بە نائارامییەکە، سوارەکە سەری لەسەر کەوانی زینەکە ڕۆنابوو، بۆ یەك چرکە "ڕێواس"ی کچی هاتەوە بەرچاو کە پێی پێدەکەنی، مام سەلیم سەری لەسەر کەڵپۆسی زینەکە هەڵبڕی، کە دەنگێکی گەیشتە بەر گوێ:

-"دەورەت گیراوە نەبزووی!"

دەستبردن بۆ چەکەکەی بێسوود بوو، دابێژ دا بێژ دەکرا!.

بەخۆی وت: "پێوەبووم"، لە گشت لایەکەوە لوولەی تفەنگەکانیان تێگرتبوو، یەکێك بە دەمانچەی لەسەرڕێ چۆ پێشەوە و ئەمری پێکرد:

-دابەزە!

چار نەبوو کەوتبۆ کەمینەوە، جوێنی دەدان و بە دژواری دابەزی.

-برینداریش بووی، کێ و لە کوێ تەقەیان لێکردی؟

-کەس تەقەی لێنەکردم، لە تفەنگەکەم دەرچوو.

-بەڵێ بەسەری باوکت، دەچوویە کوێ؟

-بۆ لای خوشکەکەم لە ئاوایی سەروو..

جوێنی دەدان.

-تۆ وتت و ئێمەش بڕوامانکرد!

یەکێك چووە پێشەوە و چەکەکەی لە شانی داماڵی. بژۆڵکە چلوورە گرتووەکانی لەسەر چاوە زەرد و خامۆشەکانی تێك ئاڵقان، ئێستا ئیتر دونیا ڕووناك بوو بوو و دوست و دوژمن لێکدەکرایەوە.

## سەرچاوە:

حەوتوونامەی سیروان "ژمارە 252 8ی سەرماوەزی 1382ی هەتاوی".

# تاوی غارغارێن

کریستینا پێری رۆسی
له سویدییەوە: عەبدوڵا قادر دانساز

جەللادەکان رۆژێك له ڕۆژانی هەفتە سواری ملی قوربانییەکانیان دەبن. ئەوان هەردەم له هەمان رۆژی هەفتەشدا ئەو کاره ناکەن چونکه ئەو کاته تاوی غارغارێنەکه توخمی غافڵگیرانەی لەدەستدەدات و ئەوەشیان یەکێکه له گەورەترین سەرنجراکێشەری ئەو کاره. رێکەوتی رۆژەکەش به هەمان شێوەی هەڵبژاردنی ئەسپەکان. به گۆتره هەڵدەبژێردرێت.

مەشقی غارغارێنەکه به ئاراستەی چوونه سەرەوه بەو قادرمانەی نهۆمی یەکەم دەگەیەنێت به نهۆمی دووەمی بەندیخانەکەوه جێبەجێدەکرێت. لەو رۆژه تایبەتییەدا جەلادەکان تەکاندەدەنه نێو خانەی بەندیخانەکانەوه و بەندییەکان غافڵگیر دەکەن، ئەوانەی که دەبن به ئەسپ هەڵدەبژێردرێن و یەکسەریش ئەو کڵاوه رەشەی دوراوه به جلەکانیانەوه لەسەریان دەکەن بۆ ئەوەی ئەوان نه بتوانن جێگاکه بناسنەوه و نه بتوانن بەربەستەکانی تاقیکردنەوه بزانن.

بەندکراوەکان لەلایەن سوارەکانیانەوه بۆ بەر قادرمەکه پاڵیان پێوه دەنرێت و له ژێر ئەو کڵاوانەی دوراوه به جلەکانیانەوه تەکان دەدەن و وەکو ئەسپێك له نێو مەیدانی غارغارێندا ملی درێژکراویان بۆ پێشەوه هەڵدەدەن.

مرۆ دەبێت دان بەوەدا بنێت که جێگای تاقیکردنەوەکه زۆر به گونجاوی بۆ کارەکه هەڵبژێردراوه. قادرمەکه له چیمەنتۆ دروستکراوه، باریك و تاریکه و ماوەی نێوان پێپیلکەکان گەلێك زۆره، پێپلیکانەێلێك که بەشێوەیەك پڕاو پڕ بۆ ئەو کاره داخوراوه تاوەکو ئەو کاتەی ئەسپەکه پێی لەسەردا دادەنێت پێی لیَ هەڵبکەوێت.

سوارەکه سواری قەڵادۆشکانی قوربانییەکه دەبێت و ئەگەر بێتو ئەسپێکیان هەڵبخلیسکێت ئەوا به گرانی سزا دەدرێت: مرۆ دەبێت هاوسەنگی ڕاگیر بکات، به تەواوی چەکمەی سوارەکان لەبن هەنگڵی خۆیان قایمبکەن و بەوردی خۆی دووربخاتەوه له سیَ و دوو کردن.

ئیتر ئەو کاتەی ئەسپەکان به باشی بەڕیزێك راگیران ئەوا کاتی ئەوه هاتووه گەشت بەرەو سەرەوه دەستپێبکات.

سوارەکان بە قامچییەك، بە هاواری هەڕەشەلێکردنەوە قوربانییەکانیان دنە دەدەن و خەبات بۆ پلەی یەکەم دەکەن، بەڵام لەوێدا گەلێك بەربەستی نەناسراو هەیە و ڕێگاکەش تا دێت سەختتر دەبێت.

گەلێك ئەسپ دەکەون، ئەوانی تر سەریان بەیەکا دەتەقێتەوە، مرۆ گوێ بیستی هاوار و هەناسەبڕکێیە. ئەوانەی توانیان بەیەکەم پێپیلکەدا سەرکەون نازانن چەند پێپلیکەی دیکە ماوەتەوە، نە هیچ شارەزاییەکیان بەرامبەر پێچکردنەوەی ڕێگای غارغارێنەکە هەیە و نە دەشزانن چ شێوە بەربەستێك لە پێشیانەوەیە. ئەسپەکان پیس و پاتاڵ، خوێناوی و بەدەموددانی تێکشکێنراوەوە دەتوانن بە زگەخشێ بە قادرمەکەدا سەرکەون و هیچ شتێك دەربارەی هەنگاوی دواتر نازانن.

ئەو بەندیانەی لە بۆ ئەم تاقیکردنەوەیە هەڵنەبژێردراون ئەوا ناچارن و لەسەر داوای ئەو ئەفسەرە ڕەفتار ڕەقانەی ئامادەی مەشقکردنەکەن ئەسپەکان بەرنەوە سەر ڕچەڕێ ڕاستەکە.

سوارە براوەکە لەلایەن ئەفسەرەکەوە خەڵاتێکی پێ دەدرێت و ئەسپەکەش وەکو خەڵات کلۆشەکرێکی پێ دەدرێت.

## سەرچاوە:

Christina Peri Rossi

Kosmoagonier, 1990 Pieksa maki

# شەوی کەروانەکان

**گابریل گارسیا مارکیز**

**لە عەرەبییەوە: سابیر شاکر مەلوول**

هەرسێکمان لە دەوری مێزەکە دانیشتبووین کە یەکێك پارچە دراوێکی خستە کونی دەزگانەواکەوەو هەمان ئەو ئیستیوانە سووڕاو چریکاندی کە بە درێژایی شەو کاری کردبوو و گرمەی دەهات. ئیدی ئەوەی قەوما قەوما و پاشماوەی کارەسات و ماجەراکە بە خێراییەکی ئەوتۆ روویدا کە سەرمان لێشێواو هۆشمان پەڕی و هیچ دەرفەتێکی بیرکردنەوەی بۆ ئێمە نەهێشتەوە، یانی قەوما پێش ئەوەی بە خۆمان بزانین لە کوێین و پێش ئەوەی هەستی شوێندۆزیمان بێدار بێتەوە و هەڕێ لە بڕێ بکەینەوە. ئەوجار یەکێك لە ئێمە قۆڵی کێشاو بە تەپو کوت و کوێرە کوێرە دەستی بۆ سەر پێشخوانەکە درێژ کرد — دەستەکەمان نەدیت گوێبیستی بووین — بەر گلاسێك کەوت و جوولەی نەماو لەسەر ڕووی ساغ و روختەی پێشخوانەکە گیرسایەوە. ئەو کات ئێمە هەرسێکمان لەناوجەرگەی تاریکیدا بۆ یەکتر گەڕاین و لەوێدا لەسەر پێشخوانەکە لە تێکبەزینی سی پەنجەدا یەکمان بینییەوە. یەکێکمان گوتی: با بڕۆین. وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ، هەستاینە سەرپێ. هێشتان وەختمان نەبوو بۆ نیگەرانی و هێشتا کاتی ئەوە دانەهاتبوو کە وەڕز و هەراسان بین. کاتێك بەڕاڕەوەکەدا ڕادەبردین نەوای مۆسیقاکەمان ئەوەندە نزیك، لە پەنای خۆماندا دەبیست کە دەتگوت بانگی ئێمە دەکات، بۆنی ژنگەلێکی غەمگینمان بەگژدا دەهات کە دانیشتبوون و چاوەڕوانییان دەکێشا، کاتێك بەرەو دەرگا دەرۆیشتین لە بەردەمماندا هەستمان بە بۆشایی ڕاکشاوی ڕاڕەوی سەرسەرا دەکرد، پێشئەوەی بۆنێکی تر پێشوازیمان لێبکات، بۆنی ناخۆش و هەرناهووتی ئەو ژنەی لەبەردەرگا دادەنیشت. گوتمان: بە دوعا ئێمە دەرۆین مەرەخەس دەبین. ژنە هیچی نەگوت، ئەمما کاتێك هەستا، جیڕەی کورسییە بزۆکەکەمان بیست، هەروەتر ترپەی پێگەلێك لەسەر تەختەی لەق و هەستی پێی گەڕانەوەی ژنەکە کاتێك لاوانەکان زیڕەیان لێهەستاو دەرگاکە لەودیومانەوە خڕ داخرا.

سەرمان وەرسووڕاند، دروست لە هەمان جێدا، لە پشت سەرمانەوە کزەیەکی تیژ و وشکی دەهات، سۆزەی بەیانییەکی نەبینراو و دەنگێك کە دەیگوت:

ڕێگاکە بەردەن، بەم شتەوە دێمە ژووریٚ" کشاینەدواوە دەنگەکە دووبارە گوتی: بەولاوە بەولاوە هێشتان نێودەرانەتان تەنیوە". ئیدی تەنیا ئەو کاتە بوو بەڵیٚ ئەو کاتە کە ڕوومان بۆ هەر لایەك دەسووڕاند و هەمان دەنگمان دەبیست، تەقی لە جەرگمان کرد و گوتمان: ئێمە ناتوانین لێرە دوور بکەوینەوە ئاخر مەلە کەروانەکان چاویان دەرێناین و خواردیان کوێرین کوێر. ئەوجار گوێمان لە چەندین دەرگا بوو کرانەوە، یەکێکمان دەستی بەردایین، هەستمان کرد بە کوێرە کوێر و گۆدەگۆد، زرم و کوت لە شتەکانی دەوروبەر دەگیریٚ، ئەمجار لە شوێنێکدا لە دڵی تاریکیدا هەرای کرد: دەبیٚ نزیك بووبینەوە ئاخر بۆنی سندوقی کەلوپەل دیٚ" جارێکی تر هەستمان کرد دەستمان دەلاوێنێتەوە. ڕوومان لە دیوار کرد ئالێرەدا دەنگێکی تر ڕاست بە ڕووماندا تەقی و بەرەو لایەك دایقەلاٚشت یەکێکمان گوتی: "ڕەنگە تابووت بیٚ"

بەلاٚم ئەوەی لە تاریکیدا بەشەق و شەپڕێوی دەرۆیشت و سەرسمی دەدا و ئێستا لە تەکمانەوە کەوتبووە هەناسەبڕکیٚ و هانکە هانك گوتی: دڵنیابن سندووقی کەلوپەلە، لە منداڵیمەوە بۆنی کەلوپەلی تەقەتکراو و دەقکراو دەناسمەوە، لەگەڵ هیچ بۆنێك لێمتێکناچیٚ".

ئەمجارە بەرەو ئەولایە رۆیشتین — زەوییەکی ساف و هەموار بوو، خاکێکی نەرم و بیٚ گریٚ و گۆڵ ئەوەندە خەڵك بەسەریا رۆیشتبوو. کەسێك دەستی کێشا، هەستمان بە پەنجەی چون شمشاڵ، بە پێستی زیندوو و نەرم و گەرم کرد ئیتر بۆ تاوێك وامان خەیاڵ کرد هەرچی دیوارە پێوارەو ڕەویونەتەوە بەلاٚم هەیهات لە پڕ لووتمان بە دیواردا تەقی، وتمان: ئەمە ژنێکە! ئەوەی باسی سندووقی جلانی دەکرد گوتی: پێموابیٚ نووستووە. جەستەکە لە ژێر دەستماندا مچوڕکی پێداهات و لەرزی و ڕاتڵەکا و هەڵبەزییەوە، هەستمان کرد ون دەبیٚ نەك ئەوەی دوور بکەوێتەوە لە لاوانەوەی دەستمان نانا بەڵکو دەتگوت لە راستیدا هەر نەبووە!

ئەوجار دوای تاوێك لە خامۆشی کەشان بەشانی یەك چەقیبووین و وشك هەلاٚتبووین سەدای ژنەمان بیست کە دەیگوت: ئەوە کێیە؟" بەبیٚ جوولە گوتمان: خۆمانین. جیڕەی چوارپایە و تەختی خەو و خشپەی پێیمان بیست کە لە تاریکیدا لە قاپقاپ دەگەڕا دواجار وێناو خەیاڵی ژنەمان کرد کە بەچاوی پڕ لە خەوەوە دانیشتووەو لێمان دەڕوانیٚ.

پرسی: ئێوە لێرە چیدەکەن؟

وەلاٚممان دایەوە: "نازانین — کەروانەکان چاویان خواردین" دەنگەکە گوتی شتێکی وایبیستووە، گوتی ڕۆژنامەکان نووسیویانە کەسیٚ پیاو لە گۆڕەپانیٚ حەوشەیەك مەیان دەنۆشی و دەیانخواردەوە کە پێنج شەش کەروانی تێدابووە یان حەوت کەروان ئەوجار یەکێك لە پیاوەکان وەك کەروان بە ئاوازێکی خۆش خوێندوویەتی و لاسایی کردوونەتەوە، ژنە پێداچوو گوتی: (مەرگەسات و بەدبەختی لەوەدابووە هەر کە سەعاتێك لە ئاواز خوێندنی کەروانەکان رابردووە خۆیان هەڵداوەتە سەر مێزەکە و ئەو سیٚ کەسەیان بە دەندووك کوێر کردووە و چاویان ڕژاندوون و لە کالانە دەریانهێناون و خواردوویانە)، گوتی: رۆژنامە ئەمەی گوتووە و بەلاٚم هیچ کەسێك بڕوای نەکرد بە وتەی رۆژنامەکان.

ئێمە گوتمان: گەر خەڵکی بۆ ئەویٚ رۆیشتبان، کەروانەکانیان بە چاوی خۆیان دەبینی.

ژنە گوتی: رۆیشتن. ڕۆژی دواتر گۆڕەپانەکە جمەی دەهات لە خەڵك بەلاٚم ژنە مەلە کەروانەکانی بردبوو بۆ شوێنێکی تر". کاتیٚ ئاوڕی دایەوە ژنەکە بێدەنگەی لێکرد و قسەکەی بڕی. جارێکی تر دیوار لەویٚ بوو. بۆ هەر لایەك وەردە سووڕاین دیوار بە لووتماندا دەتەقی، هەمیشە هەر دیوار بوو و دیوارو

دیوار. یەکێکمان دیسانەوە دەستی بەردایەن هەستمان کرد قاچی دەخشکێنێ و لەسەر چنگان دەخزێ و دەڵێ: ئێستا نازانم سندووقی جلەکان لە کوێن. پێموایە لە شوێنێکی تردایەن.

دەنگمان هەڵێنا: وەرە بۆ ئێرە، کەسێك بە تەکمانەوەیە، گوێمان لێبوو بەرەو لامان هات، هەستمان کرد بە تەنیشتمانەوە وەستاو هەناسەی گەرمی لە ڕووی دەداین، پێمانگوت: لە ڕێگاکە بگەرێ، کەسێك لەوێیە کە دەیناسین، بە یەقین گەڕاوەو دڵنیابووین کە بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتووە کە ئاماژەمان پێداو بۆمان دیاری کرد چونکە تاوێك دواتر گەڕایەوە کە بڵێ: پێموایە کوڕێژگەیەکە.

پێمانوت: چاکە لێی بپرسە بزانن دەماننناسێ یان نا.

پرسی: دەنگێکی بێ پەروا هاتە بەرگوێ، دەنگی ئاسایی مێردمنداڵێك کە دەیگوت: بەڵێ، دەتانناسم. ئێوە ئەو سێ پیاوەن کە مەلی کەروان چاوی خواردوون.

ئەمجار دەنگی مرۆیەکی گەورەهات، دەنگی ژنێك کە پێدەچوو لەودیو دەرگایەکی داخراوەوە بێ، دەیگوت: ئەوە جارێکی تر لەگەڵ خۆتانا قسە دەکەن و دەبزڕکێنن!"

دەنگی منداڵەکە بێپەروا گوتی: نانا ئەو پیاوانەی چاویان ڕژێنراوە جارێکی تر لێرەن و سەرو سەمەنەیان پەیدا بۆتەوە!

جیڕەی لاوانەکان و دواتر دەنگی ژنەکە نزیکتر لە یەکەمجار گوتی:

بیانبە بۆ ماڵێ"

کوڕێژگەکە گوتی: نازانم لە کوێ دەژین .

دەنگە گەورەکە گوتی: قسەی هیچ. لەو شەوەوە کە کەروان چاوی دەرهێناون هەموو کەسێك دەزانێ لە کوێ دەژین و هەموو کەسێك دەزانێ ماڵیان لە کوێیە.

ئەمجار بە ڕاوێژێکی جیا کە دەتوت لەگەڵ ئێمەدا دەدوێ پێداچوو: "مەسەلە ئەوەیە هیچ کەسێك نایەوێ بڕوا بەم بەدبەختییە بکات و دەڵێن ئەمە فڕ و فیشاڵێکە کە ڕۆژنامە سازی کردووە تا پڕ فرۆشتر بێ و هیچ یەکێك مەلی کەروانی نەبینیوە"

کوڕەکە گوتی: "ئاخر ئەگەر لەسەر جادە و شەقام ببمە کوێرکێشی ئەمانەش کەس بڕوام پێ ناکا!"

بێ سرتە هێشتان پشتمان بە دیوارەوە دابوو و گوێمان دەگرت.

ژنە گوتی: "گەر ئەم هەتیوە بتانباتەوە جیایە. هەرچۆنێك بێ کەس گوێ بە قسەی مێردمنداڵێك نادات.."

دەنگی منداڵەکە قسەکەی پێبڕی: "گەر وێرای ئەمانە بچمە سەر شەقام و بڵێم ئەم زاتانە ئەو پیاوانەن کە کەروان چاوی ڕژاندوون و کوێری کردوون، مناڵ و تواڵ دەمدەنە بەر بەرد هەر بە پەڵ چاوم دەردێنن ئاخر هەرکەسێك لەسەر شەقام و خەیابان بگری دەڵێ ناکرێ ئەمە ڕوویدا، شتی وا قەت نابێ" تاوێك بێدەنگی وەشاو ئەمجار دیسانەوە دەرگا زرم داخراو مناڵەکە هاتە قسە: (سەرباری ئەوە من هەر ئێستا خەریکی خوێندنەوەی –تێری و چەتەکانی دەریا–م)

کەسێك بە گوێماندا چپاندی: ڕازی دەکەم، ئەوجار ئارام ئارام بەرەو شوێنی دەنگەکە بزووت گوتی: (منیش ئەم کتێبەم پێخۆشە دەی بۆم بگێڕەوە کە ئەم هەفتەیە چی بەسەر تێری هات)

بیرمان کردەوە بەم شێوەیە دەیەوێ دڵی منداڵەکە بەدەست بێنێ بەڵام منداڵەکە گوتی: حیکایەتەکە ناموروژێنێ تەنیا شتێك کە حەزی پێدەکەم ڕەنگەکانە، مەبەستم ڕەنگەکان و وێنەکانی کتێبەکەیە.

وتمان: "تێری لە تووناوتوون و ونستاندایە"

به دەنگێکی سارد و بێ باك، ڕاوێژێکی خاڵی لە هەر سۆزێك گوتی: "ئەوە کارەساتی هەینی بوو، ئەمڕۆ یەکشەممەیە و حەز دەکەم تەماشای ڕەنگەکان بکەم"

کە ئەوەی تر گەڕایەوە وتمان: (سێ ڕۆژە سەرگەردان و پەشێو و بێ قەرار ون بووین)

کەسێك گوتی: چاکە با تاوێك بحەسێینەوە و چاوێك گەرم بکەین بەبێ ئەوەی دەستی یەکتر بەربدەین.

دانیشتین و تینی خۆرێکی نادیدە وردە وردە ناوشانی گەرم دادەهێناین بەلاّم تەنانەت حزوری هەتاویش ئۆخژنی نەدەخستە دڵ وامان هەست دەکرد بیری مەودا و زەمەن و ئاراستەکانمان لە دەستداوە زۆر دەنگ بەلاماندا ڕۆیشتن.

وتمان: کەروانەکان چاویان دەرکردووین

گوتمان: کەروان گلێنەی چاوی لە قاپێلك هێناوینەتە دەر یەکێك لە دەنگەکان گوتی: تەماشا تەماشا ئەم بەدبەختانەش بڕوایان بە قسە و وتەی ڕۆژنامە و مۆژنامە هەیە..

وەرە سەیرێ هەڵیت و پەڵیتی ڕۆژنامەیان بە جدی گرتووە!

دەنگەکان ڕەوینەوە ئێمەش هەروا شانبەشانی یەك لە گوزەرگای دەنگەکان داو لە گوزەرگای وێنەکان و ڕەنگەکاندا لە چاوەڕوانیدا دانیشتبووین چاوەڕوانیی بۆنێك یان دەنگێکی ئاشناو ئۆگر کە بەلاماندا تێپەر بێ.

هێشتان هەستمان بە گەرمای هەتاوەکە دەکرد لەسەر تەوقی سەرمان. پاشان یەکێك گوتی: چاکە با بچینەوە پەنای دیوارەکە ئەوانی تر کە ئارام و بێ دەنگ سەریان بۆ لای تیشکە نەبینراوەکە وەرسووڕاندبوو گوتیان:

-"جارێك زووە، لێگەڕێ با بە پرشنگی هەتاو هەڵقرچێین و تاوەسووت و خۆرانگاز ببین ئەوجا.."

1953

### فەرهەنگۆك:

1-Curien مەلێکی خۆشئاوازە کە قاچێکی درێژی هەیە و ڕەنگی بازەو بەقەد کۆترێکە بە زۆری لە گوێی چەمەکان و کەناری دەریا دەژی عەرەبەکان سەرو گوێلاکی وشەکەیان شکاندووە و کردوویانەتە: کروان فارسەکانیش واژەی تلیلەیان بۆ هەڵبژاردووە.

2-دەزگانەوا: صندوق الموسیقی، جهاز الموسیقی

3-تاوەسووت: خۆرانگاز: سووتان بەخۆر

4-لاوانەکان: لەولەکان: مفصلات الابواب - مفاصل الباب.

5-قاپێك: کالانەی چاو

6-پێوار: لەبەرچاو ونبوون - دیار نەمان - غەیب بوون

7-ونستان: وێڵستان: وێڵگە - تووناوتوون: المتاهە

8-بێ دەنگی وەشا: بێ دەنگی وڵاتی داگرت.

9-هەروەتر: هەروەها

10-چاوی ڕژاندوون: چاوی دەرهێناون.

### سەرچاوەکان:

1-اجمل رجل غریق في العالم، قصة لیلة الکروان، غابریل غارسیا مارکیز، ترجمة شوقي فهیم دار الوحدة 1982.

2-سفر خوش اقاي رئیس جمهور مارکز ترجمة احمد گلشیری داستان شبي تلیله ها - تاران 1998.

# باخچەکەی عەلی

ڕوشدی ئەلعامل
لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی

کوڕەکەم
کۆچ ئەکەی؟
ئەوەتانێ دووریت،
پەنجەکانتم دی پێکەکەیان لەخۆگرتبوو،
چاوە ڕەشەکانیشت
هەور تەنیبوونیو ئەلەرزین،
دەنگی نەرمیشت،
لە دالآنەکانی بێدەنگیا ڕایئەکرد،
زاریشت جلێکی ماچ ئەکرد
خوێن چنی بووی.
بینیمی ئەگریای
نکوولّی مەکە... تەنیا بووی.
دەرگاکەت کلۆم داو
پەردەکانت دادایەوەو
گوێت بۆ دوا هەواڵەکانی شەو ڕادێرا
پێنووسەکەشت کە خوێنی لێ ئەتکا
دات نا،
پەڕاوەکەت داخست،
مۆمەکەت کوژانەوە،

خەونە درۆزنەکە پێی وتی
ئەمشەو دێم،
تۆ بڕوات کرد
ئەو خەونانە.. نووستنت بتەننەوە؟
کوڕەکەم..
کۆچ ئەکەین؟
لە هەنگاوەکانی غوربەتا مردین،
شۆستەکانی جیهانمان ماندووکرد،
لە ڕێو بانەکانی زەویا
هەنگاوەکانمان ون بوون و
لەنێو خودی خۆمانا کۆچ ئەکەین
لە خوێنی خۆمان ڕائەکەین
لە چاوی خۆمان دوور ئەکەوینەوەو
چاوانمان لێمان دوور ئەکەونەوە
لە دەماری مردووەکانا
بە شوێن دوا بەندەرا ئەگەڕێین
لە سەرماو سۆڵەدا
پەنا بۆ بەفری بێدەنگی ئەبەین،
لە هاوینیشا

درەختەکان ڕووت ئەکەینەوە،
لە خامۆشیی شەویشا
کە پاسەوانەکە پێڵووەکانی لێکنا
گەرممان ئەبێتەوە
پێم بڵێ
کام ئەستێرانە
بە کەناری خەمەکانتا پەڕینەوەو
لەگەڵ خۆیان
تۆیان بۆ ئەو ڕۆخەی دی نەبرد؟

* * *

کوڕەکەم
ئەم جیهانە دوو دەستە
دەستێ نان ئەبەخشێ،
دەستێکی دیش
نانی خەڵکی ئەدزێ
من ئەزانم.. زەوی هی ئەوەیە ئەیکێڵێ،
خاك هی ئەوانەیە کە تۆوی ئەکەن،
بەڵام گەنمو درەختەکانی باخەکەو
چی هێشووی دارخورماکانە
یاساوڵەکان ئەیانبەن.
منیش وەك تۆ،
ڕووم پاکژ بوو،
خوێنم ژەهری نەچەشتبوو
کێڵگەم هەر گەنمی تیا ئەڕوا
هەر هێشووە خورمای ئەگرت
جۆگەیەکیش لە باخەکە
گۆرانیی بۆ شلێر ئەوت
ئەوسا سپێدە جوانتر بوو،
خۆری شیرین گەرمتر بوو،
شەوی نەرم ناسکتر بوو
دنیاکەی من،
کۆمەڵە کیژۆڵەیە بوون
پرشنگی مانگی ڕەنگ زەردیان ئەچنی
بە تەنوور نانیان ئەبرژاند
بادەیان لە ترێ ئەوشی.. تا کۆن ببێ
جیهانەکەی من..
جیهان بوو.

* * *

چاوەکانت
بە خوێنما هاتوچۆ ئەکەن
منداڵ بووی.. لە لانکا بووی
سنگی دایە.. بە خۆیەوە ئەینووسانی
دەسرازە سپییەکانیش
لە ئامێزیان ئەگرتی
پرشنگدار بووی،
لە مانگە شەوێکی هاوین
لای من گەلێ قەشەنگتر بووی،
لەگەڵ چاوتا یاریم ئەکرد
پێئەکەنین گشت شتەکان،
کە لە کۆڵانیشا.. ڕات ئەکرد
ناوت ئەبووە گشت ناوەکان

* * *

چەند خۆشە کوڕەکەم
ڕووت دوو چاوی لە چاوەکانی بەسرەی
لەیادابێ،
یان ئافرەتێ، لە شەقامی بیستا
کە بەلاتا گوزەر ئەکاتو ئەتبینێ
ئاخ هەڵکێشێو
عومری تۆش هەر لە بیستابێ

* * *

چی لەوە بە بەهاترە
ئەشکەکانت
بە خۆری حەسرەت هەڵئەیەن
چاوانت ئەوین ببەخشن
سینەت نهێنیی خۆی حەشاردا
کوڕەکەم تەنانەت بۆ مەرگیش
چۆك دامەدە
ئەڵێن دووانن فەرمانڕەوایانی جیهان

زێڕی زەردو،
قامچی ڕەشی،
ناو لەپی دەستی بەندیەوان
درۆیە کوڕم
جیهان بەندیخانە نیيە
برژانگەکانی ئەم دنیایە بێستانە
گوڵەکانی
گەنمزارەکانی،
خەونی شاعیر،
گڕوگاڵی منالێ گۆرانی ئەڵێ
سنگی دایکێ لەگەڵ لێوەکانیا ئەدوێ:
بێستانە
کوڕەکەم، ئەم جیهانە
ئینسانە
* * *
چەند خۆشە کوڕم
هێشتا منالٚ بی‌و
لە لێڕەواری شیعردا هەنگاو بنێی،
لە باخی شاعیرەکانا
گوڵی سوور بچنی‌و
وەکو چەپکێ خۆشەویستی
بیکەیتە دیاریی هەژاران
ئەی چەند جوانە.. دەست‌و دڵت
سەوقاتی کلۆڵ‌و نەدار بێ
کە مەرگیش دەستەو یەخەت بوو، گەورە بی
تا ناوەکەت
لە کاروانی شەهیدانا
پرشنگدار بێ
* * *
کوڕەکەم
ئەوەتانێ تەنیای،
منیش وەکو تۆ هەر خۆمم،
شووراکان
ناهێڵن چاوم بە چاوت بکەوێ
وەلێ شیعرەکان
سەرچاوەیان
لە گۆشەی چەپی دڵمدان
* * *
کوڕم مەڕۆ
چارۆکەی غوربەت
لە شەوی بێ بەشەکان ڕەشترە
خەم مەخۆ کوڕم
شەوگار کورتەو خۆر لە ژوانیدا ئەمەکدارە
ئاگردانیش
چاوەڕێی نان‌و
چەپکێ گوڵی ئادارە
کوڕەکەم
لە خۆم پتر خۆشم ویستی
لە تەك شوێن پێکانتا دوام،
ڕێت تەی ئەکرد
دەستەکانت لە دەرگایان ئەدا
چاوەکانتم لە میحرابا بەدی کرد
دەستم لە زامەکەوەدا،
گوێم لێ بوو بە چرپە
(باوکی بەر لە کوشتن
گۆرانی ئەچڕێ)
دە کوڕەکەم.. تۆ لە من گەورەتربە
* * *
کوڕەکەم
هەموو شتەکانم پێ وتی
فێرم کردی
ناوت لەسەر ئاو نەنووسی
ڕووی خۆت
وەکو بەفر بێگەرد
پاك وەك بەیان
هەڵی بکۆڵی لەسەر بەرد
نەشهێڵی ناوەکان
کۆچ کەن لە لات

فێریش بە لەناو دڵتا هەڵیان گری، شەهیدەکان

* * *

کوڕم خەم مەخۆ
مۆم لە نێوان تاریکی و ئاگردا ئەتوێتەوە
بەڵام شەو ئەڕوا
چاوانی خۆریش بۆ مناڵەکان پێ ئەکەنێ
ڕۆژی ڕووناکیش لە نێوان تاریکایی و بەربەیانا
سەما ئەکا
خەم مەخۆ
ژێیەکان
تەنانەت گەر
بە زەبری چەقۆی جەللادیش لەت و پەت بن
لەناو دڵی گیتارەکا
سترانی خۆیان هەر ئەچڕن
خەون ئەبینن.. ئەگرین و سەمائەکەن و پێئەکەنن
شەوی زیندان درێژە کوڕم
وەلێ شەوی بەندیەوان درێژترە
بەربەیانی جەللادەکان کورتە کوڕم
وەلێ بەربەیانی خەڵکی گەلێ قەشەنگترە

* * *

من.. کوڕەکەم
هەموو ژێنی خۆم ڕەهن ئەکەن
ئایا ئەم کۆت و پێوەندە
هەر دیلی دەستەکانم ئەبێ؟
یان دەستی مەرگ بە دیل ئەگرێ؟

* * *

کوڕەکەم
چێژی خۆشەویستی و
تامی نانت کردووە،
ئەی پەیت بە ئازاری چژانەوەی
زامی ناو لەپێکی ئارەقاوی بردووە؟
ئەی تامی خۆشەویستیت
لەسەر لێوی ئافرەتێکی عاشق دیوە؟
ئەی چێژت لە گەنم و
دەرکردنی نانی ناو ئاگر بینیوە
ئەی سترانت بۆ تەوێڵی
مرۆڤێکی لە سێدارە دراو چڕیوە؟
کوڕەکەم.. جەللاد
نازانێ هەویری نان
بشێلێ بۆ مناڵان
کوڕەکەم.. عیشقی بێدەنگ
کەس نایناسێ
هەر ڕووباری هێمن نەبێ
کە شیرینی‌ی هێشووەکان
بە گەڵایەکان ئەبەخشێ

* * *

کوڕەکەم جەللاد
بەغا ناناسێ
لە نێوان چێژی عەشقیداو
بۆنی سوبێرەکەی.
پێم بڵێ
لە نێوان ئافرەتێکا
کە لەگەڵ گزنگا سەردانت بکاو
ئافرەتێك
شەو بکاتە پەردە
تۆ کامەیان پەسەند ئەکەی؟

* * *

ئامارژەی بۆم کرد
لێوەکانی ئەلەرزین و
لە پشت پاردەکانەوە ون بوو
پێکەنینەکەی بە ڕووما هەر پێئەکەنی
چرپەکەشی لام مایەوە
"گەر گشت نهێنی‌یەکانت ئەزانی"
کوڕەکەم
گەر پێت بڵێم
هێشتا زامی یەکەم ڕای نەکردووە
زامێکی دی لەناو سنگتا ئەکەمەوە؟
گەر پێت بڵێم

بێستانەکە وشك بووە
جۆگەلەکانی بێ ئاون و
هەموو گەروویان تینووە
گوڵی وەریو
سکاڵا لەدەستت ئەکا.. دوورکەوتووە
لقەکان هەواڵت ئەپرسن
دار هەنارو گەنمەکەش
هەر لەو کێڵگەیە ئەپرسن
کەوا مرۆڤ جێی هێشتووە
*　*　*
ئایا شتەکان ئەگۆڕێن؟
زەوی ئەبێتە ئاسمان
دڕك ئەبێتە گوڵەگەنم و
پڕ بکا لمی بیابان؟
ئەی درەختی وشك هەڵهاتوو
ئەبێتە گوڵێکی سووری هاوینەیی
گشت ناوەکان ئەگۆڕێن و
ناوم ئەبێتە ناوێکی دی..؟
*　*　*
کوڕەکەم
ئەوەی ڕووت، زامت، سێبەرت
دەستەکانت پێمی ئەدەن
تەمەنێکی شیرینترە
چاوانیشت
کە لەسەرماو سۆڵەی غوربەتا..
کە لە بێدەنگdی جیهانا،
لە شەوی بەندیخانەدا،
پیێ ئەکەنن
لە هەموو شتێ بەنرخترە
*　*　*
کوڕەکەم
کەس پتر لە جارێ
لەدایك نابێ
کەسیش زیندوو نابێتەوە،
ئەوە نەبێ
دوا تەماشای خۆی کردبێ
*　*　*
کوڕەکەم ئەگەر مردم
بێجگە لە تۆ کێ بۆم ئەگری
"باوکم بووە قوربانیی دەست وەهمێ:
خوا لێمانەوە نزیکە
دایکم گۆڕستانی خێزانەکەی ڕەهن کرد
تا نان بکڕێ،
خوشکم بازنەکانی بووکێنیی خۆی فرۆشت،
چاوانی منیش چاوەڕێی
ساڵی بیست و سێیان ئەکرد،
ئاخ کوڕە بەسزمانەکەم
ڕێکەم تەفرو تونای کردم، دەپویێمەوە..
لە قوڕەوە هاتووم و وا
بۆ قوڕیش ئەگەڕێمەوە
*　*　*
گوێم بۆ دەنگی تۆ ڕادێرا،
دەنگت دوور بوو،
خۆشت دوور بووی،
منیش لەگەڵ غوربەت و شیعرەکان
خەونم ئەبینی دەریا ببڕم،
خەونم ئەبینی کۆچ کەم بەڵام..
بازرگانەکان..
ئاخ کوڕم بازرگانەکان..
*　*　*
ڕووتم لەبیر بچێتەوە؟
جۆگە سەمای ئاوی بیر ئەچێتەوە؟
ئەی شەو
کازیوەی لەبیر ئەچێتەوە؟
زامتم لەبیر بچێتەوە؟
ئایا چەقۆ ڕێی نێوان ئاگایی و مەرگ و
ڕێی نێوان بووکێنی و کفنی
لەبیر ئەچێتەوە؟

سایەتم لەبیر چێتەوە؟
کەشتیەوان ئەستێرەی پۆڵ لە یاد ئەکا؟
ئەی دەریاوان و
پاسەوانی نیوەشەوو
ڕێبواری شۆستەکانی بەندەرەکە
ڕەنگی ئاگر لە یاد ئەکەن؟
لێم نزیك ئەبیتەوە،
دەستم بەردەستت ناکەوێ،
دەنگت نادۆزمەوە
لەنێو مەوداکانی خەم و
کتێبە پەرشوبڵاوەکان و
پێنووسی سەرسامی نێو کاغەزەکانا
هەڵئەسم
لەبەربەیاندا بە ئاگادێمەوەو ناتبینمەوە
دەسم بەر هیچ ناکەوێ بێجگە لە
تاسەی ناو گلێنەکان
کوڕەکەم باشتر وایە
لە ڕۆژگاری قاتوقڕیدا چاوانت بنوقێنی و
لە سەدەی بیست و یەکا بە ئاگا بێیتەوە
* * *
ئێستاکە من چۆن بتبینم
لە کاتێکا پێم کۆت و پێوەند کراوە
چۆن بانگت کەم
لە کاتێکا
قفڵ لە لێوم دراوە
بڵێی پێش کۆچم بتبینم.. یان شووراکان!!
ئێستاکە تۆ شەبەنگێکی
بە نێوان چاوان و دڵما
بە نێوان پێڵوو یادما
گوزەر ئەکەی
دەنگت بەرەو
ئەودیو دەریاکانی زەوی و
لێرەکانی بیرچوونەوەو
شۆستەی شارە پڕ تیشك و گوڵەکان ئەڕوا..
ڕووی تۆیە ڕێگا تەی ئەکا..
یان دنیایە واز لە من دێنێ و کۆچ ئەکا؟
* * *
کوڕەکەم
ڕووبارەکان ڕێگا ئەبڕن
گوڵان چاویان هەڵدەهێنن
درەختەکان بەری مێوو
هێشووی دارخورما ئەگرن
شۆڕشگێڕەکانیش
لە دڵی مێوا
لە قووڵایی ڕووبارا
لە هێشووی دارخورمادا
لە ئاگرا
هەموو چاوەڕوانی شیعرن
لە شۆستەکانی ئەو بەندەرەی ترا لەنگەر ئەگری
تۆ.. یان لە
شۆستەکانی شەقامەکەدا،
چاوم ئەچێتە خەو
خەون ئەبینم دەستەکانت
گەرمی بەسەرینم ئەدەن
چاوانیشت نیگا ئەکەن
ناوچەوانیشت بە ڕووما پێ ئەکەنێ
ئاخ کوڕەکەم
بێدەنگی شەکەتی کردووم
تۆش لە پەنجەرەکەمەوە دووری
تۆ تەنیایت و
منیش لە پەڕەوازیا هەنگاو ئەنێم
کوڕەکەم کۆچ ئەکەی
دەنگت لە ژوورەکەدا بەجێ دێڵی،
ڕووت لەسەر پەنجەرەیماڵەوە،
دەسەکانیشت
لەسەر دوا ئاسەواری چاوەکان..
کوڕەکەم ڕووت
شەوم ئەتەنێ

لێت نزیك ئەبمەوەو دێمە پێشێ
دەموچاوت بێستانێکە
بۆ جۆگەلە پێئەکەنێ
چارۆکەیەکە
کۆچ ئەکەم کەی کۆچ بکا
تۆ کۆتاییت و سەرەتا
تۆ خەمیت
تۆ شادمانیی ئەبەدیت
تۆ قەشەنگییت
گەر تەوێڵت
بەر لە مەرگم
لە ڕووم نزیك ئەبێتەوە
هەنگینێ
با غوربەتیش
شالاوی خۆیم بۆ بێنێ

* * *

کوڕەکەم گەر مردم
جگە لە تۆ کێ
سەبارەت دنیام ئەنووسێ
جگە لە تۆ کێ ئەزانێ
وێنەی شادیو پێکەنین و
ڕەنگی خەم لەسەر
ڕووبکێشێ؟
کێ ئەزانێ
زارم پێئەکەنێ
چاوانم هەڵدێن،
دڵی کراوەم بۆ دڵی خەڵك
لە سینەیدا
برینی ئەوانە حەشار ئەدا
کە دڵیان بە مەرگی مرۆڤ
ختووره ئەکا؟

* * *

سەرلەنوێ بانگ ڕابهێڵم،
شەو تێپەڕی،
ساڵ تێپەڕی و،
چی کەشتیی
غەریبانە هاتنەوە کەچی
تۆ هەر نەهاتی
بەیانی تا ئێوارە
لە بێدەنگیی
دەریاکە ڕائەمێنم
گوڵێکی سووری خۆشەویستی
لەگەڵ خۆما هەڵئەگرم و
لەتەك بێدەنگییەکەی خۆما
گەمە ئەکەم
نە دەسێ دیارە ئاماژەکا
نە دەسڕێ
بەسەر ستوونی کەشتیی غەریبەکانەوە
بەدی ئەکەم
گوڵەکان بەدەم
شەپۆلەکەوە ئەدەم
دەنگیشم کۆئەکەمەوەو
بەرەو ماڵ ڕێگا تەی ئەکەم

* * *

لە یادت کەم؟
ئاخر گیتارەکەم لایە
لە یادت کەم؟
لە کاتێکا ئاگردانێ
لەنێو پەراسوەکانمایە
کەی شۆڕشگێڕان
ئالاکەی خۆیان زیندە بە چاڵ کرد
کەنگێ ڕەنگی سەرگوڵەکان
وشکیان کرد
کەی تێکرا هەموو شیعرەکان کۆچیان کرد
هەنگینێ من لە یادت ئەکەم
خۆشترین شت لە تەمەنتدا کوڕەکەم
خەندەی دڕکەو ئەشکی گوڵان
جوانترین شتیش لە ڕووتا.. ئەوەیە

**پێکەنی لە ئاست پیاوکوژان**

*　　*　　*

**بهێڵە ئەم ساتە هەناسە بەم،**
**دەنگی دەریا لە دەسم بگرەو**
**بهێڵە با چاوەکانم**
**لە نێوان ئاسۆی هەورینو ڕووناکیا**
**شاگەشکەبن،**
**خەونەکانم دێنمە سەما،**
**ڕووم بەرز ئەکەمەوە،**
**قژی سەر تەوێڵم ئەسڕمو**
**تێر بە چاوانم**
**لە پشت شووراکەوە پێئەکەنم**
**بەڵام ئاخ کوڕەکەم من دیلم**
**ئاشەکە پەراسووەکانی ئەجووێو**
**تەنوورەکەش ئەمبرژێنێ**

*　　*　　*

**کوڕەکەم تۆ تەنیای،**
**ئەزانم لە بێدەنگیدا نووقم بووی**
**شەوانیش هەر تەنیا ئەنووی**
**گولانی زەوی باسکیان بۆ خۆر والا ئەکەن**
**لای کەنارت.. عەودالی چیت؟**
**هی کەشتیی دەریاوانێ**
**کەوا دوێنێ بەجێی هێشتیت؟**

*　　*　　*

**دەنگت ئەچپێنێ؟**
**ناچرپێنێ،**
**وەکو تیشک تێ ئەپەڕێو**
**پەردە بەسەر پەنجەرەکا ئەداتەوە**
**ڕووخسارت بە خەم تەنراوە**
**ئاماژەیەکیش**
**لە نێوانی چاوانتایە**
**ئای لەم شەوە چەند درێژەو**
**ئەو سپێدەیەش چەند کورتەو**
**ئەو تیشکەش کە تینی خۆیمان پێ ئەبەخشێ**

**چەندێ دوورە**

*　　*　　*

**کوڕم ئەزانی چی ئەگەیەنێ**
**ئافرەتێ دی لە چاوانتا پێ بکەنێ؟**
**یان لە سەرمای ناو شەقاما**
**ڕووت بکرێتەوەو**
**لە نێوان پەراسووەکانتا**
**زامێ کە هەڵئەکوڵرێ.. بخەنێ،**
**ئەزانی چی ئەگەیەنێ**
**جیهان بە لای خۆیا ڕاتکێشێ**
**بەڵام تۆ ڕاناکێشرێی**
**یان دەستی بەندە فرۆشان بۆ دەستەکانت درێژبن**
**بەڵام تۆ ناکڕرێی**
**کوڕەکەم ئەوەی ڕەنگی**
**خۆر نەناسێ**
**گشت شتەکان لە سێبەرا**
**بە تۆخو ڕەش بەدی ئەکا:**
**گەڵاکانی بێستانەکە،**
**دار گوڵەکان،**
**چاوی منالان،**
**پاکژیی ئاو،**
**ئەوەی ماوەیەکی زۆر**
**لە ئەشکەوتا لێی درێژ بوو**
**گشت ناوەکان لە یاد ئەکا**

*　　*　　*

**جگە لە خەم،**
**چیی تر هەیە لە چاوانتا،**
**ئەی لە برسێتی بەولاوە**
**چیی دی لەسەر لێوانمە**
**بێ لە ئازار**
**چیی تر هەیە لە ڕووتا وا**
**گیانم ئەخوا..**
**ئێستاکە من چۆن بتبینم**
**لە کاتێکا پێم کۆتو پێوەند کراوە**

چۆن بانگت کەم
لە کاتێکا
قفڵ لە لێوم دراوە
بڵێی پێش کۆچم بتبینم
یان شووراکان..
ئێستا تۆ شەبەنگێکی
بە نێوان چاوان و دڵما
بە نێوان پێڵوو و یادما
گوزەر ئەکەی
دەنگت بەرەو
ئەودیو دەریاکانی زەوی و
لێرەکانی بیرچوونەوە و
شۆستەی شارە پڕ تیشک و گوڵەکان ئەڕوا
ڕوی تۆیە کۆچ ئەکا
یان دنیایە واز لە من دێنێ و کۆچ ئەکا؟

* * *

کوڕم ئەوەی
ناولەپی دەستێك ماچ بکا
ناولەپی دەستێکی تریش هەر ماچ ئەکا
ئەوەی دوو ناو لەپ ماچ بکا
تەنانەت دوو پێش ماچ ئەکا

* * *

کوڕەکەم ئەزانم
هەردوو دەستم
دوو ناو لەپیان گرتۆتە خۆ.. ئەتوێنەوە
چاوانیشم لە چاوانت ئەتەکێنەوە،
چارۆکەشم ڕووەو کەناری مل ئەنێ
کەشتیەوانیش نایزانێ،
ئەزانم کێیە کۆچ ئەکا
لە نێوان ساتی بێدەنگی ڕوو و
چرپەی ئاوەکانا
ئەزانم کە ڕەنگ زەردی و
خەمگینیی دڵ
نانێکە لە نێوان دووانا
کۆچ کەم لە لات
دوور بکەومەوە لە ڕێگات
لە شۆستەکانی لە یاد کردنا
سووسەی ڕوویەك کەم
لە باخی چاوەکانمدا
هیچ نەڕوێنێ.. جگە لە خەم؟
کوڕەکەم
خەوو چاوەکانم
دوو هاوەڵی ڕێگایەکن
لە لێڕێکدا تێ ئەپەڕن
تارماییەکن بە شەو نائاشنا
بەندیەوانیش پەییان پێ نابا،
کە چاوی چووە خەو سوڵتان
خەوو چاوە نووقاوەکان
سوڵتانن بەسەر
ڕەنگی خەونی سەماکەری نێو
پێڵووەکان.

..................

- ڕوشدی ئەلعامل شاعیرێکی عەرەبی عیراقی بوو کە لە کۆتاییەکانی ژیانیدا ئیفلیج بوو و لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا کۆچی دوایی کرد و گەرچی بارودۆخی ژیانی لە سای ڕژێمی بەعسدا زۆر سەخت بوو ، بەڵام تا مرد نە سەری بۆ ئەو ڕژێمە دانەواند و نە وەکو زۆر لە شاعیرە عەرەبەکانی تر شیعر یا وتاری بۆ نووسین
- ئەم قەسیدەیەی شاعیر قەسیدەی سەرەکیی دیوانێکێتی بەناوی (حديقة علي) ەوە کە لە هەشتاکاندا چاپ کراوەو منیش کاتی خۆی کردوومە بە کوردی و بە شاعیر خۆشیم وتبوو کە ئەو قەسیدەیەیم بۆ کوردی تەرجەمە کردووە و زۆری پێ خۆش بوو، ئەمەش یەکەم جارە قەسیدەکە هەمووی بڵاوبێتەوە

وەرگێڕ

## ئەدەبی نامە

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەکانی چیخۆف و ئۆلگاکنیپەر

لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

**چیخۆف**

11 دیسامبەر

"برست" 4ی دوای نیوەڕۆ

گەیشتوومەتە "برست" هەموو شتێك چاکە، خۆر لە هیچ جێگایەکەوە دیارنیە، هیوادارم تەندروست و بەختەوەربیت.

ئا. چیخۆف

★★ ★★★ ★★

**چیخۆف**

12 دیسامبەر

"ڤیەنا"

ئازیزم، تەواو هەست بە گەمژەیی دەکەم، هەرکە گەیشتمە ئێرە بینیم هەموو پیشانگاکان بە بۆنەی جەژنی کریسمسی ئەڵمانیاوە[1] لە پشوودان، لەبەرئەوە بێکار لە ژوورەکەمدا دانیشتووم و نازانم چی بکەم، سەد جار نەفرەت لە خۆم دەکەم(...) هەندێك لە ڕستوورانەکان کراونەتەوەو پڕن لە کەسانی کەشخە کە من لە نێوانیاندا وەکوو داهۆڵ دەنوێنم. کەواتە چی بکەم؟

سبەی بەرەو نیس دەچم، زۆر بە حەسرەتەوە لە قەرەوێڵە دوو کەسیەکەی ناو ژوورەکەم دەڕوانم، دەبێت بنووم و خەون ببینم! تاقە خەمم ئەوەیە کە تۆ لێرە نیت خۆشەویستم، تووتکە سەگەکەم، گیانە شیرینەکەم. ڕۆژانی "مۆسکۆ"ت چۆن دەگوزەرێت؟ پرۆڤە دەکەیت؟ پرۆڤەکانتان چووەتە پێشێ؟ هەرە ئازیزم، بە دوورو درێژی لەسەر ڕۆژانی خۆتم بۆ بنووسە. ئەگینا خوا خۆی دەزانێت چیم بەسەردێت!

لە "برست"ەوە تا "ڤیەنا" هەواڵی بەفر نیە، ئەمڕۆ زەوی وەك ڕۆژانی بەهار تەڕ بوو، هەر لە زستان ناچێت، هەموو هاوسەفەرەکانم جاڕزن، بۆ

نانی نیوەڕۆو شێوکردن دەچمە خواریٚ، تیاماوم چ ناوێکی لێبنێم، دیسانەوە دەمەوێت بڕۆم بخەوم، ماچی هەراو، دەستەکانت دەگوشم، خانمە چکۆڵەکەی خۆم، کە گەیشتمە "نیس" دەڕۆمە دایەرەی پۆست بەڵکو تا ئەوکاتە نامەیەکتان گەیشتبێت.

نامەم بۆ بنووسە، چکۆڵەکەم.

ئانتەکەت

** *** **

**کنیپەر**

12 دیسامبەر

"مۆسکۆ"

ئازیزەکەم تۆ ئێستا لە ڤیەنای (...) پێش سەعات 12 لە شانۆوە گەڕامەوە، نانم خوارد، جلەکانم داکەند، خۆم شۆرد، ڕۆبەکەم لەبەرکردو دانیشتم تا نامەت بۆ بنووسم. ئەگەر گەلێك شەکەت نەبم هەموو شەوێك ئەم کارە دەکەم، سبەی یان دوو سبەی حەتمەن یاداشتێکی تۆم بەدەست دەگات (...) بەبیٚ تۆ هەموو شتەکان بەتاڵن، زۆر بەتاڵن، ئێستایش زۆر بە ڕوونی دەمو چاوت بە گەشی دەبینم، هەروەها دەنگیشت زۆر بە ڕوونی دێتە گویێم (...).

** *** **

**کنیبەر**

12 دیسامبەر

"مۆسکۆ"

ڕۆژباش ئانتون. هێشتا بەڕێوەیت؟ سبەینیٚ دەگەیتە "نیس" خۆرو دەریاو سەوزەلانی دەبینیت، خۆزگەم بە خۆت، دوای "مەلی دەریا" کە لە شانۆ گەڕامەوە پۆست کارتەکەتم کە لە "برست"ەوە ناردبووت بینی، نوقمی شادمانی بووم (...) ئازیزم، ئەمڕۆ پرۆڤەیەکی شکۆدارانەی "سیٚ خوشکەکە"مان کرد، وردە وردە دەکەوینە ناو گەرمای هەستی "سولیونی" "چیبورتی کین"[2] و "ناتاشا" و "ئیرینا" و خۆمەوە[3] شێوازی بەڕێداڕۆیشتن فێربووم، بە دەنگێکی هێورو لە سینەوە قسە دەکەم، وەك خۆت دەیزانیت بەو دەنگە زبرو بە هەوایانەی ژنە خانەدانەکان هەیانە، وەلیٚ نیگەران مەبە زۆر پێی لێداناگرم. دوێنیٚ "مەلی دەریا"مان نمایش کرد، قازانجەکەی بۆ یارمەتیدانی ئەو سەربازانە بوو کە لە شەڕ[4] گەڕاونەتەوە.

خەڵکەکە زۆر پێکەنین. منداڵێکی تەمەن چوار ساڵان لەناو بینەراندا بوو، بەردەوام قسەی خۆشی دەکرد، کە دیکۆری پەردەی یەکەمی بینی بە دەنگی بەرز وتی: "دایکە هەستە با بچینە ناو ئەو باخەوە کەمێك ڕاکەڕاکە بکەین" دیارە هەموو بینەران دایانە پێکەنین.

"لەویٚ سەماوەر دانراوە" "ئەو ژنە ئاودەخواتەوە" (بە ئێمەی دەوت لە پەردەی سێیەمدا) ئێمە لەسەر شانۆکە بە زۆر خۆمان پێدەگیرا (...).

** *** **

**چیخۆف**

14 دیسامبەر

"نیس"

ئەکتەری ناوازەو گچکەی خۆم، فریشتەکەم، جوەکەم، ڕۆژباش، کە گەیشتمە "نیس" نانم خوارد، پاشان یەکەم کارم نامەنووسین بوو بۆ تۆ..

سەرم لە شەکەتی سەفەر گێژدەخوات، ئەمڕۆ نەمتوانیوە هیچ بنووسم، بەیانی دەست پێدەکەم، وەلیٰ بۆ ئەمڕۆ دە هەزار جار ماچت دەکەم کیژۆڵەکەم، لە دەرەوە نمەنمە بارانە، وەلیٰ هەوا گەرمو دڵگیرە، گوڵەکان چرۆیان کردووەو هەموو لایەك پڕ لە گوڵە، باوەڕناکەیت، هەموو لایەك پڕە لە گەنج، بەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردایە، تەنانەت کڵاوبەسەر کەسیانەوە نیە (...).

"ڤیەنا" وەڕز کەرە، دەرگای پیشانگاکان هەموو داخرابوونو من لەسەر قسەی تۆ لە ئوتێل "بریستول" -کە چاکترین ئوتێلی ئێرەیە- مامەوە، ئەمانە زۆر مۆنو نەگریسن، ڕێگەنادەن لە هۆڵی نانخواردندا ڕۆژنامە بخوێنیتەوە، هەموویان بەرگی ڕەسمیان لەبەردایەو من لە نێوانیاندا لە لادێیی دەچم، بە شەمەندەفەری خێرای پلە یەك لە "ڤیەنا"وە کەوتمەڕیٰ (...)، واگۆنێکی تایبەتیم بۆ خۆم گرت.

دڵدارە ئازیزەکەم، تەندروست بیت، خوداو فریشتەکانی ئاسمان ئاگادارت بن، تەنانەت بۆ چرکە ساتێکیش ئێمەت لەبیر نەچێت. بۆم بنووسەو پێم بڵیٰ پرۆڤە چۆن دەڕواتە پێشیٰ (...) ئەمەت لێدەخوازم.

**ئانتەکەت**

★★ ★★★ ★★

**کنیپەر**

24 **دیسامبەر**

**"نیس"**

دوێنیٰ نەمتوانی نامەت بۆ بنووسم ئازیزەکەم، درەنگ چوومە ناو جێگاو سەرم دەیویست بتەقێت (...) ئەمڕۆ حاڵم چاکترە.

ئازیزم، لە کاتێکی باشدا ڕۆیشتیت، ئەمڕۆ 14 پلە لەژێر سفرەوەیەو هەوا زۆر ساردە! لەم سەرما سەختە بێزارم، پەکم دەخات، تۆ لە "نیس"یت، سەرمات نیە، خۆشی لە خۆت، بۆم بنووسەو پێم بڵیٰ چۆنیت، ئایا لە جێدا کەوتوویت، ژوورەکەت چاکە، ڕووناكو گەرمە؟ چونکە لە باشووردا ئاسایی لە زستاندا ژوورەکان ساردن (...).

هەمیشە بیرم لاتە، باشتری بڵێم تۆ هەمیشە لەگەڵمایت بۆ هەر کوێیەك بچم. ئاخ بۆ بەهار، بەهار.

★★ ★★★ ★★

**چیخۆف**

15 **دیسامبەر**

**"نیس"**

ئازیزم، بە لاتەوە سەیرە، بەڵام من هەست دەکەم پێم ناوەتە سەرمانگ، هەوا گەرمەو هەتاو هەموو لایەکی داگیرکردووە، ناتوانیت پاڵتاو لەبەر بکەیت، خەڵکی وەك هاوین بە هەموو شوێنێکدا دەگەڕێن، پەنجەرەی ژوورەکەم وەك دڵم کراوەتەوە.

خەریکم شانۆنامەکەم دەنووسمەوە، پێم سەیرە کە چۆنو بە چ هۆکارێك دەتوانم ئەم درامایە بنووسم.

ئای دڵدارەکەم بۆ لێرە نیت؟ دەبوو لێرە بیتو بحەسێیتەوە، گویٰ لە گۆرانی بێژو موسیقارەکانت بگریت کە جارجارە لە دەرەوە دەردەکەون، لە هەموو ئەمانە چاکتر ئەوەیە کە دەت توانی لەبەر خۆری ئێرەدا خۆت گەرم بکەیتەوە. پێم خۆشە ئێستا بڕۆمە ڕۆخی دەریاو ڕۆژنامە بخوێنمەوە، پاشان بگەڕێمەوە ژوورەکەمو بنووسم، سبەی

پەردەی سێیەم‌و دوو سبەی پەردەی چوارەم بۆ "نمیروڤیچ" دەنێرم. ڕەنگە هەردووکیان پێکەوە بنێرم، گۆڕانێکم بەسەر پەردەی سێیەمدا هێناوە، بە کورتی هەندێك شتی ترم لێ زیادکردووە.

ئازیزم، وێنەم بۆ بنێرە، گەورەیی بنوێنەو بینێرە، هەموو لایەك پڕە لە مێش (...).

لە ئامێزت دەگرم، هەزار جار ماچت دەکەم، شپرزەی نامەیەکی تۆم، نامەیەکی دوورو درێژ، سەرم لە بەرانبەرتدا دادەنەوێنم‌و بۆت دەکەومە سەرچۆك.

**ئانتەکەت**

** *** **

## کنیپەر

**16 دیسامبەر**

**"مۆسکۆ"**

هەر ئێستا لە پرۆڤە گەڕاومەتەوە، سەرما بەستوومی‌و بێ تاقەتم، لە ئاوو هەوای وادا گەلێك سست دەبم، 27 پلە لەژێر سفرەوە، وێنای دەکەیت؟ مرۆڤ شێت دەکات. لەسەر شەقامەکە کەوتمە گریان. چاوم دایە ئێش، گۆنام، لێوم، هەموو لەشم دەیەشێت. لەوە دەچێت توانام تیا نەمێنێت.

نامەکەی ڤیەنات کە چاوەڕوانیم دەکرد گەیشتە دەستم (...) بۆ ئەوەندە ناڕەحەتیت؟ دەتوانیت ڕێگای خۆت لەناو ئاپوورەی ئاهەنگ گێڕاندا بدۆزیتەوە، دەت توانی ئەو شتانە بکڕێت کە لە شتەکانی "نیس" باشترو هەرزانترن. ئایا ناچار بوویت لە ژوورەکەتدا خۆت زیندانی بکەیت؟ نەچوویت لە شەقامی "ڕینگ ستراسە"[5]دا پیاسە بکەیت؟ نەچوویت بۆ شانۆ؟ لە ڕاستیدا تۆسلاڤیەکی بەنازو نوکیت. نەدەبوو بهێڵم بچیت بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام بێ گاڵتە. لە خۆراوادا مرۆڤ هەست بەبێ کاری دەکات. من لە "ڤیەنا"دا هەستم بە تەمەڵی‌و تەوەزەلی دەکرد، خەڵکی ئەوێ زۆر شیکن، خێراو بە جوانی بەلاتدا تێدەپەڕن. ڕووسەکان لە هەندەران گەلێك پەڕپووت دێنە بەرچاو (...).

ئاخری تۆلستۆی بۆ بینینی "شەوی چیخۆف" هات، دەڵێن ئەمەندە پێکەنیوە خەریك بووە لە هۆش خۆی بچێت. زۆری پێخۆشبووە.

** *** **

## چیخۆف

**17 دیسامبەر**

**"نیس"**

**یەك شەممە. لە بیرم نیە چەندی مانگە**

سێ شەوە لە (نیس)م‌و تا ئێستا دێڕێك نووسینی تۆم پێنەگەیشتووە (...) ئولیای ئازیزم، ئەوەندە تەمەڵ مەبە، فریشتەکەم، نامەیەك بۆ ئەم پیرەمێردە بنووسە، ئێرە گەلێك دڵفرێنە. ئاوو هەوا زۆر زۆر خۆشە. لە دوای "یاڵتا"وە ئەم دیمەنی دەشت‌و دەرە لە بەهەشت دەچێت. چاکەتێکی هاوینەم کڕیوەو پۆزی پێوە لێدەدەم. دوێنێ پەردەی سێیەمم بۆ مۆسکۆ ناردو سبەینێش چوارەم پەردە دەنێرم. گۆڕانێکم بەسەر پەردەی چوارەمدا هێناوەو دیالۆژەکانی تۆم زیاتر کردووە (دەست خۆشیم لێ بکە) پاشان بۆم بنووسەو بیڵێ پرۆڤەکان چۆنن، لە بارەی هەموو شتێکەوە پێم بڵێ. لەبەر ئەوەی تۆ بۆم نانووسێت منیش دەستم ناچێتە هیچ کە بۆتی بنووسم. ئیتر ئەمە دوانامەی منە (...).

ئەگەر "ڤیشنیڤسکی" داوای ئادرەسی کردم بیدەرێ.

ئەمانە لێرە هەر دەرخواردت دەدەن، دوای نانی نیوەڕۆ دەبێت چاوێك گەرم بکەیت‌و هیچ کارێك نەکەیت. هەرگیز ئەمە باش نیە، دەبێت کەم بخۆم‌و بەرنامەی ڕۆژانەم بگۆڕم.؟

دانیشتوانی پانسیۆنەکە روسین‌و تەواو وەڕسکەرن. زۆربەیشیان ژنن.

لە ئامێزت دەگرم‌و ماچی گەورەت دەکەم، فەرامۆشم مەکە، هەفتەی جارێك یادم بکە. جارێکی ترو جارێکی تریش لە ئامێزت دەگرم.

ئانتونیوکەت

** *** **

کنیپەر

18 دیسمبەر

"مۆسکۆ"

بمبوورە کە نامەکەم بە قەڵەم نووسیوە. ئازیزەکەم. من ئەمڕۆ لەتاو نەخۆشی قەسەبات هەر لەناو جێگادا بووم، پزیشکی شانۆ هات، وردبینی لێکردم، وتی گەرووم هاتۆتەوەیەك بەڵام تووشی قەسەبات نەهاتووم، کەمێك تایشم بەرزە، نازانم دەتوانم بەیانی دەور لە "مرۆڤە تەنیاکان" و دووبەیانی لە "مردووەکان"دا ببینم یان نا، بڕیارە جارێکی تر پزیشکەکە بێتەوە لامو هەواڵەکەیش بە شانۆ بگەیەنێت. ئەوان نیگەرانن "نمیروڤیچ" لە پترۆزبورگ گەڕایەوەو هات بۆ هەواڵ پرسینم. پلەی تایەکەم 37.5 و کۆکەڕەشەمە، هەڵبەتە دەتوانم دەورەکە ببینم بەڵام دوای ئەوە چی؟ ماوەیەکە باش نیم. سێ جار گرتوومی بەڵام بە خواردنی جۆراوجۆر تێم پەڕاندووە، دوێنێ زۆر خراپ بووم. بە حاڵە حاڵ لە شانۆ گەڕامەوە ماڵەوە، تەنانەت نەمتوانی نامەیەکت بۆ بنووسم، نەمدەزانی چۆن دەتوانم شەو لە "خاڵ ڤیانیادا" دەور ببینم، دەنگم گیرابوو، بەڵام پەردەی دووەمم باش‌و دەوری جیاجیام بینی. دوێنێ کۆمپرێسەرتەرپەنتینم خستە سەر سنگم، چام لەگەڵ ڕومدا خواردەوە، ئەمڕۆ هەر لەناو جێگادام، گەلێك بێزارو ماندووم (...).

بۆ نامەیەکت بۆ نەناردووم؟ نە دوێنێ‌و نە ئەمڕۆ هیچ دیارنیە، دەتوانی چەند دێڕێك بنووسیت. سەرلەبەیانی ئەمڕۆ هەر بە هەوەس نامەم بۆ نەنووست چونکە چاوەڕێی نامەی تۆ بووم، وا خەریکە خۆرئاوا دەبێت‌و هێشتا هیچ نەهاتووە. دەزانیت ئازیزم فڕوفێڵ کردن بۆ تۆ چاك نیە.

تا ئێستا لە نیسەوە هیچ نامەیەکی تۆم پێنەگەیشتوە، چۆنیت؟ تەندروستیت چۆنە؟ باری دەروونیت لە چیدایە؟ ئایا پیاسە دەکەیت؟ کاتی خۆت چۆن دابەش کردووە؟ ئایا بەم زوانە دەست بە نووسین دەکەیتەوە؟ بۆ چەند دێڕێك بۆ دایکت نانووسیت؟ من گەوجانە درکاندم کە نامەیەکم لەتۆوە بۆ هاتووەو لە تاوا زوو لێی بێدەنگ بووم. هەستم کرد پێی ناخۆشبوو. تۆ هەمیشە یەکەمجار نامەت بۆ ئەو دەنووسی. بۆ ئێستا ئەو شتانەت لەبیرکردووە؟ ئەو وا دەزانێت لەبەر منە کە تۆ ڕەفتارت لەگەڵیدا گۆڕاوە. تکایە لەگەڵیدا میهرەبانتر بە. ئەو تۆی خۆش دەوێت. پەیوەندی ئێوە هەمیشە لەگەڵ یەکتردا چاك بووە، ئەی بۆ وا گۆڕاویت؟ کەواتە ئازیزەکەم نامەی بۆ دەنووسیت؟ نووسین بە پاڵکەوتنەوە گەلێك ناخۆشە، لەبەرئەوەیە دەبێت تەواوی بکەم. "درسدن"ت لەبیرە؟ خەون بە هاوینەوە دەبینیت؟ ماچت دەکەم، تاقە ئازیزم، بنووسەو بنووسەو ئەم کیژە تووتکەی خۆتت خۆش بوێت.

** *** **

**کنیپەر**

**19ی دیسامبەر**

**مۆسکۆ 8ی دوای نیوەڕۆ**

ئیَ، ئانتونیوی ئازیزم، دواجار نامەی تۆم لە "نیس"ەوە پێگەیشت. لە نامەکەتدا دیارە کە گوڵەکان پشکوتوون، ئاووهەوا گەرمو خۆشە، نامەکانت بە شەوقن، ئەگەرچی دەبوایە وەك شەیتان زۆر ماندوو بیت لەدەست سەفەرو ئەو ڕوسیە تەمبەڵانەی تەنانەت لە شەمەندەفەری دەرەوەیشدا لێت بوون بە مووی لووت. بەڵام من عاشقی ئەو رووسانەم!

من ئەمڕۆیش لەناو جێگادام، پزیشکەکە دوو جار هاتو هەموو جارێك ڕاچێتی نووسی (...) کۆکەیەکی زۆر خراپم هەیەو بەڵغەمم خەستە، شەو مشەما لە سنگم دەگرم، پزیشکەکە دەیوت سپڵت پەرێشانە منیش پێکەنینم پێدەهات. "نمیرۆڤیچ" هاتو قژی شانە کردم، ئەمڕۆ لە باتی "مرۆڤی تەنیا". "فیودور" نمایش دەکەن، سبەی "مردووەکان" لە باتی "ترسناك" نمایش دەکەن. ئەم کارە بۆیان نزیکەی 7-8 هەزار ڕۆبل زیانی هەیەو هەموویشی لەبەر من، بەم پێیە من تا بیستۆ شەشی مانگ دەور نابینم.

لەبەر پرۆڤەکانی "سیَ خوشکەکە" گەلێك ناڕەحەتم، تا دوو ڕۆژی دی بە چاکی خۆم دەپێچمەوەو دەچم بۆ شانۆ. من هەر کەوتووم، دەخوێنمەوە، دەحەسێمەوە، ئاسوودەمو چ ناڕەحەتیەکم نیە (...).

** *** **

**کنیپەر**

**20 دیسامبەر**

**"مۆسکۆ"**

هێشتا هەر بە قەڵەم دەنووسم ئانتونی ئازیزم، هێشتا هەر لەناو جێدام، ئەم سەرمایە لە کۆڵم نابێتەوە، دویَ شەو چاوم نەناوەتە سەریەك، کتێبم خوێندەوە، سەرمایەکی زۆر سەختو گەمژانەیە — نازانم بۆچی سەرم وەك قوڕقوشم قورسە— کۆکەم باشترەو خورانی گەرووم کەمترە. لە ژوورەوە ناچمە دەریَ، خۆم باش پێچاوەتەوەو "ئاپومورفین" دەخۆم، ئاگام لە شانۆ نەماوە "ترسناك" خرابووە شوێنی "مردووەکان" وەلیَ سکرتێری شانۆ هاتو وتی "مایرهۆڵد" گەرووی هاتۆتەوە یەكو ناتوانێت دەور ببینێت. ئیتر چی بەمە دەڵێیت؟ گریمانەی ئەوە هەیە کە نمایشەکە دوابخەن، لەوە ناچێت سەرمایش ئەوەندە سەخت بێت.

دەمەوێت بتبینم ئانتون، لەگەڵتا بدوێم، لە پاڵتا دابنیشم، چاو لە چاوت ببڕم، تۆ کاتت چۆن بەسەردەبەیت؟ حەزم لە خوێندنەوەی شیعری زۆر جوانو قووڵە، "هاینە" بە دەستەوە دەگرمو کتێبی "گۆرانیەکان"[6]ی ئەو دەخوێنمەوە، چونکە زۆرم خۆش دەوێت (...).

** *** **

**چیخۆف**

**21 دیسامبەر**

**"نیس"**

نامەکەتم بەدەست گەیشت ئەکتەرە چکۆڵەکەم (...) نمایشنامەکە تەواو بووەو بۆم ناردوون. بۆ ڕۆڵی تۆ لە پەردەی چوارەمدا گەلێك شتم لیَ

زیادکردووه. له ڕاستیدا که دهگهمه سهر ڕۆڵی تۆ ئیدی ئهوهنده توانا بهکارناهێنم، ههموو توانام، دهربارهی پرۆڤهکان بۆم بنووسهو بڵێ بزانم ئایا شوێنی وای تێدایه که تێی نهگهین، ئایا "نمیروڤیچ" دێت بۆ "نیس"؟ ئهگهر وا بوو کهی دێت؟ من لهناو خهڵکێکی گهلێك ئاپوورهدا نان دهخۆم، تا ڕادهیهك ههموویان ژنن‌و زۆریشن. هێشتا نهچووم بۆ مونت کارلو.

بارلینه چکۆڵهکهم ژیان بهبێ تۆ وهرسیه (...).

ئێستا دوو ژوورم ههیه، یهکێکیان گهورهو ئهوی دی بچووکتره. ههرچهنده دهچمه ژوورهوه قهرهوێڵهکهم دهمهێنێته پێکهنین. زۆر گهورهو نهرم‌و پانه، کهمێك به فهرهنسی قسه دهکهم، بهڵام ههمیشه لهبیرم دهچێتهوه که چهنده کهمی لێدهزانم. زۆرجار خهوت پێوه دهبینم، که چاو دهنووقێنم، تۆ زۆر ڕوونتر دهبینم. تۆ ئهو ژنهی که پێویستم پێیهتی.

تهندروست بیت، خۆشهویستهکهم، خودای ئافهریدهمان ئاگای لێت بێت. شادو کارامه بیت. بههار وهره بۆ ئێره، شتێکم بۆ گوێچکهت ههیه. ماچێکی گهوره. ئامێزێك‌و ماچێکی دی.

ئانتو نیوی تۆ

بۆم بنووسهو له بارهی گشت پرۆڤهکانهوه شتم پێ بڵێ.

ساڵی نوێت پیرۆز، لێره ساڵی نوێیه، سێیهم ڕۆژی ژانۆیه. بهم زوانه بههار دهگات.

** *** **

**کنیپهر**

**23ی دیسامبهر "ژانویه"**

**"مۆسکۆ"**

دوێنێ منت چهواشهکرد نووسهری ئازیزم، تا 17 دیسامبهر نامهی منت پێنهگهیشتووه که به لایهنی کهمهوه دهبێت دوو نامهت بهدهست گهیشتبێت له کۆی ههشت نامه که بۆم ناردوویت. سهیره! له وهڵامی ئهم نامهیهدا پۆست کارتێکم بۆ بنووسه. ڕهنگه وا چاکتر بوایه که نامهکانم به پۆستی "رستانت"دا بۆ بناردیتایه. نهدهبوو به قسهم بکردیتایه، ههرچهنده گوم بوونی نامه له ههندهران خۆی بۆ خۆی قسه ههڵدهگرێت.

ئهمه یهکهم ڕۆژمه که چهند ههنگاوێك له ژوورهکهمدا دهگهڕێم. تهندروستیم باشتره، بهڵام زۆر بێهێزم، دوێنێ چاك نهبووم بۆیه نامهم بۆ نهنووسیت. دهبێت له بیست‌و شهشی مانگدا لهسهر شانۆ بم. لهم کهوتنی ناو جێگایه وهڕز بووم (...).

دهتهێنمه بهرچاوم به چاکهتی هاوینهوه پیاسهی سهرشهقامهکان دهکهیت، له کهنار دهریای درهخشاندا دادهنیشیت، له پانسیوندا ئهو ژنه وهڕزکهرانه کۆدهکهیتهوه. ههوڵی خواردنی زۆرو حهسانهوهیهکی درێژی دوای نانی نیوهڕۆ بده، زیانی نیه، وهك خووت پێوهگرتووه خۆت به برسیهتیهوه ماندوو مهکه، حهزدهکهم تۆ به چاکی‌و خۆشی ببینم، تێگهیشتی دڵدارهکهم؟ به ڕاست پێویست دهکات خهڵکی زۆر لهوێ ببینیت؟

ههموو شتێکم بۆ بنووسه. له بارهی پرۆڤهکانهوه ناتوانم شتێکی وا بنووسم. شهش ڕۆژه نهچووم بۆ شانۆ، پزیشکهکهمان دهیوت دوێنێ ئهکتهرهکان پهردهی دووهمیان به شهوق‌و توانایهکی زۆرهوه تا سهعات یهکی شهو پرۆڤه کردوه (...)

وێنەیەکی خۆت بگرەو بۆم بنێرە. هەموو شتێکی خۆشەویستانەی لەسەر بنووسە. دوور لە چاوی هەموو دەیپارێزم (...)

** *** **

## پەراوێزەکان:

1-بە هۆی جیاوازی ڕۆژژمێری ڕوسیا لەگەڵ وڵاتەکانی تری خۆراوا، 12ی دیسامبەر لای چیخۆف 25ی دیسامبەری نەمسایە.

*2-cheburtykin*

3-ناوی کەسایەتیەکی ناو شانۆنامەی "سێ خوشک" ئۆڵگایە. مەبەستی لە خۆم ئۆڵگای ناو نمایشنامەکەیە.

4-مەبەست شەڕی ڕووس و ژاپۆنە.

*5-Ringstrass*

*6-Buchder leider*

## سەرچاوە:

کتێبی (دلبند عزیزترینم) ل 89-99.

# فایلی ژماره



## ئەدۆنیس: شاعیر، بیریار و تیۆریست

- ژیانێکی پڕ بەرهەم
- یەکەمین دیدارم لەگەڵ "ئەدۆنیس"دا لە ستۆکهۆڵم
- چەند سەرنجێك سەبارەت بە ئەزموونی شیعریم
- (ئەدۆنیس)ی ڕەخنەگر
- هەڵنانی سەربەستیو ئارەزووەکان بەبێ هیچ پابەندییەك
- لە بازنەوە بۆ ئاسۆ
- یادەوەریی، شوناس، مۆرك...
- دوو گفتوگۆ لەگەڵ "ئەدۆنیس" دا
- لەچاوی دڵەوە بۆ نائاگایی!
- شیعر و فەلسەفە
- ئەدۆنیس وەك نیگارکێش
- ئەدۆنیس و نوێکردنەوەی ئەقڵی عەرەبی
- ئایا "ئەدۆنیس" شایەنی خەڵاتی نۆبڵە؟

# ژیانێکی پڕ بەرهەم


ئەدۆنیس


ئەدۆنیس و دایکی


ئەدۆنیس لەگەڵ خێزانەکەیدا

**عەلی ئەحمەد سەعید ساڵی 1930 لە گوندی (قەسابین)ی سوریا لەدایکبووە. نازناوی (ئەدۆنیس)ی داوەتە خۆیو بەوجۆرە لە نەریتەکانی ناونانی عەرەبی چۆتە دەرەوە. ئەدۆنیس لەسەر خوێندنی زانکۆ- بەشی فەلسەفەی زانکۆی دیمەشق بەردەوامبووە. ساڵی 1956 ڕوویکردۆتە بەیروتو دەستیکردوە بە ژیانی شیعریو ڕۆشنبیریی جیدیو بڕیاردەرانە، ئەوەش لەڕێگەی بەشداریکردنی بەردەوامەوە لە گۆڤاری شیعرداو لەگەڵ (یوسف ئەلخال)دا. ساڵی 1968 گۆڤاری (مواقف)ی دامەزراندوە کە ڕۆشنبیرانو شاعیرانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوای لە چواردەوری خۆی کۆکردەوە. ساڵی 1985 بەهۆی هەلومەرجی جەنگەوە بەیروتی جێهێشتوەو ڕوویکردۆتە پاریس. ساڵی 1986 خەڵاتی گەورەی لە برۆکسل وەرگرتوەو دواتر لە ئۆکتۆبەری 1997دا خەڵاتی تاجی ئاڵتونی شیعری مەکەدۆنیای وەرگرتوە.**

**-قەسیدەکانی سەرەتا، چاپی یەکەم، دار مجلة الشعر بیروت،** 1957.
**چاپی سێیەم، دار العودة، بیروت،** 1970.
**چاپی چوارەم، دار العودة، بیروت،** 1971.
**چاپێکی نوێ، دار الآداب، بیروت،** 1988.
**-گەڵاکان لە ڕەشەبادا، چاپی یەکەم، دار مجلة الشعر بیروت،** 1958.
**چاپی دووەم، دار مجلة الشعر بیروت،** 1963.
**چاپی سێیەم، دار العودة، بیروت،** 1970.
**چاپی چوارەم، دار العودة، بیروت** 1971.
**چاپێکی نوێ، دار الآداب، بیروت،** 1988.
**-گۆرانیەکانی مهیاری دیمەشقی، چاپی یەکەم، دار مجله الشعر بیروت،** 1961.
**چاپی دووەم، دار العودة، بیروت،** 1970.

چاپی سێیەم، دار العودة، بیروت، 1971.

چاپێکی نوێ، دار الآداب، بیروت، 1988.

-کتێبی وەگۆڕانەکانو کۆچکردن لە هەرێمەکانی ڕۆژو شەودا، چاپی یەکەم، المکتبة العصرية، بيروت، 1965.

چاپی دوەم، دار العودة، بيروت 1970.

چاپێکی نوێ، دار الآداب، بيروت، 1988.

-شانۆو ئاوێنەکان، چاپی یەکەم، دار الآداب، بيروت 1968.

چاپێکی نوێ، دار الآداب، بيروت، 1988.

-کاتێك لەنێوان خۆڵەمێشو گوڵدا، چاپی یەکەم، دار العودة، بيروت، 1970.

چاپێکی نوێ، دار الآداب، بيروت، 1988.

-ئەوە ناوەکەمە، دار الآداب، بيروت، 1980.

-تاك بەشێوازی کۆ، چاپی چوارەم، دار العودة، بيروت، 1977.

چاپێکی نوێ، دار الآداب، بيروت، 1988.

-کتێبی پێنج قەسیدەکە، چاپی یەکەم، دار العودة، بيروت 1979.

-کتێبی گەمارۆدان، دار الآداب، بيروت، 1985.

-ئارەزوویەك لەنەخشەکانی ماددەدا پێش دەکەوێت، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء 1987.

-پێشوازیکردن لە شتە ڕوونە ئاڵۆزەکان، دار الآداب، بيروت، 1988.

-ئەلفوبایەکی دیکە، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء، 1994.

-کتێبەکە دوێنێو شوێنەکە ئیمڕۆ- دار الساقي، بيروت- لندن، 1995.

-هەڵبژاردەیەك لە شیعری یوسف ئەلخال، دار مجلة شعر، بيروت، 1962.

-دیوانی شیعری عەرەبی- کتێبی یەکەم، المکتبة العصرية، بيروت، 1964.

-دیوانی شیعری عەرەبی- کتێبی دووەم، المکتبة العصرية، بيروت، 1964.

-دیوانی شیعری عەرەبی- کتێبی سێیەم، المکتبة العصرية، بيروت، 1968.

-هەڵبژاردەیەك لە شیعری ئەلسەیاب، دار الآداب، بيروت، 1967.

-هەڵبژاردەیەك لە شیعری شەوقی (لەگەڵ پێشەکیەك)، دار العلم للملايين، بيروت 1982.




–هەڵبژاردەیەك لە شیعری ئەلرسافی (لەگەڵ پێشەكیەك)، دار العلم للملایین، بیروت 1982.

–هەڵبژاردەیەك لە ئەلكەواكبی (لەگەڵ پێشەكیەك)، دار العلم للملایین، بیروت 1982.

–هەڵبژاردەیەك لە محەمەد عەبدە (لەگەڵ پێشەكیەك)، دار العلم للملایین، بیروت 1983.

–هەڵبژاردەیەك لە محمەد ڕەشید ڕەزا (لەگەڵ پێشەكیەك)، دار العلم للملایین، بیروت 1983.

–هەڵبژاردەیەك لە شیعری ئەلزەهاوی (لەگەڵ پێشەكیەك)، دار العلم للملایین، بیروت 1982.

(ئەو شەش كتێبەی دوایی بەهاوكاریی خالیدە سەعید ئەنجامدراوە)

–شانۆی جۆرج شەحادە:

حیكایەتی فاسكۆ، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1972.

مستەر بوبل، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1972.

فێستیڤاڵی بریسبان، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1973.

وەنەوشە، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1973.

سەفەركردن، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1975.

ئاهەنگەشەوی نموونەكان، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1975.

كۆكاری شیعری سان جۆن پێرس، دمشق 1976.

تاراوگەو قەسیدەكانی تر، وقزراة الثقافةء الارشاد القومی، دمشق 1978.




شانۆی ڕاسین.

فیدەرو تراژیدیایەكی باش یان دوو برا دوژمنەكە، وەزارەتی ڕاگەیاندنی كوەیت، 1979.

كۆكاری شیعریی ئیف بونفوا، وەزارەتی ڕۆشنبیریی دمشق 1986.




## –كۆكارەكانی ئەدۆنیس:

كۆكاری شیعریی ئەدۆنیس، چاپی یەكەم، دار العودة، بیروت 1971.

چاپی دووەم، دار العودة، بیروت 1975.

چاپی سێیەم، دار العودة، بیروت 1985.

چاپی پێنجەم، دار العودة، بیروت 1985و 1988.

–پێشەكیەك بۆ شیعری عەرەبی، چاپی یەكەم، دار العودة، بیروت 1971.

چاپی پێنجەم، دار الفكر، بیروت 1986.

-کاتی شیعر، چاپی یەکەم، دار العودة، بیروت 1972.

چاپی سێیەم، دار الفکر، بیروت 1979.

-نەگۆرو بگۆڕ: توێژینەوەیەك لەبارەی لاساییکردنەوەو داهێنانەوە لای عەرەب.

چاپی حەوتەم (چاپێکی نوێی پاککراوو فراوانکراو لە چوار بەرگدا).




## بنەچەکان:

-ڕەسەنکردنی بنەچەکان.

ڕاچڵەکینی نوێکاریو دەسەڵاتی میراتی ئایینی.

دەسەڵاتی نوێکاریو دەسەڵاتی میراتی شیعری، دار الساقی.

-دەروازیەك بۆ کۆتایی سەدەکە، چاپی یەکەم، دار العودة، بیروت 1980.




-سیاسەتی شیعر، دار الآداب، بیروت 1985.

-شیعرییەتی عەرەبی، دار الآداب، بیروت 1985.

-ئاخاوتنی سەرەتاکان، دار الآداب، بیروت 1990.

-سوفیزمو سوریالیزم، دار الساقي، بیروت 1992.

-دەقی قورئانیو ئاسۆکانی نووسین، دار الآداب، بیروت 1993.

-سیستەمو ئاخاوتن، دار الآداب،بیروت 1993.

-ئەوە تویت ئەی کات، دار الآداب، بیروت 1993.

## خەڵاتەکان:

-خەڵاتی شیعری لوبنانی سوری- دیداری شیعری نیودەوڵەتی لە بیتسبۆرگ- ئەمریکا 1971.




-خەڵاتی ژان مارلیو بۆ ئەدەبەکانی بیانی- فەڕەنسا 1993.

-خەڵاتی ڤیرونیا سیتا دی فیامو ڕۆما- ئیتاڵیا 1994.

-خەڵاتی نازم حیکمەت، ئەستەنبوڵ-1995.

-خەڵاتی دەریای ناوەڕاست بۆ ئەدەبی بیانی- پاریس.

-خەڵاتی دیداری ڕۆشنبیریی لوبنانی- پاریس 1997.

-خەڵاتی تاجی ئاڵتونی شیعر، مەکەدۆنیا 1998.

-خەڵاتی لیریسی بیا، ئیتاڵیا2000.

# یەکەمین دیدارم لەگەڵ "ئەدۆنیس"دا لە ستۆکهۆڵم

شێرکۆ بێکەس



بۆ یەکەمجار لەڕێی گۆڤاری "شعر"ی لوبنانیەوە شیعری "ئەدۆنیس"م ناسی. دوابەدوای خوێندنەوەی هەر قەسیدەیەکی، ئەو هەستەم تێدا دروست ئەبوو: کە ئەم زمانە شیعرییە، نوێترە و لە زمانی شیعری قەبباني و تەنانەت "بدر شاکر السیاب" ناچێت و لەمەودایەکی ئێجگار بەرین و سیحراویتردا باوەش بە ژیان و داهاتوودا ئەکات. من ئەو کاتە لە بەغدا ئەژیام و بەغدای ئەو سەردەمەیش لە چاو سلەیمانیەکی بچووکدا بەدەیان ئاسۆی رووناکبیری و ئەدەبی تازەی لە بەردەمدا کردبوومەوە، هەر لە کتێبخانە زۆرەکانیەوە بۆ تازەترین گۆڤاری ئەدەبی، بزووتنەوەی شانۆ، کۆڕو کۆبوونەوەی هەفتانەی یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی عێراق، پێشانگاکانی بزووتنەوەی هونەری شێوەکاری، تێکەڵاوبوون و دانیشتن لەگەڵ ئەدیبە نوێخوازەکانی ئەو سەردەمەی بەغدادا، وەکوو فازل العزاوی و خالید عەلی مستەفا و عبدالستار ناصر و هەروەها سەعدی یوسف و حسب الشیخ جەعفەر و یاسین نەسیر و فازل ثامر و موسا کرێدی و زۆری تریشدا. ئەگەرچی من بۆ خۆم تا ئەم ساتەوەختەیش سەرجەمی شیعرەکانی ئەدۆنیس یان مەحمود دەروێشم نەخوێندۆتەوە، بەڵام ئەوەندەی لێم خوێندونەتەوە بەس بوون بۆ ئەوەی لە شێوازی

شیعر و چۆنیەتی بیناکردنی قەسیدەیان تێبگەم. بەلای منەوە جوانترین دیوانی "ئەدۆنیس" "أغانی مهیار الدمشقی" و "هذا هو اسمي"یە، ئەگەر بشێ بڵێم: ترۆپکی داهێنانی ئەون. دیارە جگە لە شیعر، ئەدۆنیس ڕووناکبیرێکی گەورەیشە و کتێبە ڕەخنەییەکانی لە بارەی تیورەکردن بۆ شیعر و هونەری شیعرەوە دیار و بەناوبانگن بە تایبەتی "الثابت و المتحول"ی وەرچەرخانێکی مەزن بوون لە خوێندنەوەیەکی تازەدا بۆ شیعری هاوچەرخ و هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی نوێ بوو بۆ دنیای شیعری عەرەبی بە گشتی کە تا ئەوکاتە بەو میتۆدە فراوان و تازەگەرییە نەخوێنرابۆوە، هەڵبەت نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ ڕووناکبیریی ئەدۆنیس و تەنانەت شاعیریەتیشی پەیوەندیەکی دینامیکیان بە ڕووناکبیری فەرەنسی و شیعری فەرەنسییەوە هەیەو "ئەدۆنیس"یش سوودێکی زۆری لە ئەزموونە دەوڵەمەندەکانی وەرگرتووە و توانیوێتی ئاوێتەی ناو ئەزموونی خۆی و تێڕوانینەکانی بۆ دنیای شیعر و داهێنان بکات. بێگومان بەبێ ئەم کاریگەریانە یان ئەو پاشخانە ڕووناکبیریانە شاعیری گەورەی لەوێنەی ئەدۆنیس دروست نابێت، هەروەك چۆن ڕووبارێکی گەورە لە ئەنجامی تێڕژانی چەندین جۆگە و ڕووباری ترەوە دروست ئەبێت. بەلأم ئەبێ ئەوەیشمان لە بیرنەچێ ئەم کاریگەریانە چەند بەهێزیش بووبن نەیانتوانیوە ئەدۆنیس بکەن بە سێبەری کەسیدی، چونکە ئەو هەمیشە هەڵشێلانەوەی خۆی هەبووە. لە شیعرەکانی ئەو ساڵانەی دواییدا، ئەگەر بشێ بڵێم: جۆرێك لە تەسەوف شیعری بوونەتە فەزای زاڵی بەرهەمەکانی، ئەزانم قوڵبوونەوەکانی ئەدۆنیس لە تەمومژی دەستکردەوە دوورن. بەلأم شیعر پێکهاتەیەکی کیمیایی خۆی هەیە لە زماندا و ئەگەر زیاد لە پێویست مەسەلە فیکری و مەعریفی و فەلسەفیەکان چوونە ناو شیعرەوە زیان بە "شیعریەت" ئەگەیێنن، خوێنەر یان وەرگر چەند زیرەکیش بن تووشی جۆرێك لە بێزاربوون و دوورکەوتنەوە ئەبن. هەر لەبەر ئەوەی شیعر بەلای منەوە لە دیوانێکی جوانی وەك "أغانی مهیار الدمشقی"دا خوێنەر لە بەردەم سەرسامبوون و وێنەی شیعری لەڕادەبەدەر سیحراوی و لە هەمان کاتدا لەبەردەم زمانێکدایە کە لەیەك کاتدا قوڵە و ڕوونیشە، کراوەو داخراویشە، ئاسانە و گرانیشە.

هەڵسەنگاندنی دنیای شیعرو ڕووناکبیری ئەدۆنیس لەم چەند دێڕەدا نەشیاوە. بەلأم ئەبوو بەر لەوەی بێمە سەر گێڕانەوەی یادگارێك لەگەڵ ئەودا، لەم سەرەتایەوە دەست پێبکەم و ئەگەر بە خێراییش بووە باری سەرنجێکم هەبێت. دیارە کردنەوەی ئەم دۆسیەیە بۆ ئەدۆنیس تەواو لە جێگەی خۆیدایەتی. ئومێد ئەکەم ستاف گۆڤاری "سەردەم" لە ئایندەدا هەوڵبدەن فایلی لەم جۆرە بۆ شاعیرانی گەورەی لەوێنەی"سەیاب"و "شاملو"یش بکەنەوە بۆ ئەوەی نەخشەیەکی ڕووناکتر بە ژیان و بەرهەمی شاعیرە مەزنەکانی دەوروبەر بخەینە پێش چاوی خوێنەری کورد. لەم سەرنامەیەداو بەر لەوەی باس لە بینینی ئەدۆنیس بکەم لە ستۆکهۆڵم، ئەمەوێ ئەو گرێ بچووکەیش بکەمەوە کە لە دەمێکەوە چاوەڕێی دەرفەتێ بووم بۆ ئەوەی قسەیەکی دەربارە بکەم: ئەدۆنیس شاعیرێکی ئینسانییەو زۆریش ئاگای لە هەڵوێستو قسەی خۆی هەیە. بەلأم لە بارەی تراژیدیەکانی وەك ئەنفالو هەڵەبجەو ئەو کارەساتانەی کە بەسەر میللەتەکەماندا هاتوون هیچ قسەیەکی "بە دەنگی بەرزوبێپەردەو ئاشکرا"ی واینەکردووە "دەنگدانەوەیەك" کە بە قەبارەی ناوبانگی گەورەی ئەدۆنیس خۆی بێ.

لە ڕاستیدا نەك هەر لە ئاست کوێرەوەریەکانی کورد‌داو بەس، بەڵکوو لە ئاست بنەبڕکردنی ئەمازیغیەکانی جەزائیر و باکووری ئەفریقایشدا هەمان تێبینی لە ئارادایە. بۆچی؟! نازانم و مەگەر وەڵامی ڕاستەقینە هەر لەلای شاعیر خۆی بێت!

لە هاوینی 1987دا گەیشتمە سوید و لە ڕێی ڕووناکبیری ناسراو کاك "عومەر شێخ موس"ەوە ڕۆمان نووس کاك "محەمەد ئوزون"م ناسی. ئۆزون لە دەمێ ساڵەوە لە سوید ئەژیا، "یەکێکیش بوو لە ئەندامە کاراو چالاکەکانی یەکێتی نووسەرانی سوید و لە دەستەی باڵای ئەو یەکێتیەدابوو، بەشی زۆری ئەو کارانەی پەیوەندییان بەنووسەران و ئەدیبانی تورکیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەبوو بەرەو ڕووی ئەو کرابوونەوە. لە کۆتایی 1988دا بیستم ئەدۆنیس لەلایەن زانکۆی ستۆکهۆڵمەوە. بانگهێشت کراوە بۆ ئەوەی چەند کۆڕێ ساز بکات. من بۆ خۆم لە یەکەم کۆڕدا ئامادەبووم. یەکەمجاربوو لە نزیکەوە ئەدۆنیس ببینم. کۆڕەکە لە هۆڵێکی بچووکدا بوو ژمارەی ئامادەبووان پەنجا کەسێك ئەبوون، عەرەب و سویدی، بە تەنها دوو کوردیشی لێبوو، هونەرمەند فازل جاف و من. لەم کۆڕەدا ئەدۆنیس باسی لە شیعر و بەشێك لە ئەزمونی خۆیکرد و، هەروەها دوو سێ شیعری عاتیفی و غەزەلی خۆی بە ئیلقایەکی جوانەوە خوێندەوە. لە پاشدا دەرگای پرسیارکرایەوە، چەند پرسیارێکی لێکرا، یەکێك لەو پرسیارانە کاك فازل جاف لێیکرد دەربارەی شانۆی "جۆرج شەحاتە" ئەویش بە تێرو تەسەلی وەڵامی دایەوە. کۆڕەکە تەواو بوو. ئەوانەی لەوێ بوون لێی کۆبوونەوە. بەڵام لە ڕاستیدا من حەزم نەکردو مزاجی ئەوەم نەبوو فزولیانە بچمە پێشەوە خۆمی پێبناسێنم، لەبەرئەوە هۆڵەکەم بەجێهێشت و چوومەوە بۆ ماڵەوە. دیارە بەشێکی باش لە شیعرەکانی ئەدۆنیس کراون بە سویدی و لە زانکۆی ستۆکهۆڵمیشدا جێ و شوێن و پلەو پایەیەکی دیاری خۆی هەیە و چەند مامۆستایەکی تایبەت بە شیعر و ئەدەبی ئەدۆنیس و پسپۆڕ لە ئەزموونی ئەودا هەن کە یەکێکیان ژنێکە و خۆی بۆ کارەکانی ئەدۆنیس تەرخانکردووە.

دوای دوو ڕۆژ کاك محەمەد ئوزون تەلەفونێکی بۆ کردم و پێ وتم ئەمانەوێ لەگەڵ ئەدۆنیسدا بتبینین. زۆرم پێخۆش بوو. بۆیە داوام لێکرد کە ئێوارە بێن بۆ ماڵەوەو ئێجگاری پێکیشەوە خواردنێکی کوردەواریانەی خۆمان بخۆین. ئوزونیش ئەمەی پێباش بوو. دەمەوئێوارە لە کاتی خۆیدا گەیشتن. سێ کەس بوون. ئەدۆنیس و ئەو ژنە مامۆستایەی پێشتر ئاماژەم بۆ کردبوو ئەگەر لەسەر زەین بم پێموایە ناوی "ماریا" بوو. بەهەرحاڵ ئەوە یەکەمجار بوو کە ئەدۆنیس ڕووبەڕوو لە نزیکەوە ببینم. دنیا شتێك ساردی کردبوو. ئەویش پاڵتۆیەکی درێژی لەبەردابوو. بەدەم قسەکردنەوە چووینە سەر مێزی موبەقەکە و دانیشتین. هەرچەند داوالێکردن بچینە ژووری میوان بەڵام ئەدۆنیس وتی "من ئێرەم پێخۆشە!" بۆیە ئیتر تا شەو درەنگانێ هەر لە وێ ماینەوە. ژنە مامۆستاکە بە فەرەنسی قسەی لەگەڵ ئەدۆنیسدا ئەکرد. ئیتر هەرسێ چوار زمانی کوردیو عەرەبیو فەرەنسی بەیەکدا ئەهاتن. ئەو شەوە من زیاتر گوێگر بووم هەرچەندە پرسیارێکم کرد و هیچی تر. باسەکانی سەر مێزیش لە دنیای شیعرەوە دوور بوون. بەشی زۆری قسەکان پەیوەندییان بە دنیای پڕ لە شەڕ و شۆڕ و ناسەقامگیری دنیاوە هەبوو

بیرمە ئەدۆنیس وتی "مەگەر هەر خۆشەویستی بتوانێ ئەم دنیایە چاکبکات بەبێ خۆشەویستی مرۆڤ و مرۆڤ جیهان هەر پڕ لە ڕق و کینە ئەبێت!" یەکێك لەو پرسیارانەی لە ئەدۆنیسم کرد "ئایا ئاگای لە کارەساتی هەڵەبجەیە؟" وەڵامی دایەوە کە ئاگای لێیەتی و ئیتر لێرەدا هاوسۆزی و هاوخەمی خۆی بۆ گەلی کورد دەربڕی. منیش بە دەرفەتم زانی و تازەیش شریتی کارەساتەکەی هەڵەبجەم دەستکەوتبوو. بۆیە داواملێکردن کە بچینە ئەو ژوورەی ئەودیو تا بە چاوی خۆیان ئەو کارەساتە ببینن. چووین و شریتەکەمان خستە سەر ڤیدیۆو کەوتینە تەماشاکردن. لە پاش چەند دەقیقەیەك، ئەدۆنیس هەستایە سەر پێ و وتی: من داوای لێبوردن ئەکەم و ناتوانم بەردەوام بم لەسەر تەماشاکردنی ئەم دیمەنە تراژیدیانە!. چووینەوە سەر مێزی موبەقەکە. بۆ خواردنەوەیش پێموایە تا وەختی هەستانیش لە دوو بیرە زیاتری نەخواردەوە. ئەو شەوە زۆرترین قسە ژنە سویدیەکە کردی. کە وەختی نان خواردن هات و نەسرین خواردنە خۆشەکانی خۆی هێنایە سەر مێز. دوای چەند کەوچکێك ئەدۆنیس ڕوویکردە نەسرین و پێیوت "زۆر سوپاس مادام بۆ ئەم خواردنە کوردیە خۆشانە" بەر لەوەی بڕۆن و خواحافیزی بکەن، ئەدۆنیس لێی پرسیم "ئێوە لە ستۆکهۆڵم هونەرمەندی شێوەکاری ناسراوتان هەیە؟" وتم: ئەی چۆن و هاوڕێشمە وتی: کەواتە سبەینێ یەکتری ئەبینینەوە بۆ ئەوەی بچین سەیری تابلۆکانی بکەین. ئیتر سەعات دەی سبەینێمان دانا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئوزون دا هەرسێکمان لە سەنتەری ستۆکهۆڵم یەکتر بگرینەوە. من لەو ساتەدا هونەرمەندی ناسراو "مدحەت کاکەیم" لە خەیاڵدا بوو. لەو ڕۆژگارانەدا ئەویش هەر لە ستۆکهۆڵم

ئەژیا و خانوویەکیشی وەرگرتبوو تایبەت بە هونەرمەندە تەشکیلیەکان کە شوێنی تەرخانکراوی بۆ وێنەکێشان تێدابوو. بۆ سبەینێ لە وەخت و شوێنی دیاریکراودا یەکترمان بینیەوەو تاکسیەکمان گرت و بەرەوماڵەکەی کاکەیی کەوتینە ڕێ. من دەفتەرێکم بە دەستەوە بوو کە هەندێ کورتە شیعری تەرجەمەکراومی بۆ عەرەبی تێدا بوو، بەبێ ئەوەی قسە بکەم، دەفتەرەکەم دایە دەست ئەدۆنیس، بیرمە چەند پارچەیەکی خوێندەوەو دواتر لەسەر شیعرێکیان زۆر وەستاو وتی: ئەم شیعرانە جوانن. بەڵام جوانترینیان بەلای منەوە ئەمەیانە.. شیعرەکە "شەونخوونی" بوو کە ئەمە دەقەکەیەتی بە کوردی:

لەو شەوەدا
لەو دۆڵەدا
چراکان کوژابوونەوە.
تاقە چرایەك ئەسووتا
ئەویش چرای شاعیرێ بوو
بەدیار برینی نەنووستووی
شیعرێکەوە دانیشتبوو!.

وەختێ گەیشتینە بەردەمی ماڵەکەی کاکەیی چاوەڕوانی ئەکردین پشوویەکمان داو دوایی یەکسەر چووینە بەشی سەرەوەی خانوەکە کە شوێنی وێنەکێشانەکەی لێبوو. کاکەیی چل پەنجا تابلۆی خۆی ئامادە کردبوو. یەکە یەکە کەوتینە تەماشاکردنیان هەستمکرد "ئەدۆنیس" هەر ئێجگار سەرسامە بە کارەکانی کاکەیی. ئەم سەرسامبوونەی خۆی نەئەشاردەوە. کاکەییش بسکەی سمێڵە زلەکەی ئەهات. ئەدۆنیس ئەیوت "ئەمە هونەرە هونەر" ئینجا کەوتە پرسیار کردن لە کاکەیی. ئەویش باسی پرۆژەکانی خۆی بۆ کرد،

ئەدۆنیس پێی وت "حەز ئەکەم پێکەوە پرۆژەیەکی هاوبەش بکەین". ئەدۆنیس بەزانیاریەکی وردەوە لە بارەی وێنەکێشە جیهانیەکانەوە دووا. هەردوکیان ژمارەی تەلەفۆن و ناونیشانی خۆیان گۆڕیەوە. لەو ڕۆژەوە و هەتا ئێستا پەیوەندی نێوانیان گەرم و بەردەوامە. لەم ساڵانەی دواتریشدا و لە سەردانێکدا بۆ سوید، کاکەیی پێشانگایەکی کردبۆوە چووم بۆ بینینی، بۆ دەلیلی پێشانگەکەی "ئەدۆنیس" بە تایبەتی شیعرێکی بۆ نوسیبوو.

دوای ئەوەی لە ماڵی کاکەیی چووینە دەرەوە و گەڕاینەوە بۆ سەنتەری ستۆکهۆڵم. پیاسەیەکی دوورو درێژمان بە "گەملَستان"دا واتە بە کۆنە شاری ستۆکهۆڵمدا کردوو لە کافتریایەکی خۆش دانیشتین. ئەو کاتە ئەدۆنیس لە پاریس گۆڤاری "مواقف"ی دەرئەکرد. لەو دانیشتنەدا، داوای لێکردم کە کۆمەڵە شیعرێکی خۆمی بۆ بنێرم تا لە (مواقف)دا بلاَوی بکاتەوە وتیشی: خۆم بە تەرجەمەی عەرەبیەکەدا ئەچمەوە. ئەو ڕۆژەیش تا عەسر پێکەوەبووین و دوایی ماڵئاواییمان لەیەك کرد و جیابووینەوە.

لەو دوو ڕۆژەدا من "ئەدۆنیس"م بەمجۆرە بینی: پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ. کەم دوو. ئینسانی و هەست ناسك. هەرچی دەمارگرژی و توندڕەوی عەرەبایەتی هەیە تیایدا نەبوو. زۆر سادەو بێ غورور. لە ڕۆیشتندا هێواش. وردبوونەوە لە هەموو شتێ. پێزانینی بە هەموو شتێ. یەك وشەم لێنەبیست کە پاشملە و بە خراپە باسی هیچ کەسێ بکا. دوای گەڕانەوەیشی بۆ پاریس، دوو جار تەلەفۆنی لەگەڵدا کردین. یەکەمجار تەلەفۆنەکەی بۆ ئەوەبوو کە لە زمان ئەوەوە بە مادام بلێم جارێکی تریش سوپاسی ئەکا بۆ ئەو خواردنە کوردیە خۆشانەی کە لێینابوون.

دووەم جاریش دوای ئەوەی حەڤدە کورتە شیعرمی لە "مواقف"دا بلاَوکردبۆوە، لەسەر تەلەفۆنەکە پێی وتم "ئەزانیت دوای بلاَوبوونەوەی شیعرەکانت تەلەفۆنێکی زۆرم بۆ کراوە و هەموو ئەڵێن لەو جۆرە شیعرانە بلاَو بکەرەوە!" لەو ساڵانەی دواییشدا وەختێ سەردانی ستۆکهۆڵم ئەکاتەوە، هەواڵم ئەپرسێ. بەلاَم من ئەو کاتە گەڕابوومەوە کوردستان.

# چەند سەرنجێك سەبارەت بە ئەزموونی شیعریم

**ئەدۆنیس**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**



**-1-**

چۆن چۆنی شاعیرێك سەرقاڵی گەڕان و تێپەڕاندن بێت، دەتوانێت دەربارەی ئەزمونی شیعری خۆی بنوسێت؟ چۆن دەتوانیت لەیەك كاتدا بەم ئەزموونەدا تێپەڕێت و شایەتیش بێت بەسەریەوە؟ داخۆ بۆی دەلوێت وەسفی كۆچێكی هەمیشەیی لەمجۆرە بكات، ڕووەو پانتاییە نادیارەكان؟ یان شیاوە شاعیرێك سەبارەت بە ئەزموونی شیعری خۆی بپەیڤێت، بەرلەوەی وەڵامی پرسیارێك بداتەوە كە چاك دەزانێت وەڵامی نادرێتەوە، ئەویش ئەوەیە (شیعر چییە؟).

**-2-**

هیچ بونێكی نەگۆڕ لە ئارادا نییە. كرۆكێكی نەبزۆك و ڕەهامان نییە، پێی بڵێین شیعر و پێوەر و ئەرزشی شیعریی تەواو ڕەهای لێدەربێنین. وەك چۆن خەسڵەت و ڕێسایەكی نەگۆڕ و ڕەهامان نییە كە بە شێوەیەكی هەمەلایەن لە ڕووی چییەتی و فۆرمەوە، پێناسەی شیعر بكات. هەبووی ڕاستەقینە بریتییە لە: شاعیر، بریتییە لە: قەسیدە و لە ڕێی بەدوایەكدا هاتنی قەسیدەكان و تەواو كردنی یەكترییەوە، سەیركردنی شیعر و تێگەیشتن لێی گۆڕانی بەسەردا دێت. لەبەرئەوەی شیعر بۆ خۆی

ئاسۆیەکی کراوەیە و هەموو شاعیرێکی داهێنەریش، ئەرکی فراوانترکردنی ئەم ئاسۆیەو کردنەوەی پانتاییەکی نوێیە لە بەردەم شیعردا. هەموو ئەفراندنێك لە یەککاتدا، دەسپێك و پێداچوونەوەیە. پێداچوونەوە بەڕابردوودا و دەسپێکێکیش بۆ سەرەتایەکی نویێ.

ئەگەر ئێمە مەبەستمان لە شیعر شاعیران و چامەکانیان بێت، ئەوا پەیبردن بە مانای قەسیدە، یەکەمین هەنگاوە بۆ تێگەیشتن لە مانای شیعر. قەسیدەش بۆ خۆی هەڵگری یەك فۆرمی ئیقاعی یاخود فرە ئیقاعە لە نێو یەك بونیاددا، بەڵام دەبێت ئەوە بڵێین کە فۆرمێکی ئیقاع ئامێز شیعر دروست ناکات، بەڵکو پێویستمان بە شتێکی دیکە هەیە، من ئەو شتەش ناو دەنێم (جیهانبینی). ئەو جیهانبینیەی لە رێی پێکهاتەی گشتی قەسیدەکەوە، یاخود لە ڕێی ناوەڕۆك و فۆرمی ئیقاعی قەسیدەکەوە پێمان دەگات. قەسیدە، وەك فۆرمێکی ئیقاع ئامێزی پەتی، ناچێتە خانەی شیعرەوە، بەڵکو ئەمە جۆرێکە لە شیعری داتاشراو. چونکە شیعر زانستێك نییە زاناو لێکۆڵیاران، گاف گاف پەرەی پێبدەن.. شیعر بریتی نییە لە ڕستێك یاسا و فۆرم و سستەم.

(شعر دەربڕینێکی کێش و سەروادارە). دەستەواژەیەکی لەمجۆرە، هەستی شیعری عەرەبیو ژیان و جیهانبینیش، لەکەدار و درێو دەکات. چونکە ئەمە بۆ خۆی ئاماژەیەکە بۆ سنوربەندی و داخران، وەك چۆن بڕیارێکیشە، تەواو پێچەوانەی سروشتی شیعری عەرەبییە. لەبەرئەوەی شیعر حاڵەتێکی ویژدانی و خۆبەخۆ و سروشتیەو بڕیارێکی واش، ئەقلانی و دروستکراوو لۆژیکیانەیە. ئەو بەرهەمەشی لە ژێر ئەو بڕیاری سەرەوەدا نوسرابێت یان بە نیاز بێت بنوسرێت، ناچێتە قاڵبی شیعرەوە. بە پێی ئەو مافەش کە شیعر بەسەرمانەوە هەیەتی، ئەوا پێویستە ئەم جۆرە شیعرانە لە (دیوانی عەرەب)دا بسڕینەوە. ئەمەش ئەو ئەرکەیە کە لە (دیوانی شیعری عەرەبی)دا پێی هەڵدەستم. وەك هەوڵێك بۆ خستنە ڕووی ڕەهەندی ڕەسەنایەتی شیعری عەرەبی، ئەو ڕەهەندەی ڕەخنە فەرامۆشی کردبوو. هەروەها بۆ ئەوەی هەستی شیعریەتی عەرەبی بگێڕمەوە سەر شوێنە ناوازە و کەم وێنەکەی خۆی، لە ڕووی گوزارشتکردنی لە مرۆڤ و لە گەردون.

زۆر لە رەخنەگرە کۆنەکانمان لەو باوەڕەدا بوون کە فۆرمی شیعری، بونێکی جێگیر و سەربەخۆی هەیە. بەمجۆرەش شیعریان گۆڕی بۆ پیشە.. دال و مەدلولیان لێك جیا کردەوە، فۆرم بە جیا و بابەتیش بە جیا. کاری شاعیریش ئەوە بوو، ئەم دوو جەمسەرە یەکبخاو هاوسەنگیەك لە نێوانیاندا دروست بکات.. ئەو کەسەشی شارەزایانە ئەم کارەی ئەنجام بدایە، وەك شاعیرێك حسابی بۆ دەکرا. ئەوان لێرەدا، تیۆرەی ئایدیالیانەی "ئەفلاتۆن" و "سوکرات" یان پراکتیزە دەکرد، کە دەڵێن: (مەدلول واتە بیرۆکە، یان نمونەی بەرز و بالاّ، بونێکی سەربەخۆی هەیە و پێویستی بە هیچ دالێك نییە. واتە ئەو لە دەرەوەی فۆرمی دالە و لەوەش زەنگینترە تا پێوییستی بە دالێك هەبێت). بەشێوەیەکی گشتی ئەم جیاکردنەوەیە لە شیعر و هونەردا، پرۆسەیەکی دروستکراوە. لەبەرئەوەی لە شیعردا (دال و مەدلول – ئاماژە و ئاماژە بۆ کراو–، شێوە و ناوەڕۆك)، پێکەوە دەڕسکێن و دێنە ئارا.

بە مانایەکی تر، لە شیعردا بابەت نییە، بەڵکو تەعبیر و شێوازی تەعبیر کردن هەیە. هاوکات هیچ حەقیقەتێکی ڕەها لە گۆڕێدا نییە، ئەوەی هەیە جیهانبینی و دید و بۆچونی جیاجیایە. لێرەشدا جێی خۆیەتی بڵێین، ئەم بۆچوونەی ڕەخنەگرە

کۆنەکانمان بۆ هەموو سەردەمێك دەست نادات. لەبەرئەوەی شیعر وەك زانست ناچار نییە ملکەچی ڕێسایەکی جێگیر و نەگۆڕ بێت و کاری بە تەنها ڕێکخستنی وزەکان بێت، بەڵکو تایبەتمەندی شیعر لەوەدایە کە سەرو ڕێسا و بونیادەکان دەکەوێت و وزە و تواناکان قوتار دەکات و دەیان تەقێنێتەوە و ڕێگاکانی پێڕۆشن دەکاتەوە. ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە شیعری ئەمڕۆ لە شیعری دوێنێ چاکترە، بەڵام کارێکی سروشتی و مافی خۆمانە، کاتێك ئێمە لە قۆناغێکی شارستانی وادا دەژین، جیاواز لە سەردەمی باب و باپیرانمان، ئەوا پێویستە شێوازی دەربڕینی تایبەتی و فۆرمی شیعریی تایبەتی خۆمانمان هەبێت. ئەمەش کاتێك مەیسەر دەبێت، گەر ئێمە بەڕاستی بوونەوەرێکی زیندوو بووین..

ئاشکرایە هونەری مەسیحی توانی هونەری ڕۆمانی تێپەڕێنێت، هەروەها سەردەمی ڕێنیسانس ستایلی هونەری غوتییەکانی وەلاوەنا، هەروەك چۆن هونەری سەردەمی نوێ، شێوازی کارکردنی سەردەمی ڕێنیسانسی بە جێهێشت. ئەم پرۆسەیە لە شیعری عەرەبیشدا ڕویدا: "عومەر بن ئەبی رەبیعە" بە هەمان تەرزی "ئیمروئەلقەیس" نەینوسی. وەك چۆن "ئەبوتەمام" شوێن پێی "نابغە"ی هەڵنەگرت. "موتەنەبی"یش لاسایی"زوهیر بن ئەبی سەلما"ی نەکردەوە. چونکە شاعیر گەر پێویستی بە لاسایکردنەوەش هەبێت، ناچێت لاسایی باب و باپیرانی بکاتەوە، بەڵکو کۆپی ئەو هێزە زیندووە دەکات کە جیهان دەگێڕێت. ئەمەش ئەو پرۆسەیە کە باوانمان پێیهەستان و هەموو داهێنەرێکیش هەمان پرۆسە دووبارە دەکاتەوە..

لێرەدا ئەوانەی بە کێش و سەرواکانی "خەلیل" دەکەونە بەرپەرچدانەوە، هیچ شتێك لە مانا و دەلالەتەکانی ئەو سەلەفیە مەزنە نەگەیشتوون. چونکە "خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی" کاتێك ئەو کێش و سەروایانەی داناوە، مەبەستی ئەوە نەبووە ئەوە بکاتە بناغەیەك بۆ داهاتوو، بەڵکو ئەو دەیویست لەو ڕێگایەوە مێژووی ئەو ئیقاعە شیعرییە ناسراوانە بنوسێتەوە، کە تا ساتەوەختی خۆی لە ئارەدابوون. ئەمەش کارێکی گەورە و گرنگ بوو، چونکە توانی بەم کارەی کۆی ئەو کێش و ئیقاعانەمان لە فەوتان بۆ بپارێزێت. بەڵام وەکی ئاشکرایە، ئیقاعیش بۆ خۆی وەکی وشە، وەکی مرۆڤ، تازە دەبێتەوە. لێرەشدا هیچ کۆسپ و بەربەستێکی شیعری یان کەلەپووری بەدی ناکەین، تاڕێ لە سەرهەڵدان و دروستبوونی ئیقاعی نوێ لە شیعری عەرەبیدا بگرێت. دواجار دەبێت ئەوەش بڵێین کە کێشی "خەلیل"، تەواوی فۆرمی شیعری عەرەبی ناگرێتەوە، بەڵکو تەنها بەشێکی ئەو شیعرە پێکدێنێت.

شیعر دۆزینەوەیەکی زانستی نییە و بە پێویست سەرباری دۆزینەوەکانی تر بخرێت و پێکەوە یەکەیەکی گشتی و سەراپاگیر دروست بکەن. وەك چۆن ئامێرێکی پەتیش نییە یاخود فۆرمێکی دەستکردبێت، تا توانای گواستنەوەیمان هەبێت و نەوە دوای نەوە بۆ یەکتری جێبهێڵین.

فۆرمی شیعری وەك ناوەڕۆکی شیعریی وایە، دەڕسکێت و ناخواسترێت. بەردەوام لە نوێبونەوەدایە و کەس بۆ کەسی جێناهێڵێت.. ئەو دەمەی شاعیرێك فۆرمی ڕۆژگارێکی بەسەرچوو دووبارە دەکاتەوە یان هەست و سۆزی قۆناغێکی تر دەگوازێتەوە، ئەوە شاعیر نییە، بەڵکو پیشەوەرێکەو هیچی تر نا.. چونکە فۆرمی شیعری بریتییە لە جوڵە و سەیرورە، بریتییە لە دروستبونێکی بەردەوام. فۆرمی شیعری زیندوش ئەوەیە کە بەردەوام لە نوێبوونەوەدا بێت.

-3-

ئەوەی لەمڕۆدا بە شیعری نوێ ناوزەدی دەکەین، هەمووی نوێ نییە، چونکە مەرج نییە فۆرمی نوێ، مانای نوێ بگەیەنێت. ڕەنگە فۆرمێکی بەڕواڵەت نوێ هەبێت، بەڵام هەناسەیەکی کۆنی تێدا بێت. وەك چۆن دەشێت فۆرمێکی کۆن هەبێت، هەناسەیەکی نوێی تێدا بێت. لەبەرئەوەی جیاوازی نێوان کۆن و نوێ، تەنها لە فۆرمدا نییە، بەڵکو لە ڕۆح و ئامادەگی شیعریانەی کارەکتەری نوێی ڕەسەندایە کە لەسەر ئاستی تەعبیر و دنیا بینیدا ئاشکرا دەبێت.

شیعریەتی نوێ دووکاری پێکەوە گرێدراو بە ئەنجام دەگەیەنێت، شتێکی نوێ دەڵێت و فۆرمی تەعبیر کردنێکی تازەش دێنێتە ئارا، چونکە هەموو ئەفراندنێك ڕەخنە گرتنە لەو ڕابردووەی جێمان هێشتووە، وەك چۆن ڕەخنە ئاڕاستەی ئەمێستاش دەکات، بە مەبەستی گۆڕین و بونیادنانەوەی. هێمای نوێگەری لە هەر بەرهەمێکی شیعریدا، بریتییە لەو وزەی گۆڕانەی لە بەرهەمەکانی ڕابردووی جیادەکاتەوە. هەروەها لە ڕێی زەنگینکردنی ئێستاو داهاتووشەوە، بڕیاری لەسەر دەدرێت.

هەموو ئەفراندنێك لە خۆیدا بریتییە لە خوڵقاندنی جیهانێکی تازە و شاعیری ڕاستەقینەش ئەوەیە کە جیهانی تایبەتی خۆیمان پێشکەش دەکات، نەك ڕستێك دید و بۆچون و زەخرەفە سازیمان بەردەست بخات.. واتە هەموو ئەفراندنێك لە خۆیدا تێپەڕاندن و گۆڕان بوونە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیانەشدا، دەتوانین بە ئاسانی جیاکاری لە نێوان نوێگەری -و- وەهمی نوێگەری، تازە و مۆد، هەروەها لە نێوان داهێنان و بیدعەدا بکەین. مۆد بە مانای پابەندبوون بە ئێستاوە دێت، خۆ هەڵواسینە بە نوێدا، هەر لەبەرئەوەی نوێیە، ئەمەش کارێکە هیچ جۆرە ڕەسەنایەتی و هونەرێکی تێدا نییە. زۆر جار مۆد و ئەفراندن پێکدا دەچن، ئەویش لەبەرئەوەی هەمیشە مۆد هاوشانی نوێگەرییە. لە کاتێکدا مۆد کاتی و تێپەڕە، ئەوا ئەفراندن ڕوبارێکی قوڵە و دەمێنێتەوە. گەر مۆد شەپۆلێك بێت، ئەوا داهێنان بزوتن و ڕۆچوونە. مۆد ڕوکارەو ئەفراندن پێشبینی و پەیامە. ڕوکار ڕەنگدانەوەی شەپۆلی ژیانە، بەڵام پێشبینی ڕەنگدانەوەی ناخ و قوڵایی ژیانە. لەمڕۆدا شاڵاوی مۆد دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچمان کات. دەرەنجامی هەوڵێکی واش زۆر کوشندەیە، بەتایبەت لە کۆمەڵگایەکدا کە خوونەریتی کۆن تیایدا باڵا دەستە. ئەم هەوڵەش ژیانی ڕوحی ئیفلیج دەکا و لەلایەکی تریشەوە بە فۆرمی جۆرە ژیانێك فریوی دەدات و کەیف سازی دەکات، کە ئەم هیچ بەشدارییەکی لە هێنانە ئارایدا نەکردووە. لێرەوە لێکترازانێك لە نێوان مانای ژیانو وێنەکانی تریدا دروست دەبێت و ناکۆکیەکانیش زیاتر قوڵ دەبنەوە.

پێدەچێت ئەم کەلێنەی نێوان جیهانی نوێ، ئەو جیهانەی کردومانەتە ڕێچکەی ژیان و نێوان ئەو بەها فکریە کۆنانەی لە ڕێیانەوە بیر دەکەینەوە، گەورەترین نیشانەی تراژیدیای شارستانی عەرەبی بێت لە ساتەوەختی ئێستاماندا. ئێمە جەستەمان لە جیهانێکی مۆدێرندا دەژی و بیرکردنەوەشمان سەر بە جیهانێکی کۆنە. ئەگەر جەماوەر ئەم واقیعە ناڕەسەنەی پێپەسەند بێت، ئەوا شاعیر ڕەتی دەکاتەوە. ئەویش بە مەبەستی کۆتایی هێنان بەو دادڕان و پەرت پەرت بوونە، بۆ ئەوەی بەسەر ئەو ناکۆکیانەدا زاڵ بین و شێوازی ژیانیشمان لە ڕووی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتەوە بکەینەیەك. چونکە مۆد هەر بە تەنها دوژمنی ئەفراندن و نوێگەری نییە،

بەڵکو ئاستەنگیشیان بۆ دروست دەکات، بەوەی دەستبەرداری نەریت و بەها بەسەرچووەکان نابێتو وامان لێدەکات خوو بە سانایی و جوینەوەی شتە کۆنەکان و لاسایکردنەوە و سستی و تەمبەڵیەوە بگرین.

لە بەرامبەریشدا هوشیاریمان بپوکێتەوەو بەدەگمەن توشی حاڵەتی سەرسام بوون ببین.. هەروەها بە دووبارەبوونەوەی شتەکان ڕاماندێنیٚ، دووبارەبوونەوەیەك کە ئافەرۆزی کات و گۆڕان بوونیش دەکات. لێرەدا دەتوانین جیاوازی لە نێوان کۆمەڵگاو کلتورەکاندا بدۆزینەوە. ئەو ژینگانەی ڕۆشنبیری زیندوویان تێدایە، لە شاعیر دەخوازێت، دەنگی جیاواز و تایبەتی خۆی هەبێت و ڕەسەنایەتی خۆی بپارێزێت، بەلاٚم لەو کۆمەڵگایانەی ڕۆشنبیری مردووی تێدایە، ئافەرۆزی هەموو جۆرە رەسەنایەتیەك دەکات و بوونی هەر شاعیرێکیش کە خاوەنی زمانێکی تایبەت و نویٚ بێت، ڕەتدەکاتەوە و وەلاوەی دەنێت. لەبەرئەوەی کۆمەڵگایەکی وا دەخوازێت پرۆسەی نوسین بکاتە پیشەیەك، هەمووان بیزانن و لێی حاڵی بن و چێژیشی لیٚ وەربگرن. ئەم کۆمەڵگایانە ئەگەرچی ئامێزیان بۆ دیاردە مۆدێرنەکانی ژیان والاٚیە، بەلاٚم لەوەدا بەد گومانن بیری خۆیان نویٚ بکەنەوە، تەنانەت بەگژ هەوڵێکی لەو جۆرەدا دەچنەوە و ئافەرۆزیشی دەکەن. ژیانی ئەمڕۆی نەتەوەکەمان، خۆشەویستیەکە بانگهێشتمان دەکات تا سەر لە نویٚ بونیادی بنێینەوە، شیعریشمان بە هەمان شێوە.

–4–

گەر قەسیدەیەك بنووسم، مانای ئەوە ناگەیەنیٚ کە من مومارەسەی جۆرێك لە نوسین دەکەم، بەڵکو ئەمە مانای وایە من جیهان دەکەم بە شیعر و وێنەیەکی نوێی بۆ دەخوڵقێنم.. شیعر دروستکردنی جیهانە لە ڕێی زمان و جیهانبینیەوە، ئاراستەیەکی نوێیە کە لەوەوبەر بێئاگابووین لێی.. قەسیدە بریتیە لە کەشفکردن و کرانەوە. هەموو ئەفراندنێك تێپەڕاندنە، ئەوا هانی شاعیر دەدات تا خۆی تێپەڕێنیٚ. کەواتە شیعر وزیەك نییە بە تەنها ژیان بگۆڕێت، بەڵکو ڕووەو بڵندەگیش هانمان دەدات.

لێرەوە شیعر قوڵترین ڕۆچوونەکانی مرۆڤەو لە هەموو پرۆسەکانی دیش ڕەسەنترە، چونکە شیعر لە هەموو چالاکیەکانی دی بێگەردتر و خۆڕسکترە و لە هەمووشیان زیاتر بە ناخی مرۆڤەوە پەیوەستە. شیعر یەکەمین ئامرازی گفتوگۆیە. وەك چۆن یەکەمین ئامرازی پەیوەندی داریشە لە نێوان من و ئەوی دیدا. ئەفراندن و ڕوخاندن و بونیادنانە، لەبەرئەوەی داهێنەر پشت لە شتێك دەکات، بە مەبەستی بونیادنانی شتێکی نویٚ، لێرەدا نایاندن و پەسەندکردن، پێکەوە پەیوەستن و هەردووکیان دوو ڕوون بۆ یەك ڕاستی. بۆیە دەکرێت بڵێین گەڕان لە ئەگەرێکی نویٚ و هەنگاوێکی تازە، لە دیارترین خەسڵەتە سەرەکیەکانی بزاوتی شیعری نوێی عەرەبیە. واتە شیعرێکی نوێی عەرەبی نایەتە ئارا، بەبیٚ گەڕان و دابڕان یاخود بەبیٚ دروستکردنی گۆڕانکارییەك لە هەناوی مرۆڤ و ژیان و واقیعدا.

لێرەشەوە تێدەگەین کە دەبێت چۆن چۆنی کۆن لە خزمەتی نوێدا بێت. گەر لەم ڕاستیەش غافڵ بین، ئەوا دووچاری حاڵەتی نوچدان و هەڵنگوتن دەبین، ئەمەش وامان لێدەکات بڵێین شیعری نویٚ لە ڕێی بەراوردکردنی لەگەڵ کۆندا هەڵناسەنگێنرێت، بەڵکو پێویستە تەنها لە ڕێی سەیرکردنی خۆیەوە هەڵیسەنگێنین و تاوتوێی بکەین. واتە پشت بە پێکهاتەی تایبەتی قەسیدەکە خۆی و سستمە ناوەکیەکەی ببەستین. چونکە هەر داهێنانێك بۆ

خۆی، پرۆسەیەکی دەگمەنە و دووبارە نابێتەوە حاڵەتێکی لە ناکاوە، بۆیە تەنها لە چوارچێوەی خۆی و سنوورەکانی خۆیدا سەیر دەکرێت. ئەمەشە هانماندەدات بڵێین شیعر سەرچاوەیەو پرۆسەیەکی سەربەخۆ، نەوەك رەگەزێك یان دیاردەیەکی رۆشنبیری بێت، وەك لقەکانی دیکەی ئەدەب. شیعر بۆ خۆی رۆحی مرۆڤە، رۆحی گەل و مێژووی گەلە. لێرەدا مەبەستم لە مێژوو، رووداوو بەسەرهاتەکان نییە، بەڵکو مەبەستم لەوەیە کە ناوی دەنێین پەیامی گەل یان نەتەوە. لەبەرئەوە، شیعر بەرزترین شێوازی گوزارشتی مرۆڤانەیەو نمونەیەکی بەرزی (بوون)ە. شیعریشە فێرمان دەکات، چۆن چۆنی زەمەن و ئەبەدییەت ئاوێزانی یەکدی دەبن و لە ساتەوەختی ئەفراندندا دەبن بەیەك.

-5-

من لەوانە نیم کە بەهەشت و خۆشنودی لە رابردوودا دەبیننەوە، بەڵکو لەو کەسانەم لە شکۆ رابردوودا ئەوە دەدۆزنەوە کە ئایندە زۆر شکۆدارتر دەبێت. ئەمەش مانای پەیوەندیداری شاعیری بە کەلەپوورەوە بۆ دەرخستم، وەك چۆن واتای کەلەپوریشم لە رووی ئەفراندنەوە بۆ ئاشکرابوو. شاعیر نابێت بەمادە نوسراوەکانی کەلەپوورەوە پەیوەست بێت و خۆی بەوانەوە ببەستێتەوە، هێندەی پەیوەندی ئەو بەو کەرەسانەوەیە کە لە پشت ئەو دەقە نوسراوانەوەن، واتە ئەو بە قوڵایی و هەناوی ئەو تێکستانەوە پەیوەستە، چونکە ئەو شاعیرەی بە زمانی کتێب و سستم و رێسای دەقە نوسراوەکانەوە بدوێت، هیچ شتێکمان بۆ ناگوازێتەوە، جگە لەوەی دەبێتە دەنگدانەوەی نەسازی ئەو دەنگانەی کەسانی بەر لە خۆی جێیان هێشتووە. بەڵام ئەوەی بە زمانی چاوگە رەسەنەکانی میللەتەکەی بێتەگۆ، ئەوا ملیۆنان دەنگمان بۆ دەگوێزێتەوەو چارەنووسی مرۆڤایەتی بەرزدەکاتەوە. بەمجۆرە شیعر وەك جۆرێك لە جۆرەکانی پێشبینی کردن، بەرەو جیهانێکمان دەبات کە لە دەرەوەی سنوری جوگرافیدایە و ئەودیوی تخوبەکان دەکەوێت. شکۆداری تایبەتمەندێتی شیعریش لەمەدایە. بەمەش شاعیر دەبێتە زمانحاڵی نەتەوەو سەردەمەکەی خۆی. ئیتر کەلەپووری تۆمارکراو، چەندێ بەبڕشت و دەوڵەمەندیش بێت، جگە لە بنەمایەکی رۆشنبیری بۆ داهێنەر، بری شتێکی تر ناکەوێت. ئەویش تەنها بۆ ئەوەی بیکاتە خاڵی دابڕان و دەسپێکێکی نوێ، نەك بۆ تەبابوون لەگەڵیداو ملکەچبوون لە ئاستیدا. چونکە کاری شاعیر ئەوە نییە بە تەنها، نەریت و بەهاکان هەرچۆنێك بن تەواویان بکات، بەڵکو کاری ئەو تێپەڕاندن و جێهێشتنیانە.

-6-

لێرەوە ئیتر مانای شیعر لای من دەگۆڕێت. شیعر وەك پرۆسەیەکی زهنی رووت و هەڵچونێکی ویژدانی نامێنێتەوە، یان لقێك بێت لە لقەکانی بەیانو رەوانبێژی یاخود ستایشو پیاهەڵدان بێت، یان ئارەزوویەك بێت بۆ چێژبینینو کاتبەسەربردنو دەنگدانەوەی خۆشی و ناخۆشیەکانی ناخمان بێت، یاخود تێڕامانی فیکریو فەلسەفی بێت، بەڵکو ئەفراندنی شیعری بۆ من بۆتە ئامرازێك بۆ ئاشنابوون بە خۆمو بۆ کەشفکردنی مرۆڤ و جیهان.

شیعر لای من لەسەر رۆئیا و قوڵبوونەوەی ئیشراق راوەستاوە. پێویستە شیعر تا ئەوپەڕی، بە ژیانی مرۆڤ و ئایندەو چارەنووسیەوە پەیوەست بێت. شیعر بۆتە حاڵەتێك مرۆڤ بە هەموو کیانی خۆی مومارەسەی دەکات، بۆتە ئەفراندنێك وەك ئەفراندنی یەزدان.. بۆتە سەفەرێکی بێسنوور و ناکۆتایی. کۆچێك رووەو ئایندە، رووەو ناخی

مرۆڤ و دورترین ڕەهەندەکانی، لە دەرەوەی ڕەوتی زەمەنی ئاسایی. شیعر بۆ من ڕۆشناییە، لە شەوی تارو ئەنگوستە چاوی جیهاندا. ژیان بێ شیعر، ژیانێکە دادپەروەری و ڕاستگۆیی و ئازادی تێدا نییە. شیعر شۆڕشێکە، بەردەوام لە گۆڕان و نوێ بوونەوەدایە. پەلهاویشتنە بۆ ئەودیوی سنور و سستم و قاڵبەکان. شیعر بۆ خۆی بریتییە لە ئاماژەکردن بۆ داهاتوو..

لە بری چامەی داخراوو کلۆمدراو، ئەو چامەیەی لە ڕێی یەك بۆچون و خوێندنەوەوە ڕاڤەدەکرێت، لە بری ئەوە مژدەی چامەی ئاوەڵاتان دەدەمێ کە بەسەر گشت مەوداکاندا دەڕوانێت.. چامەی کراوە لە باریدایە بەردەوام دیدگای شیعریو ستاتیکیمان بگۆڕێت. شیعر ئێستا سنوورە کۆنەکانی جێهێشتووە و لەودیو ڕێساو نەریتە سواوەکانەوە، بۆتە جیهانێکی کراوەو بەرواڵا. من داخراوی کۆتاگی ڕەتدەکەمەوە، ئەو ڕێبازە شیعریەش وەلاوە دەنێم کە لە فیکردا بۆ چارەسەر دەگەڕێت، یان قەسیدە بۆ بونیادەکانی ئەقڵ و یاساو پێداویستیە لۆژیکیەکانی ملکەچ دەکات. ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەم تا لە شیعری عەرەبیدا بیچەسپێنم: هەستەکی و ئیشراقی و پێشبینکارانەیە و لە هەناوی ژیان و کەش و هەوای ئەگەر و هەمەڕەنگیەکانی ژیاندا، بۆ مانا و چارەسەر دەگەڕێت. هەوڵێکی لەمجۆرەش، مرۆڤ بەلایەنی دۆزەخی و بەهەشتیەوە، بە شەیتانی و فریشتەییەوە، بەلاوازی و بەهێزییەوە، بونیاد دەنێت، نەك بیرو ئایدیۆلۆژیا و واقیع و ژیوار.

ئەو شیعرەی من لە سۆراخیدام، مرۆڤ دەخوڵقێنێ نەك تیۆرە، ژیان دروست دەکات نەك چەمك و وتەزاکانی ژیان.. لەبەرئەوەی نازانم لە نێو ڕەهەندە دیار و زانراوەکاندا بووەستم، ئەوا بەردەوام پانتایی و نێوەندی نوێ دەخوڵقێنم.

قەسیدەکانم بە شەهوەتی مەودا دوورەکان لێوان لێودەکەم، شەهوەتی گەیشتن بە قوڵایی و بڵندەگی، گەیشتن بە مانا زیندووەکان، من وەها کار دەکەم. سەرکەوتووبم یان نا، گرنگ نییە. بێ سنوری، ناکۆتابوون، ئەوە پانتایی منە وماڵی منە. لێرەشدا شیعر دەبێتە ژانێکی سەرسوڕهێنەری سەرمەدی. فۆرمە شیعریەکانیش، بێنمونە دەبن و خۆیان دەبنە نمونەی خۆیان.. تێکڕا سەرجەم بوونەوەرەکانیش لە ڕەوتێکی کەم وێنەدا، ڕووەو نادیار، بەرەو ڕووبەرە نەدۆزراوەکان هروژم دەبەن.

-7-

سەرەتا لە واقیع خۆیەوە، شیعری بەسەرئەگەرەکاندا دەکرێتەوە. مرۆڤ بەو شتانە دەوڵەمەند دەکەم کە شایستەیەتی و دەشێت پێیان بگات. ئەوە وەك ئەوەی خۆم پێشبینی دەکەم، نەك ئەوەی لە چوارچێوەی واقعدا هەیە. مرۆڤ بۆ خۆی واقعێکە زیاد لە واقیع. واقعی ڕۆژانەی دەروازەیەکە بۆچوونە نێو واقعێکی تر. من بڕوایەکی بێسنورم بە مرۆڤ هەیە. بۆیە هەندێجار کە بوونی لەو واقیعە سنوردارەدا، بەهێز و توانستە بێسنورەکانی بەراورد دەکەم، جگە لە خلیسکان و بێزاری و دەستەوستانی هیچی دی نابینم. ئەمەش هانم دەدات ژیانێك بخوڵقێنم، لە دەرەوەی ژیانی ڕۆژانەی ئاسایی خەڵکیدا بێت. من زۆر جار وەك دوژمنێك لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانە دەڕوانم، بۆیە لە بەرامبەریدا خۆم بە شیعر ساز و تەیار دەکەم. لێرەشدا، ناسکی تێکەڵ بەسەرسەختی و پاشەکشێ تێکەڵ بە هێرش و پەلاماردان دەبێت. خۆم بە زمان و ئیقاع و نیگار و خەون و خۆزگە، بە واقیع و میتافیزیکاش پڕ چەك دەکەم، ئەمەش بۆ تەنها مەبەستێك کە خوڵقاندنی واقعێکی شیا و لە بارە. دەمەوێت دۆخێك بهێنمە ئاراوە، ناکۆکیەکانی

تێدا تێپەڕێنم، واتە وزەکانی مرۆڤ ئامادەبێت، تێکەڵ بە هێز و تواناکانی دیکە بێت، لە پێناو بونیادنانی جیهانێکی نوێدا، جیهانێك سەر لەبەر مرۆڤانە. دۆخێکی واش بە توڕەییەوە دەخوڵقێنم، بە جۆرێك لەوی دیم دادەبڕێت بە هۆی هۆگریم پێیەوە، یان ئافەرۆزکردنی بەهۆی ئالوودەبوونم و سۆراخ و گەڕانم لە دووی. بەمجۆرە وێنەی واقیع بە بڕشترو زەنگینتر دەکەم، وێنەی ئێستا و ئەو وێنەیەشی لە ئایندەدا دێت.

لێرەوە شاعیر بە جیهانبینی خۆی دەپەڕێتەوە ئەودیو سنورەکانی جیهان و چەند بە ناخی جیهاندا ڕۆبچێت، ئەوەندە ڕەهەندی مرۆڤانە و هونەریانەی نوێ دەخوڵقێنێ. سەفەری شاعیر، هەنگاونانە بەرەو ئایندە، بۆ ئەوەی ڕووبەڕوو پانتایی ئەفراندنی خۆی بەرفراوانتر بکات، بۆ ئەوەی لە مومکینی بێسنوری ناکۆتایی بگەڕێت. ئەم کۆچەش بەرەو میتافیزیکا، مانای هەڵهاتن نییە لە واقیع، بەڵکو هەڵکشانێکی لەمجۆرە هەڵگری حەنینێکە بۆ زیاتر ڕۆچوون و ڕەگ داکوتان لە واقیعدا. لێرەدا سەفەر دەروازەی دووەمە بۆ گەڕانەوەو ڕۆیشتن هاتنەوەیەکی ترە.. من لە واقعێکی تر ناگەڕێم، تا لە خەون و خەیاڵدا نوقم ببم، بەڵکو بۆ ئەوە وا دەکەم تا باوەش بە واقعەکەی ترمدا بکەم. ئەم ئاوێزان بوونەش، تەنها بە مەبەستی گۆڕینی ژیان و واقیعەو هیچی تر نا. چونکە ئەو واقیعەی من لە خەمی دام و خەونی پێوە دەبینم، شتێکی دابڕاوو ئەبستراکت نییە، بەڵکو مومکینێکە کە لە هەناوی خۆیدا ناکۆتایی واقعی حەشارداوە.

**-8-**

جێهێشتنی هەرواقعێك، دەمانگەیەنێتە واقعێکی بەرز و بەرفراوانتر. ئەم گەڕانەش لە واقعێکی دی، خەسڵەتێکی ئەفراندنی بالاّ، بەگەڕانەوە شیعریەکان دەبەخشێت. لەم پرۆسەیەشدا دیار لەگەڵ نادیار و زانراو لە تەك نەزانراودا و خەون و واقیع، ئاوێزانی یەکتر دەبن و تێکەڵ بە یەکدی دەبن. لێرەشدا جیهانبینی شاعیر، لە ڕووی دیالەکتیکی من و بەرامبەر، کەس و مێژوو، خود و بابەت، واقیع و میتافیزیکا، بە کامڵ بوونی خۆی دەگات.

هەنگاونان بەرەو نادیار، شۆڕشێکی بەردەوامە دژ بە تەقلید و نەگۆڕان، دژ بە نەبزۆکی و سەقامگیربوون. ئەمەش بە گڕوتینێکی تر و بە عەشقێکی دی مەیسەر دەبێت. مرۆڤ لە جێی خۆی هەڵدەکەنم و دەیخەمە سەر ڕێچکەی گۆڕان بوون، بۆ ئەوەی جگە لە مرۆڤ و گەردون، یەقین و بڕوای بە شتێکی دی نەبێت. ئەگەرەکان دەکەونە زەمەنی ئایندەوە، لێرەوەیە کە من عەوداڵی داهاتووم. خەمی ئایندە، خەمی بونگۆڕین و نوێ بوونەوە، خەونی گۆڕان، گۆڕانیش ترۆپك و قۆولاّیی دەخوازێت. هەمووو ترۆپکێك بەشێکە لە قولاّیی و درێژبوونەوەی ئەوە، وەك چۆن هەموو قولاّییەك بەشێکە لە لوتکە و هەمان پەلهاویشتنی ئەوە.. ترۆپك و قولاّیی، ئاوو ئاگر، ڕەتکردنەوە و پەسەندکردن، دوو ڕووی یەك جوڵەن. مرۆڤیش جەدەلێکی بەردەوام و هەمیشەیی نێوان ژیان و مردن، نێوان سەرەتاو کۆتایی، نێوان ئەوەی کە هەیە و ئەوەشی دەشێت ببێت.. من بە شیعر لە ئامێزی ئەم دیالەکتیکی گۆڕان بوونەدا نیشتەجێم، وەك سەیرکەر و پشکنەر و عەرافێك. ئاوێتە بوونێك لە نێوان خود و مێژوودا دێنمە ئاراوە، کە ناتوانم بیگەمێ. خەمی گەورەش لێرەدایە. حەسرەتی داهێنەر لەوەدایە، ئاماژە بۆ ئایندە دەکات و دەشزانێت کە هەرگیز نایگاتێ. لە چاوەڕوانی هاتنی داهاتوودا، وا هەستدەکەم لە دەرەوەی زەمەندام، لە دۆخێکدام نە زەمانیە و نە ئەبەدیش.

لێرەوە مومکینە من ناکۆك و تەمومژاوی بم.. لە هەست و وشەکانمدا، ئاگر و ئاو ئاوێزانی یەکدی دەبن. بۆیە هەندێك پێیان وایە قەسیدەکانم وەك شەپۆلی دەریا وەهان، یەك ئەوی دی دەسڕێتەوە.

**-9-**

باوانمان لە بەردەم دیاردەکانی سروشت و ڕواڵەتە دەرەکیەکاندا هەڵوێستەیان دەکرد، ئەمەش مافی خۆیان بوو، بەڵام ئەمڕۆ دڵی وەچەکانیان زۆر بە حەنینەوە، بۆ قولاّیی و ڕەگوڕیشەی شتەکان و بۆ سەرچاوە لێدەدات، ئەمەش مافی خۆیانە. باب و باپیرانمان بە شیعرەکانیان، لێزانانە لاسایی شتە دیارەکانیان دەکردەوە و دەیانگواستنەوە، ئێمەش ئەمڕۆ خوازیارین تەواوکەریان بین، بۆیە دەمانەوێت بە شیعرەکانمان شتە نادیارەکان بگوازینەوە و ئاشکرایان بکەین. ئەفراندن لای باوانمان، هەڵبژاردنی ئەو بابەتانە نەبوو کە لە سنوور و چوارچێوەی هوشیاری باوی مرۆڤایەتیدا بوون، بەڵکو ئەو بابەتانەیان هەڵدەبژارد کە لە بایەخ و گرفت و خۆشی و ناخۆشیەکانی خەڵکیەوە سەرچاوەیان دەگرت. بەلاّم بە بڕوای من، بابەتی ئەفراندنی ئەمڕۆ شتێکە پێی ئاشنانین. بۆیە ناوەڕۆکی کارەکانم بە هەندێکیان و بگرە بە زۆربەیان نامۆیە، وەك ئەوەی من دەینووسم لە هەناوی سەدەکانی ڕابردووەوە هاتبێت، یاخود لە ئەستێرەیەکی گوم ناوەوە دابەزیبێتە خوارەوە. ئەوەی من دەینوسم، ئەزموونێکە توشی سەرسامیو بەدحاڵ بونیان دەکات. ئەفراندن گەرلای باب و باپیرانمان پرۆسەیەك بووبێت سنورەکانی واقعی نەبەزاندبێت، ئەوا لە مرۆدا ڕووەو دنیایەکی دی پەلکێشمان دەکات و بەرەو دەرەوەی ژیانی ئاسایی ڕۆژانەمان دەبات. ئەم حاڵەتەش وا دەکات زۆر جاران باس لە پەیوەندی من بە تەسەوفەوە بکرێت: (لافاوێك دێت و واقیع دەشواتەوە. ژیان و خەون لە مادەدا دەچێنێت. هەموو شتەکان دێنە گۆ و دەبنە دۆست و کەسی یەکدی، بەردیش بۆ خۆی دەبێتە بالیفی عاشقان). لەم گەڕانەوەیەشدا مرۆڤ هەست بە دابڕان و جیابوونەوە ناکات. لێرەدا سنوورەکانی نێوان من و ئەوی دی، نێوان خود و بابەت دەسڕێتەوە و جیهانی بەرد دەبێت بە ئاوو، چۆلەکە بە درەخت و درەختیش بە ڕووبار. هەمووئەمانەش لە ڕێی تەسەوفەوە کارێکی مەحاڵ نییە و پرۆسەیەکی واش، لە ژیان و کەلەپووری ڕۆحیمان بە دوور نییە، بەڵکو هێند ئاشنایە پێمان، لەگەڵ هەناسەماندا تێکەڵە. دۆخێکی واش لە هەموو ڕێچکاگەرییەکی داخراوو دۆگمایەك، دوورمان دەخاتەوەو دەماندەاتە دەست ئاسۆیەکی کراوەو بە کامەرانیو بەختەوەریمان دەسپێرێت. ئەم پێوانەکاریەش سەبارەت بە تێگەیشتن لە شیعر و لە مرۆڤ، جیاواز لەو هەڵسەنگاندنانەی ژیواری خۆرئاوا شیعری پێهەڵدەسەنگێنیٚ. چونکە ئەوەی خۆرئاوا، ڕێچکاگەری و تەحلیلی و لۆژیکیانەیە. لە کاتێکدا ڕێساکانی ئێمە، ئیشراقی و حسی و خۆڕسکانەیە.

**-10-**

لیرکایەتی بوونگۆڕین و نوێگەری لەمەدایە کەمن مژدەی پێدەدەم و خوازیاریشم، ببێتە ڕەهەند و جیهانبینیەکی سەراپاگیر و یۆنیڤێرسالی، تا ناکۆکیەکان بە خۆیەوە ڕابماڵیٚ و بێتە پێشەنگێك بۆ ڕوناککردنەوەی ئایندەی مرۆڤایەتی. ڕێبەرێك بێت گوزارشت لە وزە و توانستەکانی مرۆڤی ئێستا بکات و جوڵە و کردەگیەکانی وێنا بکێشێت، پێشبینی ئایندەیەك بکات کە سەرتاپا جیهان دەبێتە شیعر. ئەم لیرکایەتیە بۆ خۆی جیهان دەگۆڕێت بۆ تۆڕێك لە تیشك و ڕۆشنایی و هێزی

ئەفراندن. هەر قەسیدەیەکیش لەمجۆرە و بەم ئاستە بوو، ئەوا دەتوانین چێژی ئایندە بکەین و پەی بە شکۆمەندی مرۆڤ بەرین. لێرەشدا شیعر دەگات بە عیرفان و دەبێتە پەرجوویەك، جیهان دەگۆڕێت و مێژوو دەهەژێنێ. بەمجۆرە شیعر لە قاڵبی متبوونی خۆی دێتە دەرەوە و پاوانەکانی ڕابردووی بەجێدێڵێ و دەبێتە کلپە و گۆڕانێك، بە هەشتە لە دەست چووەکانیش شوێنی خۆیان، بۆ ئایندە و فێردەوسەکانی داهاتوو چۆڵ دەکەن.

## -11-

من دژ بەو ڕاستەوخۆییەم کەوا لە قەسیدە دەکات، ببێتە ڕوکارێکی بێناخ و بێقوڵایی. هەروەك چۆن دژ بەو تەمومژەشم کە قەسیدە دەکاتە ئەشکەوتێکی کلۆمدراو.. من خۆم لە بیرۆکەیەکی ڕوون و ئاشکراوە دەست پێناکەم، بەڵکو بەشتێك دەست پێدەکەم کە نەدەیناسم و نەدەشزانم چییە، لەبەرئەوەی من لە ئەزموونی شیعریمدا ملکەچی بابەت یان بیرۆکە یاخود ئایدیۆلۆژیاو ئەقڵ و لۆژیك نیم، بەڵکو وەك جیهانبینی و کردەگی و جوڵە و بزوتن، تەنها هەستی خۆم دەستم دەگرێت و ئاڕاستەم دەکات. لەم ئەزموونەشدا من سەرگەرمی گەڕان و پشکنینم، نەك جوانکاری و کلێشەسازی. هەر ئەمەشە واملێدەکات جۆری پەیوەندیم بە زمانەوە بگۆڕم. ئیتر زمان نابێتە ئامرازێك بۆ دروستکردنی پەیوەندی ڕۆژانە لە نێوان من و ئەواندا، بەڵکو دەبێتە دەسوێژێك بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لە نێوان پانتاییەکانی ناخ و دەرونمدا، یاخود دەبێتە چاوساغێك بۆ گەیشتن بەو ڕووبەر و ڕەهەندە دوورانەی خەونیان پێوە دەبینم.

## -12-

من بڕوام بەوەیە، شیعری نوێی عەرەبی ڕووەو جیهانێکی تازەمان دەبات، ڕووەو مرۆگەریەکی نوێمان دەبات، بە ئاسۆو ئەرزشی تازەوە. بۆیە پێویستە ژیانی ئەمرۆمان لە ئاستی ئەم شیعرەدا بێت. ئەمەش وا دەخوازێت جەنگێك دژ بە سستی و تەمبەڵی و لاوازی و ترس و خۆبەدەستەوەدان بەرپا بکەین و ڕێگاش لە بەردەم هێزی خەیاڵ و خەون و سەرکێشی و ئەفراندندا بکەینەوە.

## -13-

داخۆ بڵێی ئەم بۆ چوونانەم گوزارشتی لە هەندێ لایەنی ئەزمونی شیعریم کردبێت؟ گوزارشت لە چرکەکانی ڕابردوو، لە ساتەکانی ئێستا و لەو ساتانەش کە بەڕێوەن و نەهاتوون؟ یاخود ئەوەی نوسیومە تەنها حەنینێکە و چاوەڕێم دەکات، چاوەڕێی ئەو "ئەدۆنیس"ە دەکات کە بەڕێوەیە؟ من بۆ خۆم خەون و خۆزگەم، بیرۆکەش دەستکورترەلە خۆزگە و تیۆرەش بەرتەسکترە لە خەون، حەقیقەتی شاعیریش لە ئەزمونی شیعرەکانیدایە، زیاد لەوەی لەو قسە و باسانەدا بێت کە دەربارەی شیعرەکانی دەیانکات و دەیاننوسێت.

### سەرچاوە:

ئەم نووسینە دەقی تەواوی ئەو لێکچەرەیە کە شاعیری ناسراو "ئەدۆنیس" لە وڵاتی ئوردون، پێشکەشی خوێندکارانی زانکۆی عەممانی کردووە و دواتر لە گۆڤاری (ئاداب)ی لوبنانی بڵاوکراوەتەوە.

# ( ئەدۆنیس )ی ڕەخنەگر

نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد




ئێمە لەم کورتە نوسینەدا هەوڵدەدەین چەند لایەنێکی فیکری ئەدۆنیس دەربخەین‌و ڕوانینە قووڵ‌و ڕەخنە ئامێزەکەی بۆ شیعرو فیکرو کەلەپوورو ئایدیۆلۆژیا نیشان بدەین، بە تایبەتی لە تێزە سەرەکییەکەیدا "ستاتیک‌و دینامیک" کە سەرجەمی فیکرو دیدگا ڕەخنەییەکانی ئەدۆنیس لەو تێزەدا بە چڕی کۆکراونەتەوەو دواتریش هەر لەسەر ئەم بنچینەیە درێژە بە نووسینەکانی دەدات.

کتێبی "ستاتیک‌و دینامیک– توێژینەوەیەک لە داهێنان‌و لاساییکردنەوە لەلای عەرەب"[1] بریتییە لە تێزی دکتۆراکەی ئەدۆنیس لە ئەدەبی عەرەبی کە لە ساڵی 1973دا پێشکەش بە زانکۆی قەدیس یوسف کراوە لە بەیروت بە سەرپەرشتیی دکتۆر پۆڵس نوییا، لە دوای گفتوگۆی کارنامەکە، بڕوانامەی دکتۆرا بە پلەی یەکەمی شەرەف بە ئەدۆنیس بەخشرا. دواتر ئەدۆنیس ئەم تێزەی لە سێ بەرگدا چاپکرد: بەرگی یەکەم لە ساڵی 1974 بەناوی "بنەماکان" (الاصول)، بەرگی دووەم لەساڵی 1977 بەناوی "بەرەسەنایەتی کردنی بنەماکان" (تأصيل الاصول)، بەرگی سێهەم لەساڵی 1978 بەناوی "شۆکی مۆدێرنیزم" (صدمة الحداثة) و تائێستاش چەندین جار چاپ کراونەتەوە کە دوایین جار چاپی هەشتەمی ساڵی (2002)ە کە لە دار الساقی لە لەندەن دەرچووە.

ئەدۆنیس تا ساڵی 1990 هەر بابەتێکی لەبارەی ستاتیک و دینامیک لە پەیوەستیدا بەو تێزە نوسیبێت، لەچاپی هەشتەمدا خستونیەتە سەر

کتێبەکەی و بەمجۆرە چاپی هەشتەم بووە بەچوار بەرگ.

## "ستاتیك" و "دینامیك" لە تێڕوانینی ئەدۆنیس

سەرجەمی ئەم تێزە یان ئەم دانراوەی ئەدۆنیس گەڕانو توێژینەوەیە بە دوای هۆکارەکانی داهێنانو لاساییکردنەوە لە فیکرو ئەدەبی عەرەبیدا کە بەنێو بونیادە مێژووییە قووڵەکانی ئەو کولتوورەدا سەفەرێکی دوورو درێژ دەکاتو دوا جار دەگاتە کۆمەڵێ دەرەنجامی گرنگی زانستی لە بارەی هۆیەکانی پاشکەوتوویی فیکرو ئەدەبو کۆمەڵگای عەرەبی، یان ڕاستتر دەستنیشانکردنی لایەنە پۆزەتیڤو نێگەتیڤەکانی ئەو بزاوتە مێژووییە گەورەو دوورو درێژەی کە پتر لایەنی تەقلیدی زاڵبووە بەسەر لایەنی ئیبداعیدا، ئەدۆنیس لەم گەشتەدا بە وردی بە دوای سەرچاوەکانی هەردوو بزاوتی (داهێنان) و (لاساییکردنەوە)دا گەڕاوەو لەوێشەوە پاشکەوتوویی بزووتنەوە فیکریو ئەدەبیو سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی گەڕاندۆتەوە بۆ مێژوویەکی دوورو درێژ کە تا ئەمڕۆ کاریگەریی بەسەر ژیانی عەرەبیدا هەیە، دواجار دەگاتە دەرەنجامێك یان خاڵێك کە وایدەبینێ بنەمای هەموو ڕاوەستانو هەموو بێبزاوتییەکی فیکرو ئەدەبی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتو بۆ ڕێنماییکردنی کەلەپوورو نەریتی ئایینی بۆ سەرانسەری ژیانو بیرکردنەوەی ئینسانی عەرەبیو کۆمەڵگا عەرەبییەکان.

ئەدۆنیس لەم کتێبە گرنگەدا (کە پاش سی ساڵ لە بڵاوکردنەوەی هێشتاکە گفتوگۆو مشتومڕێکی زۆری لە بارەوە دەکرێ) هەموو لایەنە کولتووریو فیکرییەکانی پێکەوە گرێداوەو لە چەندین ڕوو و لە چەندین ڕەهەندەوە لە ستاتیكو دینامیکیەتی بیرکردنەوەی ئینسانی عەرەبی دەکۆڵێتەوە، واتە بە تەنها لایەنی شیعریی یان لایەنی فیکری یان لایەنی ئاینی یان کۆمەڵایەتی یان شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی نەگرتووە، بەڵکو هەموو ئەمانە لە لێکۆڵینەوەکەیدا کۆدەکاتەوەو، بەم جۆرە لە قووڵاییەوەو لە بونیادەکانەوەو لەناو مێژووەوە هۆکارو دەرەنجامەکان دەردەهێنێت. بۆ نموونە لە بەشی یەکەمی ئەم تێزەدا لە ڕژێمە سیاسییەکانی سەرەتاکانی ئیسلامو لە خەلافەتو بیری فیقهیو بزاوتە شۆڕشگێڕیو فیکریو شیعریو ڕەخنەییەکانەوە بە دوای بنەماکاندا دەگەڕێ، لە (ئیمامی شافعی)و بنەما ئاینییە سیاسییەکانو لە شۆڕشی زنجییەکانو بزووتنەوەی (قرمتییەکان)و ئیدی لە بەشەکانی دواتریشدا لە تەك بزووتنەوە شیعرییەکاندا لە (خەواریج)و (موعتەزیلە)و (ئیمامی غەزالی)و بزووتنەوەی زمانەوانیو تەفسیرەکان دەکۆڵێتەوە، شانبەشانی بزووتنەوە ڕەخنەییەکانی (الاصمعی)و (الجاحظ) و (الجرجانی) و (ابن طباطبا)و (ابن المعتز).

پاشان لە ئاستی ئەزموونە گەورەو ئیبداعیەکانی (ئەبونەواس)و (ئەبوتەمام)و (ئەبوعەلای مەعەڕی)دا دەوەستێو کەشفی داهێنانە شیعریو زمانەوانی و ڕوئیا جیاوازەکانی ئەوان دەکات.

ئەدۆنیس بەمجۆرە پێناسی ستاتیكو دینامیك (الثابت والمتحول) دەکات: "ستاتیك" لە چوارچێوەی ڕۆشنبیریی عەرەبیدا ئەو بیرەیە کە لەسەر دەق (دەقی ئایینی) ڕادەوەستێ، جێگیریو بێبزاوتیی ئەو بیرەش، لە ڕووی تێگەیشتنو بیرکردنەوەوە، لە جێگیریی دەقەوەیە، دەقێك وەکو تاکمانای کۆتاییو وەك دەسەڵاتێکی مەعریفی خۆی دەسەپێنێ، بەڵام "دینامیك" ئەو بیرەیە کە هەمدیس لەسەر دەق ڕادەوەستێ، بەڵام بە خوێندنەوەیەکی جیاوازو بە ڕاڤەکردنێکی زانستی کەوا لە دەق دەکات لەگەڵ واقیعو نوێبوونەوەی واقیعدا خۆی بگونجێنێت، ئەم بیرە هیچ

مەرجەعییەتێك لە دەقدا نابینیٌ و لە بنەڕەتدا پشت بە عەقڵ دەبەستیٌ نەك بە گواستنەوەو نەقڵکردن.

لە ڕووی مێژوویشەوە ستاتیك هەر بە ستاتیکی نەماوەتەوەو دینامیکیش هەمیشە دینامیك نەبووە، بەڵکو بەردەوام گۆڕانکاری لە ڕەوتی جووڵانەوەیاندا هەبووەو بە پێی ئەو جووڵانەوەیەش کاریگەریی لەسەر داهێنان یان لاساییکردنەوەدا هەبووە. گەورەترین ئیشکالی مەعریفەی عەرەبیش پشت بەستنی بووە بە دەق لە ئاستی ئاینیدا، لەوێشەوە بە گشتی ئەدەب و شیعرو فیکری بە ئاین پێواوەو ئاین تاکە پێوەرو دوا پێوەری هەموو شتەکانی دی بوون، جا لەبەرئەوەی ئەو فیکرەیە –لەبەر کۆمەڵیٌ هۆی مێژوویی– نوێنەرایەتیی بۆچوونی دەسەلاتی کردووە، ئەوا ڕۆشنبیریی باویش ڕۆشنبیرییەکی ستاتیکی بووە، بەمجۆرە لە سەرجەمی پرۆسیسەکاندا هاوجومگەییەکی پتەو لە نێوان (ئاینی– سیاسی) لە سەرێك و (ڕۆشنبیری) لە سەرێکی دیکە دروست بووەو ئیدی مەعریفەی ئاینی بووە بەتاکە پێوەرێکی مەعریفیی گشتی.

ستاتیك هاوشانی سەلەفییەتەو لە یەك سەرچاوەوە هێز وەردەگرن و پێیان وایە کەماڵی مەعریفی لە دەق و لە گواستنەوەی دەقدایە، لێرەشەوە داهێنان یان تازەگەری یان تەئویلی جیاواز شتێکی بێماناو بیدعەوییە. ئەوەی کۆمەڵگا لەم دیدەدا پێویستیی پیٌ هەیە بریتییە لەوەی کە (ڕابردوو) بە بەردوامی ئامادە بێت. بەڵام دینامیك هاوشانی تازەگەرییەو ئەم دیدگایە وایدەبینیٌ کە هەمیشە ناتەواوی و کەموکورتییەکی مەعریفی لە (دەق) و لە (ڕابردوو)دا هەیەو ئەم دەقە ناتوانیٌ لەگەڵ زیندەگی و پێدراوە جیاوازەکانی سەردەمە جیاوازەکاندا زیندەگی و کاریگەریی هەبێت مەگەر کۆمەڵگا بەردەوام لەناو وێناکردنەکانی سەدە کۆنەکاندا بژی، کەواتە تازەگەری و دینامیك هێنانە ئارای شتگەلێکە پێشتر لە کەلەپووردا نەبووەو نەیناسیوە، واتە داهێنانی فیکرێك لە نادیارەوە مەجهولەوە، هەروەها قبووڵکردنی (ناکۆتایی مەعریفە) و (فرەیی حەقیقەتەکان).

ئەدۆنیس لەم کتێبەدا بە وردی پەیوەندییەکانی نێوان ستاتیك و دینامیك لە شیعری عەرەبیدا شیدەکاتەوەو پاشان دەریدەخات بۆچی دواجار ستاتیك بەسەر دینامیکدا زاڵبووەو بۆچی ڕێسا جێگیرو باوەکانی شیعری کۆن یان شیعری جاهیلی لە گشت سەردەمەکاندا دەبێتە شیعری نموونەیی و دەبێتە پێوەر بۆ سەرجەمی شیعری عەرەبی(2) ئەدۆنیس لە دواییدا دەگاتە ئەو باوەڕەی کە: ڕوانینی ئاینی هۆکاری سەرەکیی زاڵبوونی ڕەوتی ستاتیکییە بەسەر ڕەوتی دینامیکی لە شیعردا (لێرەدا ئەبو نەواس و ئەبو تەمام جیادەکاتەوە کە وەکو دوو شاعیری داهێنەرو هەمیشە تازەگەر دەرکەوتوون)، بە مانایەکی تر ئەو سیستمە سەرجەمگیرەی ئاین خوڵقاندوویەتی فاکتەرێکی بنچینەیی بووە بۆ باوەڕهێنان بەوەی شیعری کۆن لە شیعری تازە ڕەسەنترەو هەر لادانێك لە ڕێساکانی شیعری کۆن (جاهیلی) دەرچوونە لە نموونەی کامڵ و باڵا.

بەڵام پەیوەندیی نێوان ستاتیك و دینامیك پەیوەندییەکی دیالێکتیکی و پڕ لە ململانیٌ نەبووە تا دواجار داهێنانی شیعری پلە بە پلە هەڵکشابێت، بەڵکو زیاتر پەیوەندییەکی دژایەتیانە بووەو بووەتە مایەی پرۆسەکردنی چەندین شێوازی ڕەتکردنەوەو توندوتیژی کە تەنها بەم ڕێگەیە تەقلید (یان ستاتیك) بەسەر داهێنان (یان دینامیك)دا زاڵبووەو دەرەنجامی ئەمەش بریتی بووە لە ڕاگەیاندنی یەکێتی ئۆرگانی و پتەوی نێوان زمان و ئاین، شیعرو ئەخلاق، کەلەپووری ئەدەبی و کەلەپووری ئاینی.. هتد، واتە کەلەپووری ئاینی بەسەر کەلەپووری ئەدەبیدا تەعمیم کراوەو لێرەدا عەرەب

ئەو هەستەی لەلادا قووڵتر بۆتەوە کە زمانو ئاینو قەوارەی نەتەوەییان یەکەیەکی ئۆرگانیی پتەوەو لێکدی ناترازێن، لەم یەکبوونەشدا، بێگومان، کارکردی ئایینی بەهێزترو زاڵتر بووە.

## ئەبونەواسو ئەبو تەمام

لەگەڵ سەرەتاکان و فراوانبوونی فتوحاتی ئیسلامیدا کە ئیتر شاعیرانی عەرەب لە سنووری دوورگەی عەرەبو لەناو چوارچێوەکانی خێڵ دەرچوونو پێیان خستە هەرێمە تازەکانەوە، دەبوو ئەو پرۆسەیە —وەك ئەدۆنیس دەڵێ— دەرفەتێکی باش بوایە بۆ دەرچوون لە سنوری بابەتە شیعرییە تەقلیدییەکان، واتە لەئەنجامی تێکەڵبوون بە گەلانی ترو کولتوورەکانی ترو بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو بازرگانیو ئابوورییەکانی تر، دەبوایە شاعیرانی سەردەمی ئیسلامیو ئومەویش بە زەینێکی کراوەتر بابەتی نوێیان بێهنابایە نێو شیعرو لە ڕێگەی شێوازی هونەریو تەکنیکی شیعریی دیکەوە گوزارشتیان لە ژیانی تازەیان بکردبایە، بەڵام تا سەرەتاکانی سەردەمی عەباسی، شیعری عەرەبی بە شێوەیەکی گشتی لە ئاستێکی زۆر نزمدا بوو، ئەمەش بێگومان چەندین هۆکاری لە پشتە کە ئەدۆنیس لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا بە درێژی بەنێو مێژووی ئەو سەردەمەدا دەگەڕێتو ئەو هۆکارانە دەردەهێنێتو شییاندەکاتەوە، بەو پێیەی کە "زۆر گرنگە لەو هەلومەرجە بکۆڵینەوە کە تیایدا دیاردەیەکی ڕۆشنبیری یان کۆمەڵایەتی یان سیاسی.. هتد سەریهەڵداوە، بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە ماناکانی ئەو دیاردەیە بزانین، بە تەنها لە زانینی مەرجەکانیشەوە ناتوانین لە ماناکان تێبگەین، بەڵکو ئەو کاتە بە تەواوی تێیدەگەین کە ئەو هێزە دەناسینەوە کە دیاردەکە هەڵدەسوڕێنێو ڕێنوێنیی دەکاتو لە میانی ئەویشەوە تەعبیر لە خۆی دەکات"[3].

ئەبو نەواسو ئەبو تەمام —لە خوێندنەوەی ئەدۆنیسدا— تێڕوانینێکی جیاوازیان بۆ شیعرو بۆ زمانو بۆ ئەخلاقو بۆ ڕوئیا هەبووە، ئەدۆنیس لە شیعری ئەبو نەواسدا چوار خاڵی گرنگو پێکەوە بەستراو دەبینێ: یەکەم: هەستو بینینێکی نوێ، واتە چەشنێکی تایبەتی لە بینینی شتەکان. دووەم: ڕووداوی نوێ، واتە چەشنێکی دیاریکراو لە وەقایعەکان. سێیەم: ئەزموونی نوێ، واتە چەشنێکی دیاریکراو لە ژیان. چوارەم: زمانێکی شیعریی نوێ، واتە چەشنێکی دیاریکراو لە تەعبیر[4] بەم جۆرە ئەبو نەواس لاساییکردنەوەو ڕەگەزو هێماکانی لاساییکردنەوە جێدەهێڵێو بە دیدگایەکی تر تەماشای دنیاو شتەکان دەکاتو بە کەرەستەی تر تەعبیر لە ژیان دەکات.

شیعر لە لای ئەبو نەواس تەنها هەوڵدان نییە بۆ گۆڕینی ژیان، بەڵکو هەوڵدانێکی گەورەشە بۆ گۆڕینی ئینسان، لێرەوە ئەم شاعیرە بە تەنها تەقلیدیەتی شیعری ڕابردوو ڕەت ناکاتەوە، بەڵکو تێڕوانینی تەقلیدییانەی ئاینیش ڕەت دەکاتەوە.

ئەگەر ئەبو نەواس لە ئەزموونەکانیدا دەوڵەمەند بووبێو ڕوانینی ئەویان گۆڕیبێت، ئەوا ئەبو تەمام لە زمانی شیعریدا شۆڕشێکی گەورەی بەرپاکردووەو پێی وایە داهێنانی شیعری بریتییە لە خەڵقکردنی دونیا بە شێوەیەکی تر، کەواتە وشە لەلای ئەبو تەمام شتەکانی دنیا پێچەوانە ناکاتەوە، بەڵکو سەرلەنوێ دروستیان دەکاتەوە.

دەرچوونی ئەم دوو شاعیرە داهێنەرە لە زمانی تەقلیدی، دەرچوون بووە لە تەعبیری سروشتییەوە بۆ تەعبیری هونەری، واتە دەرچوون لە حەقیقەتی واقیعییەوە بۆ خەیاڵێکی بەرفراوانی مەجازی. مانا لە مەجازدا مانایەکی شیمانەیی(ئیحتیمالی)یە، کەواتە هەموو شتێ ژمارەیەکی بێشومار مانای هەیە. لەم ئاراستەیەوە ئەم دوو شاعیرە بنچینەیەکی نوێیان بۆ شیعرو ڕوانین دامەزراند بەو پێیەی شیعر

بریتی نییە لە هەمەڕەنگیی کۆن یان وەرگرتنی ڕەگەزە کۆنەکان‌و داڕشتنیان بە فۆرمێکی نوێ بەڵکو شیعری نوێ نەفیکردنی شیعری کۆنە لە ڕووی هونەرییەوە، بەو پێیەی داهێنان -وەك ئەدۆنیس دەڵێ- نەفیکردنێکە بەردەوام بەرەو پێشەوە دەچێت. فەرقی نێوان ئەبو نەواس‌و شاعیرێکی تەقلیدی، شیعری ئەمەی دواییان لە تێڕامانێکی زەینییەوە بەرهەم دێت، واتە تەماشای شتەکان دەکات‌و وەسفیان دەکات، بەڵام ئەبو نەواس ئەم حاڵەتە ڕەت دەکاتەوەو لە خەیاڵێکی جیاوازەوە شیعر دەخوڵقێنێ، هەر مەعریفەیەك موعاناتێکی خودی نەبێت‌و هەستکردنی ئاوێزانبوونێکی خۆشنوودی نەبێت لەگەڵ گەردووندا، ناتوانێت شیعرێکی مەزن بخوڵقێنێ، دەشێت ئەمە نهێنیی هەوڵدانی ئەبو نەواس بووبێ بۆ ئەوەی بە زمان بەختەوەرییەکی لەدەستچوو دروست بکات. ئەو وێنانەی لە دەوروبەرەکەیەوە دەریاندەکێشێ بریتی نییە لە وەسفکردنێکی ڕووتی شتەکان، بەڵکو ئامانجی وێنە شیعرییەکان بریتییە لە بەردەوامبوونی جووڵانەوە ناوەکییەکانی ئەو شتانەی خەیاڵی شاعیر دەوروژێنن.

هەموو وێنەیەك هێمایە، وشەکانیش بەشێکن لە جولاّنەوەی دەروون‌و جووڵانەوەی شتەکان، بەم جۆرە شاعیر دنیایەکی سیحری دەخوڵقێنێ کە تیایدا کۆنترۆڵی شتەکان‌و ئەخلاق‌و نەریتە باوەکان دەکات، بێگومان هەموو ئەمانە لە دەرەوەی گشت جۆرە چەپاندن‌و داپڵۆسینێك ئەنجام دەدرێن، سا چەپاندنی کۆمەڵایەتی بێت یان ئایینی، لەوانەشە هەر ئەم بیرکردنەوەیە تەفسیری ئەوە بکات چۆن ئەبو نەواس بە شاعیری گوناهەکان (یان شاعیری گوناهکار) ناوبراوە، ئەو لە بەرامبەر ناشیرینییەکانی ژیاندا دەیەوێت لە ناوەوەی خۆیدا ئەو جوانیانەش ئاشکرا بکات کە هەستیان پێدەکات، ئیتر دەبێ لە سنورەکانی ئەمرو نەهی دەربچێت، واتە دەبێ گوناهێك ئەنجام بدات، ڕەنگە هەر ئەمەش نهێنیی داهێنانی ئەبو نەواس ئاشکرا بکات، بەوپێیەی هەموو داهێنەرێك "گوناهکارە" و دەست بۆ "حەرامکراوەکان" دەبات، شەراب‌و سێکس لەو حەرامکراوانەن کە ئەم شاعیرە بە ڕاشکاوی دەیانهێنێتە نێو قەسیدەکانیەوە.

وشە لە لای ئەبو تەمام هەر تەنها وشە نییەو مەودایەکی ترە، وشە هەر تەنها ماوەیەکی دەنگی نییە مانایەك فڕێ بدات، بەڵکو هەر وشەیەك فۆرمێکی تایبەتی لە بوون ئاشکرا دەکات هەروەکو فۆرمێکی تایبەتی لە ئیقاعیش دەردەخات، هەروەها وشە بونیادێکی ئۆرگانیکییەو خودی شاعیرو شتەکانی جیهان بە یەکدی دەگەیەنێت.

ئەبو تەمام لە شیعرەکانیدا نایەوێ جەستەی سروشت بڕازێنێتەوەو ڕەنگینییە واقیعییەکانیمان پیشان بدات، بەڵکو دەیەوێ وامان لێبکات شتەکانی سروشت لە جووڵانەوەو لە تەقینەوە ئەسڵییەکانی خۆیاندا ببینین، بەم جۆرە پەیوەندییەکی تر لە نێوان مرۆڤ و سروشت، مرۆڤ و مرۆڤ، مرۆڤ و دیدگا، دروست دەکات.

## پەراوێزەکان:

1-ادونيس، الثابت والمتحول، بحث في الابداع والاتباع عند العرب، دار الساقي- لندن، الطبعة الثامنة، 2002.

2-ادونيس، الثابت والمتحول- الجزء الاول- ص 111-115.

3-سەرچاوەی پێشوو- ل 34.

4-الثابت والمتحول- الجزء الثاني- ص 117-133.

# هەڵنانی سەربەستی و ئارەزووەکان بەبێ هیچ پابەندییەك

## خوێندنەوەی "سەرەتای جەستە کۆتایی دەریا"ی ئەدۆنیس

**نووسینی: جان نعوم تەنوس**

**لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵلا**




"ژێراوژوورکردنی بەهاکان"، ئەم دەستەواژەیە وێناکردنی ئەدۆنیس کورتدەکاتەوە، ئەگەر کورتکردنەوە شیاوبێت. شاعیر پرۆژەیەکی فیکریی هەیەو پێدەچێت هاوشێوەی ئەو مژدەیە بێت کە نیچە لە فەلسەفەی خۆرئاوادا دای، کاتێك بانگەشەی بۆ هەڵنانی ڕەمەك (غەریزە)و گاڵتەکردن بە ئەقڵو هەڵدان بە ئارەزوو و ژیانی سەرزەمینیو ڕیسواکردنی دابونەریتەکان کرد. هاوشێوەی زۆرنزیکی فەلسەفەی بوونخوازیشە کە باوەڕی بە ئازادبوون هەبوو لە چییەتی حازربەدەستو گرنگیی دۆزینەوەی خۆیی حەقیقەت، هەروەها بڕوای بەوە هەبوو کە زەوتکردن ڕێگەیەکی پاشایانەیە بۆ چاکەبوون، بەوپێیەی لە مێشکدا ئەوە جێگیربوە کە ئەقڵ ڕێنیشاندەری حەقیقەتە، جەستە لەعنەتکراوە، دنیا پیسەو دەبێت لێی هەڵبێینو دەسەلات لە توندوتیژی جیانابێتەوە، چونکە ئەوە دنیایەی گۆشەنیگای تەقلیدی باسی لێوە دەکات، چەسپاوو جێگیرەو پێویستی بە

سەرلەنوێ لێکدانەوە نییە، هەروەها لەلایەن ئەو بیروڕا پێشوەختانەوە جڵەودەکرێت کە گۆڕان یان وەگۆڕان ناناسێت. لێرەوە ئەدۆنیس خوازیاری ژێراوژوورکردنی بەهاکان بووەو جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، ئەوەی بەلای خەڵکەوە نێگەتیڤ یان پەراوێزکراو یاخود چەپێنراوەو بەهایەکی نییە، ئەوە مەرجی ڕاستەقینەی گشت ئازادیو داهێنانێکە.ئەم پرۆسەی ژێراوژوورکردنە ئەدۆنیسی بەرەو بیرۆکەیەکی پایەدار برد، ئەویش دۆزینەوە بەبێ بیروڕای پێشوەخت یان چییەتیەکی پێشوەخت ڕێکخراو، پرۆسەکە ئەدۆنیسیشی بەرەو بیرۆکەی دەست لەملانبوونی ناکۆکەکان برد کە هەندێك لە بوونخوازەکان بە نیشانەی لەدایکبوونێکی نوێو ئەزموونێکی دەوڵەمەندی بەپیتیان بینی. بێگومان ئەدۆنیس بوێرترین شاعیرو بیریاری ئەم سەردەمەیەو لە دیوانی "سەرەتای جەستەو کۆتایی دەریا"دا پاش دابڕانێکی دەیان ساڵە، بەڕوونی لە ساتی نووسینی قەسیدەی بەناوبانگی "وەگۆڕانەکانی عاشقێك"دا باسی خۆشەویستی دەکات. وەك ئەوەی ئەو مرۆڤە ژیانی بەسەربردبێ بەبێ ئەوەی خۆشەویستی دڵی داگیرکردبێ‌و کتوپڕو پاش ئەوەی تەمەنی حەفتا ساڵی تێدەپەڕێنێ دەبێتە دیلی ژن.

ئەگەرچی ئەدۆنیس دەبێتە منداڵی لەدایکبوونەکانو ڕابردوو جێدەهێڵێ‌و لە ڕۆژگاری بەڵێن‌و ئەو کرانەوەیەدا دەژی کە هیچ سنوورێك بۆ تواناکانی نییە، ڕۆژگارێك کە پێشوەخت پێك نەهاتوە، چونکە سەرەتایەکی نوێو ئازادیی بیروباوەڕەکانیەتی، ئەوا سروشتییە ئەوە توڕدات کە پێی دەڵێن "دانایی"، چونکە ئەم وشەیە بەلای ئەوەوە تەنیا هێما نییە بۆ وێناکردنە پێشوەختەکان، بەڵکو هێماکردنیشە بۆ ئەزموونە ڕۆتینیە ئاوەژوەکان. ئەدۆنیس دەڵێت: "بە مەرەکەبی دڵشکاوییەکانمان ئارەزووەکانمان نووسییەوە، بەبێ دانایی ژیانو لە قەسیدەدا نیشتەجێبووین". وەك ئەوەی دانایی مانای ئەوەبێت مرۆڤ لە هەموو داناییەك داماڵرێت، نەك بۆ ئەوەی گەمژەبێت، بەڵکو بۆ ئەوەی زیاتر بدۆزێتەوەو لەناخدا ئەزموون بکات. دانایی لێرەدا پابەندییەکەو مانای تێڕوانینی ئەوانەی پێشووە، لەکاتێکدا شاعیر مەبەستێتی بەخودی خۆیو تاڵیی ئارەزووەکانیەوە ژیان بەسەربەرێت‌و شوێنپێی ئەوانەی پێش خۆی هەڵنەگرێت. بۆیە لە قەسیدەدا جێگیردەبیت، بەواتای ئەوەی داهێنان بکات‌و ژیانی پڕ ئەزموون بەسەربەرێت، لەبەرئەوە دەبینین لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت، دەروەستیو نزیکایەتیو ناسنامە ناخوازێت. مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەدۆنیس هەموو شتێکی ئامادە ڕەتدەکاتەوە کە ئاستەنگ بۆ داهێنان دروستدەکەن. کاتێکیش مرۆڤ دەست بە پشکنین دەکات (هەموو پشکنینێك گەڕانە بەدوای ڕۆحو مرۆڤدا)و دەستبەرداری ڕێنیشاندەرێك دەبێت کە سنووری پشکنینەکەی بۆ دیاریدەکات، ئەوا زمانەکەی بۆنوبەرامی سەرکێش وەردەگرێت. لێرەوە شاعیر دەچێتە ناو شەوی خۆشەویستیی ڕۆشەنی خۆیەوە، هەتا دەرچوون لەم شەوە دەبێتە تاریکییەکی ئەنگووستەچاو. لەڕاستیدا ئاشکرابوونی ڕۆشەن، واتە لێکدانەوەی پێشوەختی ڕێگەڕێژکراو بەواتای شەوی مەعریفە دێت، چونکە ئازادیو سەرمەستیی خۆشەویستی ئەوەیە خۆ بخزێنیتە ناو شەوێکی نۆبەرەوە کە پێشوەخت پەی بە شوێنەکانی نابەیت، بەوپێیەی ئەگەر پەیت پێ برد، ئەوا دەستبەرداری مەعریفەو سەرچڵیی دۆزینەوەیەکی دیکە دەبیت. ئەم شەوە ڕۆشنە نەك تەنیا لەبەر ئەوەی بەرەو پێشڕەویت

دەبات، بەڵکو لەبەرئەوەش کە زیاتر هانتدەدات بۆ کۆششکردنو دوورکەوتنەوە لە باوو دەستەمۆکراو. چونکە هیچ سنووریکی دیاریکراو نییە بۆ ئەزموونە مەزنەکان، لەوانە ئەزموونی عیشق. لەبەرئەوەی دەشێت ئەو ئەزموونانە لە باڵەوە بگۆڕێن بۆ پابەند، لە زەویی سەرچڵیو شڵەژانی بەتاموچێژەوە بگۆڕێن بۆ بەهەشتێکی مێشکیی بێزارکاری دوور لە جیهانی شیانەکانو ئەو نەشونماکردنەی بۆخۆی سەرمەستیی نایاب دەبەخشێتە ژیانو وای لێدەکات شایانی تێدا ژیان بێت. کەواتە خۆشەویستی دەرچوونە لە باو، دەرچوونە لەوەی مرۆڤ پێی ڕاهاتوەو وەك شتێکی قبوڵکراو لە مێشکیدا چەسپیوە کە شایانی گفتوگۆکردنو گۆڕین نییە. لێرەشدا گەنجێتی وەچەی یاخیبوونە لە باوو هاوڕێیەتیکردنی نادیارو نوێو کتوپڕە. بۆیە شاعیر دەڵێت: "جەستەی تۆ فێری ئەوەی کردم دژی باو بم/ جەستە تۆم ناسیو لەڕێگەیەوە خۆم ناسی". ئەمەش خەسڵەتی کەسایەتیە مەزنەکانە کە ڕێڕەوی مێژوو یاخود مێژووی ژیانی خۆیان گۆڕیوە، وەك عاشقەکان، شاعیرەکان، چاکسازەکانو تەنانەت سەرکردەی سوپاکان. کەواتە پێویستە خۆت ژیان ئەزموون بکەیت، نەك لە ڕێگەی ئەقڵو دڵی ئەوانی دیکەوە ئەزموونی بکەیت. ئەمەش مانای ئەوەیە باو تیخ بکەیتو ڕێگەیەکی نوێ بگریتەبەر. لەوانەیە بەهەنگاوەکانی ئەوانی دیکە ڕێگەکەت ڕۆشنبێتەوە، بەمەرجێك خۆت وێناکردنەکانو شڵەژانەکانی دڵیان تاقیبکەیتەوە. ئازادی هاوشانی ژیانە، ژیان بەبێ ئازادی بوونی نییە، هەروەها خۆشەویستی بەبێ ئازادی بوونی نابێت.

زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم شیعری ئەدۆنیس بەرجەستەکارانە بوونخوازانەیە، تەنانەت ئەگە هەندێك جار ئیلهامی لە فەلسەفەی نیچەوە وەرگرتبێ، چونکە نیچە بۆخۆی بەرجەستەکارانە بوونخوازبووە. بۆیە دەبینین شاعیرەکەمان بەها تەقلیدییەکان ژێراوژووردەکات، لەکاتێکدا خەڵکی هەڵکشان بەرەو سەرەوە شکۆداردەکەنو پێیانوایە نموونەی باڵا خاڵێکی نەگۆڕەو لوتکەیەکی فیکرییە دەبێت مرۆڤ بوونی خۆی بکاتە قوربانی بۆ سازان لەگەڵیدا، دەبینین ئەدۆنیس مەسەلەکە ژێراوژووردەکاتو هاتنەخوارەوە بە هەڵکشانێکی سەرکەوتوو دەبینێت. دۆزینەوەی خودی خۆت لە ڕێگەی چەپێنراوو لەعنەتیکراو تیاتدا ڕێگەی ئەو ئازادییەیە کە تەنیا بوونخوازی بەرگریی لێ ناکات، بەڵکو دەروونشیکاریش، بەتایبەتی ئاقاری بوونخوازانەی، بەرگری لێ دەکات. کەسێك لەسەر زاری ئورفیوسەوە، کە چووە ناو دۆزەخەوە بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەی بدۆزێتەوە، دەڵێت: "ئایا نهێنی هەڵکشان/داخزان لەسەر ئاستەکانی دۆزەخ دەزانی چییە؟ دەزانی ئەوە خواردنەوەی گەردوونە هەتاکو سەرخۆش بوون". کاتێك ڕۆدەچیتە خوارەوە بۆ ناو دۆزەخی چەپێنراو، کاتێك دەتەوێ تێکڕای گەردوون بخۆیتەوە، واتا ژیانێکی بایۆلۆژیانە یان میکانیکیانە بژیت یاخود ژیانێك بەسەربەریت تەبابێت لەگەڵ ئەو ڕۆڵو دەمامکانەی پێشوەخت دابونەریت یان پێوانەکان بڕیاریان لێ داوە، مانای ئەوەیە ئەو مەیلانە بەرەڵابکەیت کە بە نێگەتیڤیان دەزانیو ناچاریت ئەشکەنجە بخۆیت، وەك ئەوەی دۆزەخ مەرجی بەختەوەری (بەهەشت) بێتو هەڵکشان بەبێ داخزان بۆ ناو ناخەکان ڕوونەدات. فەیلەسووفێك وتەنی، خەڵکی دەتوانن چاکەو خراپە، سودبەخشو زیانبەخش دەستنیشان بکەن، بەڵام ئەگەر یەکێك وتی چاکە دەشێت خراپە بێت، یاخود خراپە دەشێت چاکە

بێت، بەڵکو ئەگەر مرۆڤێك زاتی ئەوەی هەبوو بڵێت ناخی مرۆڤایەتی شوێنی پێگەیشتنی ناکۆکەکانە، ئەوا لەوانەیە ئاخاوتنەکەی بخرێتە چوارچێوەی گەمژەیی یان لاوازیی بیروڕاوە. گەلێك جار هەستی جۆراوجۆر لە ژێریی ناوەکیدا هاوسێی یەك دەبن، چونکە مرۆڤ تەنیا ئەقڵ نییە، بەڵکو نائەقڵیشە. بۆیە شاعیر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: "ناکۆکییەکان تەنیا لە کیانێکدا کۆدەبنەوەو پێکەوە دەژین کە سروشتێکی خواوەندانەی هەیە". خواوەندانە لێرەدا بە مانای پایەبڵندو بالادەست دێت. بەو جۆرە ڕێگەی خۆشەویستی دەبێتە ڕێگەیەك بۆ تاڵی چێشتن، چونکە هەندێك جار ناکرێت ئازاربەخش لە چێژبەخش جیابکرێتەوە، بەتایبەتی لە ئەزموونی خۆشەویستیدا. وەك ڕۆمانسیەت مژدەی بۆ دەدات، لەوانەیە هەندێك جۆری تاڵی جوانترین شیرینییەکان بێت، لێرەشدا نموونەکان لە ژماردن نایەن. دەشێت شاعیر لە ساتەوەختێکی وردکارانەدا بگاتە ئەو ئاستەی نەتوانێت سرودی خۆشیو گریان لێك جیابکاتەوە: "سرودێك نییە ئەگەر نموونەکەی هاوسنووری گریان نەبێت". هەروەها جیاوازی ناکات لەنێوان خۆشەویستیو ڕقدا، چونکە ئەوپەڕی ئەزموون دەروون ڕادەوەشێنێ، بەو جۆرەش هەستەکانو سنوورەکانیان تێکەڵ بەیەك دەبن: "ئاه ئەی قوڵترین ئەوینی ڕق لێبوونەوە، ئاه ڕق لێبوونەوەی ئەوین چەندە قووڵە". هەروەها دەستەپاچەیە لەئاست جیاکردنەوەی مردنو ژیاندا: "ئایا نووسینی خۆشەویستی ئاوو ژیانو مردنە لە پەرداخێکدا؟". دەشێت لێرەدا هێما بۆ ئەوە بکات کە فەرەنسیەکان پێیدەڵێن "مردنە بچووکترەکە". ئەمەش دۆخێکی ئارامیی تەواوە کە بە مردن دەچێتو دوای تەواوبوون لە پرۆسەی سێکسی

دێتەئاراوە. سەختە لێرەدا حوکم بەسەر ئەم بابەتەدا بدەین، چونکە نازانین شاعیر لێرەدا وەك مازۆشیەکان چێژ لە ئازار وەردەگرێت، یاخود بەدوای ئەزموونێکی بێوێنەی دەگمەندا وێڵە کە چێژو ئازار پێکەوە کۆدەکاتەوە، وەك بەڕوونی لای ئەو کەسە بەدیدەکەین کە کارێکی سەخت بەلام خۆش ئەنجامدەدات. لەوانەیە خولیای مردن کە لای ئەدۆنیس زۆر دووبارەدەبێتەوە، هێماکردن بێت بۆ خواستی پاکبوونەوە لە هەڵچوونە نێگەتیڤەکان.

مەسەلەی ژێراوژووورکردنی بەهاکان لە دیالەکتیکی خەیاڵو واقیع جیاناکرێتەوە. هەندێك کەس بڕوایان وایە کە واقیع تاکە حەقیقەتە، ئەگەرچی یەکێکە لەلایەنەکانی حەقیقەت، چونکە واقیع دڵشکێنو ئازاردەرە، کۆتایی سەربەستییە، لەکاتێکدا خەیاڵ سەرەتاکەیەتیو جیهانێکە دەوڵەمەند بە شیانە بێسنوورەکان. ئەدۆنیس دەڵێت: "سەردەکەوم بۆ سەر ئەوپەڕی خەیاڵپلاویتو چێژ لە بەرزییەکانی واقیع وەردەگرم". بەوپێیەی مەملەکەتی خەیاڵ کۆتایی نایەت، بەلام واقیع داخراوو پێشوەخت دیاریکراوە. سەیرنییە شاعیر بکەوێتە ژێر کاریگەریی خەیاڵی دوورەوە، بەتایبەتی کاتێك ئەو ئەو ئارەزووانە دەخاتەڕوو کە بەرەنگاری ئەمری واقیع دەبنەوە.

ژن لای ئەدۆنیس بە ئازار دەچێت، خۆشەویستی بەلای ئەوەوە شیرخۆرییەکی بەردەوام یاخود منداڵییەکی بەردەوامە. ئەم مەیلە دەمەکییە کە بە مەمکی بەلەزەتی شیردەرەدا خۆی هەڵواسیوە، وەك یەکێك لە بلیمەتەکانی دەروونشیکاری دەڵێت، گرێدراوی پەرۆشی گەڕانەوەیە بۆ منداڵدانی دایك، کاتێك شاعیر دەچێتە ناو پێچوپەنا تاریکەکانیەوەو وەك منداڵێکی نوێ دێتە دەرەوە. لەڕاستیدا

شاعیرەکەمان خولیای لەدایکبوونی نوێیەو دەستبەرداری هەموو وێنەیەکی پێشوەختە، خواوەندی ڕاستەقینە بەلای ئەوەوە مرۆڤ بەپێی دیمەنێکی پێشوەخت بڕیاردراو ناخولقێنێ، بەڵکو لێدەگەڕێت خۆی خۆی بخولقێنێ، ئەمەش دوور لە هەر بیرۆکە یان سۆزێکی حازبەدەست. بۆیە شاعیر پێی خۆشە لە منداڵدانی مێینەدا مەلەبکات، هەروەك چۆن منداڵ لەناو ئاوی ئەڤینۆسیدا مەلەدەکاتو هەست بە گەرمیو جیهانێکی خۆشی پێچەوانەی واقیعی دڵڕەق دەکات: "بۆچی ئەوکاتە جەستەت دەگۆڕێت بۆ دەریایەكو شەپۆلدەدات بە کۆئەندامەکانمداو هیچ کەناریێکی نییە؟". لەوانەیە ئەو نهێنییەی ئەدۆنیس لە پەشیمانیی نێگەتیڤانە قوتاردەکات ئەوەبێت ئەو کە یەکگرتن لەگەڵ ژن/دایك دا بە دۆزینەوەیەکی نوێ دەزانێت کە کەناری نییە، واتە سنووری پێشوەخت بڕیار لێ دراوی نییە. بێگومان ئەو لەبری جەختکردنەوە تەنیا لەسەر ڕۆح، بایەخ بۆ جەستەش دەگێڕێتەوە: "جەستە نەك ڕۆح وەبیری دێتەوە". هەروەها بەپێی نێچە بایەخ دەگێڕێتەوە بۆ خۆڕسكو سروشت یاخود خۆماك، بەو جۆرەش لە دوائەنجامدا دابڕانێك لەنێوان جەستەو ڕۆح، ئەقڵو خۆڕسکدا ڕوونادات، چونکە ئەوە مەسەلەیەکە ئەوانەی پێشتر بلیمەت بوون لە شیکردنەوەیداو نێچەو دەروونشیکارەکان تڕۆیانکردوە. لێرەوە نووسەر سێکس دووپاتدەکاتەوەو سەرنج بۆ ئەفسانە کۆنەکانو ئایینە بتپەرستیەکان ڕادەکێشێت کە جەستە بە سەرچاوەی خواوەندیبوونی ماتی خۆیان دەزانن:"وەك ئەوەی سروشت قوز بێتو خواوەندبوونیش تۆوی پیاو بێت". واتە خواوەندبوونی ڕاستەقینە بەلای ئەوەوە لە ڕەحەتبوون جیانابێتەوە، جگە لەوە هەموو شتەکانی دیکە نامۆبوونە بە سروشتی مرۆڤ. لەوەش زیاتر، پێیوایە ئارەزووی سێکسی شارستانیبوون دێنێتە ئاراوە، واتە ئەوەیە کە شەڕانگێزی خاودەکاتەوەو وا لە مرۆڤ دەکات تۆوی خۆشەویستیو هاریکاری قبوڵ بکات.

تێدەگەین بۆچی ئەدۆنیس وەك فینیق لە پەیوەندیی لەگەڵ ئافرەتدا، بەهۆی خۆیەوە سکی پڕدەبێتو لەڕێگەی ژنەوە لەدایکدەبێت. چونکە ئەقڵ تەنیا قیبلەنما نییە، بەڵکو ئارەزووەکانیش زانینێکی تایبەتیان پێویستە: "ئارەزووەکانی جەستەی ئەوەیە کە دەبێت خۆڕسك بێت، ئارەزووەکانی بێ ڕێکخستنو کۆتوبەندە". بەوپێیەی هیچ پابەندییەکی ئایینی یان کۆمەڵایەتی یاخود ئەخلاقی لە خۆشەویستیدا نییە، چونکە نێچە وتەنی مەرجی هاتنەدیی سەربەستی ئەوەیە ئارەزووەکان ئازادبکرێن، لەبەرئەوەی زیاتر ئەقڵو ئاقڵبوون مرۆڤ فێردەکەن. بەواتایەکی دیکە، مرۆڤ لە ڕاستیی هەستوسۆزو ئارەزووەکانی دڵنیادەبێت، بەڵام بەرامبەر بە ڕاستیی بڕوا فەلسەفیو سیاسییەکانو ئەوانی دیکە دڵنیانابێت. ئینجا مرۆڤ ئارەزووی گەورەو چەندین پەرۆشی یەك لەدوای یەکی هەیە، لێرەدا گرفتەکە لە بەرەڵاکردنی ئارەزووەکاندا نییە، بەڵکو لە ڕێکخستنیاندایە. وێڕای ئەوە، وردوخاشکردنی ئەقڵ بەکۆ مانای وێرانکردنی ئەقڵو گەندەڵبوونی ئارەزووەکانە بەیەکەوە. ئەمەش بیرۆکەیەکە ئەدۆنیس، کە بانگەشە بۆ ئارەزووی بێ سیستەمو بێ کۆتوبەند دەکات، ئاگاداری نییە، هۆی ئەوەش برەوسەندنی ئەو چەپاندنەیە کە پێویستی بەجۆرێك کاردانەوەی ناکامە، واتە سەربەستیی بێ سەروبەر. بەکورتی ژن لای ئەدۆنیس دۆزینەوەیە، وەك سەردانی دارستانێك کە ئاسانو دڵنیا نییە. شاعیر، ئەو

منداڵە هەمیشە واقوڕماوو دۆزەرە هەمیشەییەیەو وەك منداڵ حەزی سەركێشی هەیە بەرامبەر بە دایكی بەخشندە.

بەو جۆرە دەبینین ئەدۆنیس هەموو بەهاكان ژێراوژووردەكات: دانایی داماڵرانە لە دانایی، ناسنامە مانای بێ ناسنامە بوونە، داخزان هەڵكشانە، خەم ڕێگەیە بۆ بەختەوەری، جەستە قیبلەنمای ئەبەدیبوونە، ژن منداڵدانو مردنە... لە هەموو ئەوانەشدا ناكۆكەكان پێكدەگەنو لە ساتەوەختێكی شڵەژانی بوونخوازیی بەپیتدا دەست لە ملانی یەكدی دەبن. سەرنج بۆ ئەوە ڕادەكێشم كە لە دیوانەكەدا شتێكی نوێ بەدیناكەین، ئەگەر مەبەست ڕیزپەڕبوون بێت لە هێڵی گشتی ئەدۆنیسیەت، جۆرێك هەمەڕەنگی دراوەتە كۆن، لقو پۆپ بۆ بنەچەكان هێنراوەتەئاراوە، بەڵام ئەوانە بە قاڵبێك داڕێژراون كە دەكەوێتە نێوان قسەخۆشیو واقوڕمانو مێشكێكی ساردەوە كە لە ماناكانو دیمەنەكان ڕادەمێنێو ئینجا بەجوانی دەیڕێژێت. تاوێك گەرمەو تاوێكی دیكەش سارد. لەڕاستیدا "سەرەتای جەستە كۆتایی دەریا"، ئەو گەرموگوڕیی سوزدارییەی تێدانییە كە لە "گۆرانیەكانی مهیاری دیمەشقی"، "كتێبی وەگۆڕانەكان"، "شانۆو ئاوێنەكان"و "كاتێك لەنێوان خۆڵەمێشو گوڵدا" دڵەكانو ئەقڵەكان دەهەژێنن. بۆیە هەندێك جار ئیقاعەكە لەسەرخۆو بێزاركارە، بەڵكو لە هەندێك جومگەدا هەست بەوە ناكەیت كتێبێك لەبارەی خۆشەویستییەوە دەخوێنیتەوە. پێدەچێت – وەك بۆدلێر دەڵێت– ئاوێتەكردنی وێناكردنی فیكریو ڕاوەشاندنی هەستەكی ئەركێكی پایەبەرزو خواستراوە، بەڵام ئەمە كارێكی ئاسان نییە، بەتایبەتی لای شاعیرێكی ئارەزوواویی وەك (ئەبو تەمام) لە بەرهەمهێنانی مانادا، بەجۆرێك كە "شێتی"ی ئەدۆنیس وەك جۆرێك لە دانایی ساردوسڕ خۆ بنوێنێ، تەنانەت ئەگەر داناییەكی جوانیش بێت.

### سەرچاوەی بابەت:

سایدی www.jehat.com

پێنج شەممەی 18ی تشرینی دووەمی 2004

# له بازنەوە بۆ ئاسۆ

ئەدۆنیس

له عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد



جۆرە باڵندەیەك هەیە، زۆر دەگمەنە، ناسینیان ئەستەمە، ئەو باڵندانە هەرگیز نانیشنەوە، مێیەکانیان لە چینە هەرە بەرزەکانی ئاسماندا هێلکە دەکەن، پێش ئەوەی هێلکەکان بکەونە سەر زەوی دەتروکێن و بێچوەکان دێنە دەرێ. ئەو مەلانە جێ بەخۆ ناگرن، نازانن حەوانەوە چیە. باڵە فڕکەیان هەر لە ترپەی دڵی ئێمە دەچێت: وەستان واتا مردن.من هیچ شتێك وەك ئەو "ئەفسانە"یەی فرنسیس بیکابیا "دایهێناوە" بە قووڵی نابینم بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی بزاوتی داهێنان و بەردەوام بوونی لە نێوان نوێنەرەکانیدا، نە لە ڕابوردوو نە لە ئێستا و داهاتوویشدا. قووڵترین نوختەی ئەم داهێنانەی بیکابیا لەوەدایە، لەسەر ئاستی داهێنان وەك سەرەتایەکی بەردەوام بوون. پێ لەسەر یەکگرتن و هاوەشێوەیی "الائتلاف و التماثل" دادەگرێت.

بەڵام لەسەر ئاستی ئەو ستراکتۆرەی داهێنانەکەی تیا بەدی دێت، جەخت لەسەر جیاوازی و وێکنەچوون "الفرق و الاختلاف" دەکات.

کەواتە، سەبارەت بە داهێنان، ڕێبازێکی دیاریکراو نیە کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابێت. بە پێچەوانەوە، ئەوەی داهێنان دروست دەکات، وێڵ بوونە، وەلێ وێڵ بوونێك نا کە بەدەوری خۆیدا

بخولێتەوە و لە بازنەیەکی داخراودا پێچ و پەنا بگرێت، بەڵکوو وێڵ بوون لە پێناو دەربازبوون بەرەو دوورتر و کامڵتر، وێڵ بوون مەستیە لە جەژنی بێ کۆتاییدا، جەژنی بزاڤ، بزاڤی مرۆڤ و دنیا و شتەکان.

کەواتە، بە ناوی چ شتێکەوە دەیانەوێت دڵی نەوەی شیعری نوێ لە لێدان بخەن؟ بە ناوی پابەندبوون بە نموونەی پێش وەختەوە/ بازنە، ئەمەیش لە بزاوتێکی میکانیکی سواودا کە بێجگە لە مردن هیچی تر بەرهەم ناهێنێت.

ئەی نموونەی پێش وەخت/ بازنە چیە؟

مەبەست جێگرتن، جێگیربوون، سەقامگیربوون، لاسایی کردنەوە و وێک چوونە، مەبەست سیستەمە، دەوڵەتە: وتەی دەستنیشان کراوە، رەفتارێکی دەستنیشانکراوە کە دەبێت بکرێت، ئەگەر یەکێک ئەو رەفتارەی نەکرد بە "لادەر" ناو دەبرێت. ئەو بریارە دەڵێت: ئەو کەسە جێی نابێتەوە کە "جیاوازە" ئەو کەسە جێی نابێتەوە کە "خەون"ی هەیە، تەنیا ئەو کەسە جێی دەبێتەوە کە پێی دەڵێن "سیستەم" وەلێ داهێنان، یان وێڵ بوونە یان هیچی تر. بۆیە پێویستە لەسەرمان، بەرەهایی، نەک هەر بە تەنیا جیاوازیەکانی نێوان نموونە و دژە نموونە بە تەواوی قووڵ بکەینەوە، بەڵکوو چەشن و شێوە و جۆر و تەرزەکانیش رەت بکەینەوە، لە باتی ئەوانە بنەمای بزوتن و رێگا و تێپەڕاندن دابنێین، بنەمای جیاوازی و خۆبوون.

وێڵبوون پێمان دەڵێت: من نە رێسام نە قاڵبم، بەڵکوو بریتیم لە ئەزموون و توانا. ئەگەر تۆی نەوەی نوێ لەگەڵمدایت، لاسایم مەکەرەوە، بەڵکوو سوودم لێ ببینە، پاشان رێگای خۆت بگرە. وێڵ بوون دەڵێت: ئەی نەوەی نوێ، ببە بە ئازادی، ببە بە جەژن، با هەمیشە داهێنانت لە گەشەسەندندا بێت، وەک گەشەسەندنی ئەو گوڵەی "نە لە خولیای خۆیدایە و نە لە خولیای ئەوەدا کە کێ تەماشای دەکات، ئەو گوڵ دەردەکات چونکە گوڵ دەردەکات"

وێڵ بوون دەڵێت: داهێنان دەست پێکردنی بەردەوام و رۆیشتنی بەردەوامە، گەڕانی بەردەوام و هاڕینی ئەو کۆسپانەیە کە ڕێ لەو گەڕانە دەگرێت، بە بەردەوامی.

وێڵ بوون دەڵێت: نووسینی قەسیدەیەک سەپاندنی نموونەیەک نیە. بەڵکوو بە مانای گەشاندنەوەی ئاگرێکە، کردنەوەی ڕێگایەکە. بۆیە ئەگەر ڕەخنەیەکم لەسەر نەوەی شیعری هەبێت، تەنیا ئەوەیە، کە ترپەی دڵیان/ باڵیان کەمە: مەبەستم ئەوەیە لە خۆبەستنەوە، خۆچواندن، خۆدانەپاڵ، خۆبەدەستەوەدانی پێش وەختە لە پێناوی حەسانەوەدا.

ئەگەر داهێنان دەربڕی ناوازەی وزەی مرۆڤ بێت، ئەوا نووسینی شیعری عەرەبی، بەتایبەتی لەم قۆناغەدا، دەبێت پشت بەم پێوانانە ببەستێت:

1-بەکاربردنی زمانی تازە کە بە تەواوی بەسەر دەربڕین و فۆرمدا زاڵ بێت.

2-ئەفراندنی بونیادێکی نوێی دەربڕین.

3-ئەزموون یان خەون لە دنیایەکی کامڵدا جێ بکرێتەوە.

4-خولیای پرومیسوسی.

5-رۆنانی پرسیاری بەردەوام. دەربارەی ئەوەی چی بەدی هێنراوە، بۆ ئەوەی هەمیشە ئاگری ناو خۆڵەمێشە کەڵەکەبوەکە لە هەڵگیرساندا بێت.

هەندێک تا ئێستا بەلایانەوە وایە کە ڕابوردو سەرچاوەیە، سەرچاوەیش سیستمێکی پێکەوە گرێدراوی تۆکمەیە کە لە ئینتیمای هاوبەش و بیری هاوبەشدا بەرجەستە دەبێت. هەروەها لە هەڵوێستی هاوبەشدا بەرانبەر بە جیهان و مرۆڤ، لە یادوەریە

مێژووییەکاندا، لەیەکگرتنی سیاسی/ پەیمانی ئاینیدا. لە ئیستاتیکای یەکگرتوو یان گونجاو لەگەڵ ئاکارە گشتیەکاندا.

هەندێکی تر وای دەبینن کە ئیدی سەرچاوە نەماوە، یەقینی رابوردوو کۆتایی پێهاتوە، ئەوان دەڵێن: تاقە شتێکی راستەقینە کە بمانەوێت لەوێوە دەست پێ بکەین، تەنیا هەرەسە. لەو هەرەسەدا، نووسەر/ شاعیر چ کەرەسە و پاڵپشتی نیە بێجگە لە وێڵ بوون. مەبەستی لە رووی ئەزموونگەریەوە، دەست پێکردنە بە نووسین لە دەرەوەی زەمان.

لێرەوە دەبینین کە نووسینی نوێی راستەقینە، چۆن دابڕان و پارچە پارچە بوون وەردەگێڕێت بۆ زمانی شیعر، تەنیا لەم پرۆسەیەشدا سەرەتا دەبینین، یان بەلایەنی کەمەوە بەڵێنی سەرەتایەک.

نووسین یان شیعری ئەمڕۆ کردەیەکی میتافۆری وەرچەرخێنەرە (تحویلی): واتا بزاڤی هەرەسەکەیە. لەیەک کاتدا، لە واقیع رەت دەکات و سۆزدارانە لە زاتی خۆیشی تێدەپەڕێنێت. بەلام بۆ ئاسۆیەکی تر. ئەم دژایەتی/ ململانێیە لە نێوان نوێ خوازی/ بوون گۆڕکێ (صیرورة) و ئەوەی دەیەوێت وەک خۆی بمێنێتەوە، دەگاتە لووتکە، کەواتە لەم لایەنەوە پەرت خوازە (بەبەراورد لەگەڵ دەستە جەمعیەکانی سیاسەت و کۆمەڵایەتیدا. رەت کەرەوەیشە (بەبەراورد لەگەڵ سوڵتە گەراییدا بە هەموو شێوە و ئاستەکانیەوە) کەواتە، هەر بەزەرورەت، تاک خوازە، شەیتانیە. بەبێ ئەمە، نووسین/ شیعر دەبێتە پاڵپشتێکی پتەو بۆ گشت کەلەپوری رابووردوو، یان ئێستایەکی بێ جووڵە. بێ ئەمە دەچێتە ناو سیستمی کارێکی راستەوخۆوە بە ئاستە سیاسیەکەیدا، هەموو پەرت خوازیەک، لەسەر ئاستی سیاسی، ئەگەر بە ئامانجی پەرتکردنی بونیات/ ڕەگەکە نەبێت، ئەگەر بۆ شکۆمەندی و تەواوکردنی نەبێت، ئەوا زۆر زوو بونیاتە کۆنە باوەکە بەسەریدا زاڵ دەبێت و قووتی دەدات.

لەم روانگەیەوە لەوە تێدەگەین کە چۆن چارەسەرکردنی کێشە جەوهەریەکان، یان کێشە رۆژانەییەکان مەودای سیاسی تێدەپەڕێنێت، هەرچەندە ئەمیان کایەی راستەقینەی ململانێکانە.

ئەمڕۆ، زمانی شیعری عەرەبی، بەرانبەر بە زمانی شیعری نەریت خوازی، رووبەرووی سێ چرکەساتی نووسینی بەیەکداچوو دەبێتەوە.

–چرکەساتی زمان: بەو پێیەی کە ئەم زمانە کیمیا (سیما)یە

–چرکەساتی زمان: بەو پێیەی سروشتی دووەمە.

–چرکەساتی زمان: بەو پێیەی کە فۆرمێکە/ واقیعێکی ترە.

چرکەساتی یەکەم: ئەو کاتەی کە زمان لە شێوازی بەکارهێنانە کۆنەکە رزگاری دەبێت، وەرچەرخانێک بەسەر شتە باوەکاندا دێنێت و واقیعەکە دەگۆڕێت. لەم حاڵەتەدا، نووسینی شیعری عەرەبی ناچارە، لەگەڵ ئەزموونی شیعری جیهانیدا، پرۆسەی چوونە ناوەک و کارلێکردن ئەنجام بدات، هەر لە بۆدلێرەوە تا جۆیس. (وەک چۆن خودی ئەزموونەکە چوونە ناویەکی لەگەڵ سۆفیگەری و ئیشراق و نائەقڵانیەتی عەرەبیدا) سازداوە.

چرکەساتی دووەم: نووسین/ شیعر سروشتی دوەمە لە ئاست سروشتی کۆمەڵایەتی/ دامەزراوەییدا، لێرەیشدا چارنیە دەبێت نووسینی عەرەبی بڕواتە ناو ئەزموونی نووسینی جیهانیەوە: هێماگەری سوریالیزم، ئیمپریشیزم، ئایندەگەری.

چرکەساتی سێیەم: نووسین دەبێتە بونیات/ دۆخێکی پەتی. لێرەدا دەبێت بەناچاری نووسینی

عەرەبی بچێتە ناو نووسینی جیهانیەوە: ڕۆمانی نویّ، دەق گەری. نووسین! واتا شێواندنی نەخشەی جۆرە ئەدەبیەکان، نەك هەر ئەوە، بەڵکوو دڕاندنیان و دەربازبوون لەو جۆرە ئەدەبە..

چونکە ئەوەی نووسەری خۆراوایی یان عەرەب دایدەهێنێت، موڵکی تایبەتی خۆی نیە. تا ئەو ڕادەیە هی خۆیەتی کە بووبێت بە موڵکی ئەزموونە مرۆڤایەتیەکان لە قۆناغە مێژوییەکاندا. بۆ نموونە نە سۆفیەت و نە ئیشراقیەت بە تەنیا موڵکی عەرەب نین، بەڵکوو موڵکی هەموو دنیان، هەروەها نە ئەفلاتونیەت و نە مارکسیەت، موڵکی ئەفلاتوون و یونان نین بە تەنیا، یان موڵکی مارکس بە تەنیا، یان خۆراوا بە تەنیا، بەڵکوو هەردووکیان موڵکی هەموو دنیان.

کەواتە دەست لەو کوێرە ئاخاوتنە بەربدەن کە دەڵێت ئەمە هاوردە "استیراد"ی بیرەکانە، مەسەلەی نووسین مەسەلەی "هاوەردە" نیە، بەڵکوو بڕوابوونە بەوەی کە ئەفراندنە مرۆڤایەتیەکان وەك دەفرە هاویەکەکان "الأواني المستطرقة" لە کات و شوێنی خۆیاندا لە جووڵە و بزاوتندان. ئەمە وەك خۆر و هەوا مافی ڕەوای هەموو کەسێکە، مەسەلەکە ئەوە نیە داهێنەر لە خۆر و هەوا جیا بکرێتەوە، یان هاوردە نەکات، بەڵکوو مەسەلەکە ئەوەیە: چۆن دەتوانێت لە ڕێگای کار و خوێندنەوەی ئەو داهێنراوانەوە، نەبرەو تایبەتمەندی بداتە داهێنانەکەی خۆی. بەو مانایەی چۆن دەبێتە شەپۆلێك بەو تایبەتمەندیەوە لە دەریای داهێنانی گەردوونی و مرۆڤایەتیدا.

لێگەڕێن با نەوەی نووسەرانی نویّ ئازادبن لە دەستاو دەستکردن و دووبارە بوونەوەی کوێرانە، ئەو کاتەی بەناوی ڕوون نووسینەوە گەڕان و سۆراخ کردن ڕەت دەکەنەوەو، بە ناوی یادەوەریەکانی مێژووەوە، ئایندە ناهێڵن.

لێگەڕێن با ئەو نەوەیە ڕێگای تایبەتی و دنیای تایبەتی دابهێنێت، ئەگەر هەڵەیش بکات، یان شکست بهێنێت، چاکترە بۆ خۆی و بۆ ئەو ڕابووردوەی دەیانەوێت بەناوی ئەوەوە کۆتی بکەن، وەك ئەوەی لاسایی شێوازێك بکاتەوە کە ڕەنگی بۆ کێشراوە، تەنانەت ئەگەر لەو لاسایی کردنەوەیەدا "ئامانج بپێکێت" یان "سەربکەوێت"

لێگەڕێن با لە پشتیرەکە بچێتە دەرەوە، لە میکانیزمی شوان و مێگەل، سەلەف و خەلەف، میرات گر و خاوەن میرات، ڕەسەن و پاشکۆ.

لێگەڕێن با ئازاد بێت، هیچ ئازادیەك لە دەرەوەڕا نایەتەدی ئەگەر لە ناوەوەدا ئازاد نەبێت. ئەم دوانە ڕووی واقیعێکن، هیچ کامیان لەوی دی جیانابێتەوە، یەك ئەوی دی تەواو دەکات. هەموو کۆیلایەتیەکی ناوەوە کۆیلایەتی دەرەوەی بەدوادا دێت. پێچەوانەکەی ڕاست نیە: گەلێك کە لە ناوەوەی خۆیدا ئازادبێت، هەرگیز قبووڵی کۆیلایەتی دەرەوە ناکات. هەموو ئازادیەك کە لە ناوەوەدا دادەمەزرابێت، حەتمەن بەسەر هەموو داگیرکردنێکی دەرەوەدا سەردەکەوێت. لە سیاسەت و ئابووریدا، لە کۆمەلأیەتی و کلتووردا.

لێگەڕێن با نەوەی نویّ پشتیرەکە وێران بکەن.

پرسیاری: شیعر چیە؟ هەر لەو پرسیارە دەچێت کە دەڵێت واقیع چیە؟ شیعر تەنیا بەرجەستەکردنی زمان نیە، بەڵکوو لەگەڵیدا بەرجەستە کردنە بۆ ئازادکردنی واقیع و مرۆڤ. ئەو فاکتەرەی گۆڕان دروست دەکات، خۆی لە خۆیدا و بەپلەی یەکەم فاکتەری گۆڕاوە. یان فاکتەر/ گۆڕانە.

بۆ ئەوەی شاعیر قەسیدەی ناوازە بنووسێت، دەبێت رووبەڕووی ژیان بێتەوە، هەموو ژیان. بەڵام رووبەرووبوونەوەیەکی داهێنەرانەی مەزن.

شیعر لەم ئاستەدا، دەقێك نیە لە پاڵ چەند دەقێکی تردا بچێتە تۆماری مێژوەوە. ئیتر دەقگەلێکی ئابووری بێت یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی، شیعر بەسەرهاتێك نیە، چوارچێوەی تری تێ بگیرێت. بەڵکوو خۆی رووداوێکە: ناچێتە نێو سیستمی ئەو "مانا"یانەوە کە ناسراون، بەڵکوو خۆی "مانا"یەکی تازە دروست دەکات. مانایەکی تازە دەبەخشێتە ژیان و مێژوو، روویەکی تریشیان دەداتێ.

بەم جۆرە نووسینی نوێی عەرەب، هەر لە سەرەتای هەست کردنیەوە، رابوردوو رێك دەخات، تواناکانی ئایندە دەکاتەوە، لەبەر ئەم رووناکیەدا، دەتوانین بڵێین، ئەمڕۆ خوێندنەوەی شیعری کۆن لە توانادا نیە، تەنیا لە بەرایی ئەو هەستانەوە نەبێت. بۆ نموونە، خوێندنەوەی سەیاب لەبەر رۆشنایی ئومروئولقەیسا، سەیاب دەکەوێتە ژێرەوە، یان هەر دەیکوژێت. وەلێ بە پێچەوانەوە، خوێندنەوەی ئومروئولقەیس لەبەر رۆشنایی سەیابدا، هەردووکیان دەدۆزێتەوەو رەهەندی نوێ بە شیعرەکانیان دەدات.

پشێویە؟ با پشێوی بێت.

بەڵام "پشێویە" بە بەراورد لەگەڵ ئەو رێگایەی کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشراوە. جا ئەگەر لە نێو ئەوانەدا کە بەو رێگا نەخشە بۆ کێشراوەدا دەڕۆن، مەحاڵ بێت داهێنەر دروست بێت. (ئەمە لە هەموو سەردەمەکاندا هەروا بوەو سەقامگیرە) ئەگەر وا بێت، ئەوا گومانی تیا نیە، کە لە هەموو قۆناغێکدا، لەناو ئەو کۆمەڵەدا کە لە دەرەوەی ئەو ڕەوتەدان، زیاد لە داهێنەرێك دەردەکەوێت.

لێگەڕێن با نەوەی نوێ دیواری پشتیرەکە بڕوخێنن، بۆ ئەوەی بڕۆنە بەر خۆر و هەوا. ڕاستە ئەوان بەرەو وێڵ بوون و لەو بابەتانەتان دەبەن. بەڵام ئەوەیش ڕاستە کە دەتان گەیەننە فەزای ئازادی و داهێنان.

## سەرچاوە:

کتێبی زمن الشعر، ادونیس.

# یادەوەریی، شوناس، مۆرك...

ئەدۆنیس
لە عەرەبییەوە: جەمال غەمبار

1-سەفەر

-1-

ئەو، سەفەر زۆر دەکات،
لە هەر سەفەرێکیشدا دەپرسێت:
ئەوە خودی خۆیەتی سەفەر دەکات،
یان ناوەکەی؟

- 2 -

ئەو دەژی و دەنووسێت،
ئەمە وەك ئەوە وایە، لەیەك کاتدا
هەم نێچیر و هەم ڕاوچییش بێت.

- 3 -

چەندێ جوانە
پەخشان بە پەیژەی شیعرا سەرکەوێت.

- 4 -

هیوا بە چیی دەخوازیت کە مەرگ چاوەڕوانت بێت؟
تۆ بژی و، هیوا مەخوازە.



- 5 -

زۆر جاران، ئەو پێی خۆشە دەرکەوێت،
چونکە واهەست دەکات هەتا بێ، زیاتر خەفە دەبێت.

- 6 -

دۆزەخیترین شتێ لە دۆزەخدا،
ئەو بەدۆزەخبوونەیە
کە بە مەرەکەبی بەهەشت نووسراوەتەوە.

2-ژن

-1-

ژن، بەدەم عیشقیەوە سەما دەکات، دەفڕێت،
کەچی بۆ جارێکیش نەیپرسیوە:
ئەوە منم بە کۆتوپێوەندەوە سەما دەکام؟
ئەوە منم لە قەفەسدا دەفڕم؟

- 2 -

خەمەکانی ژن، جوتێك چاویان هەیە
تەنها فرمێسك دەیانبینن..

## 3-شوناس



– 1 –

بڵێیت ڕەوانبێژیی لامان، لای ئێمەی عەرەب، قەرەبووی ئەو گەرموگوڕییە شاراوەیەی ناوەومان نەبێت کە لە بەر هەر هۆیەك بێت ناتوانین تەعبیری لێبکەین؟

هەر لەبەر ئەوەش بێت کە خودی"شوناس" ە عەرەبییەکە شوناسێکی زمانئامێز بێت؟

– 2 –

ئەوڕۆکە نووسین لە وڵاتانی عەرەب و لە جیهانیشدا، خەریکە لە شوناسە هونەریی و ئیستاتیکییەکەی خۆی دەردەچێت و، بەرەو "شوناس" ی بازاڕ دەچێت.

بەم پێیەش، هەتاکو "بەها "ی نووسین نزمتر بێت، "بازاڕەکەی" گەرمتر دەبێت.

– 3 –

ڕێزنان لە یادەوەریی و کەلەپوورەکەی پرسێکی گرنگ و پێویستیشە، بەڵام بەو مەرجەی وەها لەم یادەوەرییە نەڕوانرێت کە پێوەرێکە بۆ ئینتیما.

ئەو داهێنانەشی کە تیایدا شوناس بە ڕاستیی خۆی تێدا دەنوێنێت، ئەوە یادەوەریی نیە ئەو داهێنانە دەبزوێنێت، بەڵکو ئەوە هێزی خەیاڵکردنە کە داهێنانەکە دەخوڵقێنێت.

ئەوە هێزی خەیاڵکردنە کە دەروازەی ئینتیماکردن بۆ کۆی بەرهەمی داهێنەرانەی مرۆڤایەتیی لەبەردەم نەتەوە و کلتوورەکاندا ئاواڵە دەکات.

ئایینەدەش بۆ خۆی مەدارێکە بۆ هێزی خەیاڵکردن.

بەر لە هەر شتێکیش، گەوهەری ئینتیماکردن بۆ خود لە بزاوتی داهێنەرانەیدا، خۆی لەو هێزی خەیاڵکردنەدا دەبینێتەوە.

– 4 –

دایالۆگی نێوان ئایینەکان؟ بەڵێ.

وەلێ ئێستایشی لەگەڵدا بێت، لە پراکتیزەکردنی ئەم دایالۆگەدا، ئەوەی دەیبینین ئەوەیە، هەر لایەنێك لەسەر "لوتکەیەکی" دوور دەوەستێت، بە جۆرێك کە زەحمەتە بتوانێت ئەو "لوتکە"یەی تر بەدیی بکات کە لایەنەکەی تری لەسەر وەستاوە.

بۆ نموونە، چۆن دەکارێت (هەڵبژاردەیەك – مختار)ێکی خودا لەگەڵ هەڵبژاردەیەکی تر، کە ئەویش هەر لە لایەن خوداوە هەڵبژێردرابێت، دایالۆگ بکات؟

دەبێ و پێویستە بەر لەم دایالۆگە لەگەڵ ئەوی دی (الاخر) دایالۆگێکی تر لەگەڵ (خود – الذات) دا بکرێت بۆ ئەوەی ڕێگە خۆشکەری دایالۆگەکەی تر بێت. ئەم دایالۆگەش لەگەڵ خود دەبێت ئەمانە لە خۆ بگرێت:

1–پەیوەندیی ئەم خودە بە خۆی و بە "شوناسەکەیەوە"

2-پەیوەندیی ئەم خودە بە مەعریفەت و حەقیقەتەوە

3-ڕوانینی ئەم خودە چییە بۆ"جیاوازی – الإختلاف" و ئایا بە – باطل – ی ئەداتە قەڵەم یاخود وای دادەنێت کە بەشێکە لە – حەقیقەت -؟ بە بێ ئەمەش، ڕەنگە دیالۆگی نێوان ئایینەکان نەک هەر لە ئاستی "نیشتمانییدا" بەڵکو لە ئاستی " جیهانییشدا" ببێتە هۆی دامەزراندنی سیستمێکی تازە، ئەویش سیستمێکی خاڵیی دەبێت لە بیر (نظام اللافکر).

ئەز پرسیارێك لەو کەسانە دەکەم کە لە ئەمڕۆکەدا سەروکاری ئەم دیالۆگە دەکەن:

+بۆچی بانگەشەمان دەکەن بۆ باوەڕهێنان بە ئایینێکی "تایبەت" هەتا ئەو ڕادەیەی کە نکوڵیی لە حەقیقەت بکەین بەو سیفەتەی کە حەقیقەت خاڵێکی "ناوکۆیی" سەرجەم مرۆڤایەتییە؟

## 4 – سیاسەت

- 1 -

سیاسەتی بیانیی لە وڵاتانی عەرەبدا، لەسەروەختی خۆی و ئێستاشی لەگەڵدا بێت، جۆرێکی ترە لە "پەروەردە" کردنی جۆرێکی تر لە "مریشك".. دیارە لەوەشدا سروشتی ڕژێمەکان و سروشتی " بونیاتی "کۆمەڵایەتی، لەبار و یارمەتیدەر بون و هەر یارمەتیدەریش دەبن بۆ خوڵقاندنی ئەو حاڵەتە. کۆڵەکەی ئەم بونیاتەش (گروپ) – (تایەفە)، یان (قەبیلە) و (ئوممەت) و (نەتەوە)...هتدن و ئەمانیش پابەندن بە ڕژێمێکەوە کە نوێنەرایەتییان دەکات، یاخود لەگەڵیاندا وێکدێتەوە (یتطابق معها).

هەر ئەمەشە بۆتە هۆ و هەر دەشبێتە هۆی "دورخستنەوەی" ژیانی عەرەب لە دیموکراسیی و ئازادییەکان و مافەکانی مرۆۋ – تاك – ەوە.

ئەرکی سەرەکیی لە ڕووی سیاسیی و کلتوورییەوە لەمڕۆکەدا بریتییە لە ئیشکردن بۆ گۆڕینی عەرەب لە کۆمەڵگەی (گروپ) و (ئوممەت) و (تایەفە) و..هتدەوە بۆ کۆمەڵگەی تاکەکان، کۆمەڵگەیەك تیایدا تاك خۆی گەورەی خۆی و فیکر و ژیان و چارەنووسی خۆی بێت. ئەمە وەنەبێت بانگەشەیەك بێت بۆ تاکگەرایی (الفردیة) یاخود (نێرەکەڵێتیی– الفحولة)، نەخێر، بەڵکو بانگەشەیەکە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگە لە سەر بنەمای بوونی تاکەکان و مافەکانیان، نەك بنەمای تایەفە و قەبیلە، کۆمەڵگەیەك تیایدا بە پلەی یەکەم بایەخ بدرێتە تاك نەك کۆ. هەر لە ناو ئەم پێودانگەشدایە دینامیەتی فیکریی و کۆمەڵایەتیی دەخوڵقێن و، بناغەش بۆ بنیاتنانی دیموکراسی و ئازادی و مافەکان دادەمەزرێت.

بە بێ ئەمەش، ئەو جۆرە "پەروەردە" (پەروەردەی مریشك ئاسا – وەرگێڕ) بەردەوام دەبێت و، پەیوەندییەکانی ناوەوەی کۆمەڵگەش هەر

لەسەر بنەمای توندوتیژیی دەمێننەوە. توندوتیژییش، بە تەنها توندوتیژیی لێدەکەوێتەوە و، دەبێتە مایەی ڕاپێچکردنی زیاتری کۆمەڵگە بەرەو دارمان.

– 2 –

ئایا لە ڕاستییدا چ دایالۆگێك هەیە لەنێوانی عەرەب و ڕۆژئاوادا لەدەرەوەی سیاسەت و بازرگانییدا بەو شێوەیەی کە هەندێك دەیڵێن، یاخود هەندێکی تر وای بۆ دەچن؟

وەلێ دایالۆگی ئێمە لە سیاسەتدا، بە تەنێ "گوێگرتنە "، لە بواری بازرگانییشدا، دایالۆگی ئێمە بە تەنێ " یخدانە – الإنقیاد" (یخدان – مەبەست لە نەبوونی ئیرادەیە –وەرگێڕ).

ئیدی بەدەریش لەو دوو شتە،

–ڕۆژئاوا بە "ئاییندە" ی خۆیەوە دایالۆگمان لەگەڵدا دەکات و،

–ئێمەش بە "ڕابوردوو"ی خۆمانەوە دایالۆگیان لەگەڵدەکەین.

## 5 – محەمەد ماغوت

شاعیری ئەڵمانی نۆڤالیس دەڵێت: (سەرەتای ڕەسەن بریتییە لە شیعر – سروشت و، کۆتاییش بریتییە لەسەرەتای دووەم: شیعر – هونەر).

بە پێی ئەو قسەیەی سەرەوە، سروشتی قسەکردن لەبارەی ماغوتەوە بریتی نییە لە شوێن، بەڵکو بریتییە لە مۆرك (الطبع).

نوسینی ماغوت، بە چەشنی یەکەمین نووسینی عەرەبیی بریتییە لە سروشت – مۆرك. بەو پێیەش، ماڤ خۆی بوو کە کێشی شیعر بکاتە پێخۆری پەخشان و، تخوبی جیاوازیی نێوان پەخشان و شیعر بسڕێتەوە. بە جۆرێك، هەڵاوێرکردنی ئەو دووانە لە یەکتر، لانی کەم، بۆتە شتێکی ئەستەم.

ئەمیستا، دەشێت بپرسین، ئایا چیدی کێش (الوزن) شتێکی حەتمییە بۆ شیعر؟

وێڕاش، دەشێت بپرسین، ئایا دەکرێت پەخشان ببێتە جۆرێکی تر لە شیعر؟

ئێمە نووسینی ماغوت بەو شێوەیە وەسفدەکەین کە ژیانی دووەمی خۆیەتی:

–لێرەو لەوێ، دەبێت بە چەکی گاڵتەجاڕیی زەفەر بە کۆست ببرێت،

–دەبێت بە هۆی زامەوە، زمان تاقیبکرێتەوە،

–لە سادەیی عیبارەتیشدا دەبێت بنەچەی ژیان ڕەگاژۆ بێت.

### سەرچاوە:

گۆشەی (مدارات)ی ئەدۆنیس، ڕۆژنامەی (الحیاة) ی لەندەنیی – ژمارەی ڕۆژی پێنجشەممەی 13 ی 4 ی 2006.

سایتی نێتی: www.daralhayat.net

## دەلیلێك بۆ سەفەر
## لە دارستانەکانی مانادا

ئاوێنە یانی چیی؟
ڕوخساری دووەم و
چاوی سێیەمە.

پەلکەزێڕینە یانی چیی؟
جەستەی هەور و
جەستەی خۆر
ئەو دەمەی لە ڕاکشانێکدا

لەسەر جەستەی زەمین،
ئاوێزانی یەکتر دەبن.

ئەی کەنار یانی چیی؟
سەرینێك بۆ شەکەتیی شەپۆل.

قەسیدە یانی چیی؟
منداڵێك
هەمیشە بە شیرە خۆرەیی دەمێنێتەوە.

ئەی خۆرئاوابوون یانی چیی؟
ئارەقەیەکە لە جەستەی خۆر دەتکێ.

خەون چییە؟
برسییەك
لە کوتانی دەرگای واقیع تێر نابێت.

ناووك(*) چییە؟
نیوەی ڕێگای
نێوان دوو بەهەشتە.

ئەی ماچ یانی چیی؟
چنینەوەیەکی ئاشکرای
بەروبوومە نەبینراوەکانە.

ئاسۆ یانی چیی؟
فەزایەکی، بێ حەد، جوڵاو.

ئەی مانا یانی چیی؟
سەرەتای بێمانایی و
کۆتاییەکەشێتی.



(*) ناووك: ناووکی مرۆڤ کە دەکەوێتە نێوان سنگ و بەرموسڵدانەوە. (السرة)

سەرچاوە:

سایتی نێتی
www.geocities.com/matrxist_Ib /Adonis.htm
ڕۆژی 11 ی 4 ی 2006.

# دوو گفتوگۆ لەگەڵ "ئەدۆنیس" دا

**لە عەرەبییەوە: عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا**

**ئەدۆنیس:**

**-شیعر: گوزەرکردنە لە بینراوەوە بۆ نەبینراو.**
**-هەموو شاعیرێکی گەورە پەیامبەرێکە بۆ خۆی.**
**-شیعر، لە ترۆپکی هێزی تەعبیرکردندا جگە لە فەشەل شتێکی دیکە نییە، بەڵام فەشەلی سەرسوڕمێن لەوە گەورترە بە سەرکەوتن پێوانە بکرێت!**
**-لە وڵاتی ئێمە رۆشنبیریی دۆزەخێکە لە وشە**



**(1)**

ئەدۆنیس کێیە؟

چۆن ئەو پێشەنگە لە گوندە دوورەکەی خۆی لەباکور زاتی ئەوەی کرد، ئەو هەموو بەربەستە باوانە ببڕێت، ماناکان تێکبشکێنێت، (ئەلکتاب) بنووسێت؟

ئەدۆنیس کێیە؟

ئایا یەکێکە لە بازنەکانی شیعر، یان دامەزرێنەری دەنگە بەرزەکانی (المواقف)ە، یان دوای ئەوەی سەرەتاکان دەرگاکانی خۆیان داخست، بووە شاعیری کۆتاییەکان؟

ئەدۆنیس کێیە؟

شاعیری قەسیدەکانی بەراییە، یان گۆڕهەڵکەنی

مردووه- زیندووەکان، یان کوڕی نکۆڵیکردنه، نکۆڵیکردنێك که تەواو نابێت، یان سۆفییەکه خۆی له کراسی تێکۆشەردا حەشارداوه؟

عەلی ئەحمەد سەعید ئەسبر کێیه؟

له سەرەتا به شیعر درێژەی پێداو تێکەڵەیەك بوو له ڕۆمانسییەت و ڕەمزییەت، پاشان بەرەو دارستانی وشه گوزەری کرد، سەرەتا لەوێ دەستی بەبینین و کەشفکردن کرد، ئێمەش لەگەڵی به پێچەکاندا گەشتمان بەرەو غەزالی و نفێری و سان چۆن پێرس کرد، دوای ئەزموونەکانی، له دوای بیرکردنەوەکانی، دوای ئەوەی بەو وەسفەی که برینێکه ناوی خۆی نووسی، له پاڵ شای هۆزەکانمان، گۆڕی نیویۆرکی بونیاد نا، بەرەو تاك به شێوەی کۆ گوزەری کرد، ئەمڕۆش به ناوی موتەنەبی بۆ لامان گەڕایەوه.

دەپرسین بۆ موتەنەبی؟

ئایا له بەر ئەوەیه که شاعیر-پەیامبەر-شایه؟

ئایا موتەنەبی وێنەیەکی نوێی ئەمروئەلقەیسه؟

ئایا ئەدۆنیس له (ئەلکیتاب) دەیەوێت پێمان بڵێت که خۆی وێنەی سێیەمه له تێکەڵبوونی دووان به پەیامبەر جبران ؟

پرسیار لەدوای پرسیار.. نازانێ چۆن بپرسێت، بەڵام ئەو له وەڵام ناترسێت، وەك ئەوەی که ژووانی لەگەڵ لێکدابڕانی نوێدا هەبێت، وەك ئەوەی له هەموو جارێکدا بۆ ئەوەی کۆتایی رابگەیەنێت، دەست پێبکاتەوه.

بەرەو کتێب و شاعیر گوزەرمان کرد، تاکو لەگەڵیاندا گەشتێك بۆ لای نادیار بکەین. ئەو لێرەدا لەو دەوروبەره چاوەڕێمانه، بۆ ئەوەی بانگمان بکات، که زێتر بچینەوه ناوەوەی خۆمان.

(ئەلیاس خوری)

***دوا کتێبت (ئەلکیتاب) ناونیشانێکی زۆر گەورەی لەخۆدا هەڵگرتووه - وەك کتێبەکەی سێبەوەیهی، وەك کتێبی ئایینی. سەرەڕای ئەوەش (ئەلکیتاب) کۆمەڵێك خوێندنەوه لەخۆ دەگرێت: خوێندنەوەی مێژوو، خوێندنەوه بۆ شاعیرانی عەرەب، خوێندنەوه بۆ موتەنەبی، هەروەها له سیرەی زاتی دەکات، تۆ بۆ لەم ئاستەدا گەشت به نێو مێژوودا دەکەیت؟. پێوانەکانت، ئەو ئاسته نزیکانەی که پشت پێ بەستوون کامانەن؟**

-ئەو پرسیاره وام لێدەکات باسی خۆم و شیعری خۆم بکەم، منیش رقم لەوه دەبێتەوه، بەڵام هەوڵدەدەم له نێوان خۆم و شیعر و کارەکانم مەسافەیەك دابمەزرێنم.

(ئەلکیتاب) وەك فیکره، له بنەڕەتدا فیکرەیەکی عەرەبییه، بەڵام یەکەم کەس که وەك تیۆر له خۆرئاوا لەو فیکرەیەی روانی مالارمێ بوو. بەڵام بەر له تیۆرەکەش فیکرەکه لای عەرەب هەر هەبوو، فیکرەی ئەوەی که لێرەدا (کتێبێك) هەیه، به شێوەیەکی بێ کەموکورتی و تەواو قسه له دنیا دەکات، نموونەی ئەسڵی ئەو فیکرەیەش له کتێبی ئایینییەوه دێت، کتێبەکەی سێبەوەیهی که بەشێکی له بارەی زانستی زمانی عەرەبییه، ئەوه هەرگیز ئاواتی من نەبووه، بەڵکو من هەوڵمداوه له بارەی ئەو ژیارییه مەکۆیەك بۆگوتنی دیدەکەم دابمەزرێنم، نەك بۆ گوتنی شتەکانی کۆتای. خۆشبەختانه وشه به شێوەی بەش بەش نەبێ هەموو شتەکان ناڵێت، وەك ناشێ مرۆڤ تەواو ببێت. بۆ ئەوەی ئەو سیفەته له گوتن و کتێب نەفی بکەم ئەو ناونیشانه بچووکه "امس المكان الان"م بۆ دانا. لەو بارەیەوەو بەو چەمکەی که تۆ خستته روو، من له سەر ئاستی نزیکایەتی له کۆمیدیای خواوەندی دانتییەوه نزیکم نەك له کیتاب.

پێدانی ئەو شێوەیەی ئێستا به (ئەلکیتاب) بۆ من گران وەدەست هات، سەرەتا گرانابیەکه ئەوه بوو که دەبا له رێگەی ئەو ئەزموونەی تیایه ژیاوم

توانای ئەوەم هەبێت خوێندنەوەی خۆم بۆ ژیاری عەرەبیی دەربخەم، بۆیە ماوەیەکی زۆر کارم لە سەر شێوەی ئەو کتێبە کرد، زیاد لە چەند جارێك گۆڕیم، دواجار لە یەك رووی لاپەڕەدا لە سەر ئەو سیٚ زەمەنە گیرسامەوە: رابردوو–ئێستا–داهاتوو، هەروەها هەڵگری ئەو سیٚ زەمەنەش دوو کەس بوون، هەندێکجار ئەو دوو کەسە دەبوون بە یەك کەس، هەندێجاریش دژبە یەك دەبوونەوە، رابەری خوێندنەوەم موتەنەبی بوو، هەروەها ژیان و ئەزموونیشم دوو فیکرەکە بوو.

واتە وەك دەزانن هەر لاپەڕەیەك پێکهاتبوو لە پەراوێز کە خۆی وەك یادەوەری موتەنەبیی دەسەپێنێت، هەروەها باکگراوەندی مێژوویی و بەشی لای سەرەوەی ناوەڕۆك کە دنیا لەویٚ لە رێگەی ژیانی موتەنەبی و شێوەی ژیانیی موتەنەبییەوە قسە دەکات، لە نیوەکەی دیکەی ناوەڕۆکیش شاعیر لە رێگەی بیرکردنەوەیەکی ئازادەوە قسە دەکات، گوتنی شاعیر دەکەوێتە دەرەوەی کات و شوێنەوە، وەك چۆن دەکەوێتە دەرەوەی بەشی لای سەرەوەی ناوەڕۆکیش.

***بۆ بەو خوێندنەوەیە هەڵساویت؟**

–وەك سەرنجتان دا خوێندنەوەکە خۆی لە مەسەلەی ئایینی بە دوور دەگرێت، تەئکید لە مەسەلەی هونەری لەلایەك و لای دووەم سیاسی دەکاتەوە، لە ئایین خۆم بە دوور گرتووە، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە سیاسەت جەختی لێدەکاتەوە، واتە بە شێوەیەکی زۆر بازنەیی.

لە خوێندنەوەکەمدا دەبینی میکانیزمی سیاسی لە سەر توندو تیژی وەستاوە، من دەمەوێت بەرەنگاری ئەو توندو تیژییە ببمەوە. لە بەرامبەر ئەو توندوتیژییەشدا شاعیرە بە پەراوێزکراوەکان هەن، کە ناسنامەی مێژووی عەرەبیان داهێناوە. خوێندنەوەم بۆ سیاسەت خوێندنەوەیە بۆ ئەو توندوتیژییە، بۆ ئەو خوێنە بە پیتە، هەروەها خوێندنەوەیە بۆ ئەو گوتەزایەی کە مرۆڤی لا بیٚ بەهایە.

سوورم لەسەر ئەو سادەکردنە– بەلاٚم نامەوێت لە پرسیارەکان دوورتر بچم.

## ناوەڕۆك و پەراوێز لە یەك کاتدا

***موتەنەبی وێنەی کەمالی شیعری عەرەبیە، وەك دەزانن ئەو ترۆپکی شیعری عەرەبییە، تۆ وەك بنەمایەك بۆ کارەکەی خۆت بەکارت هێناوە- ئەو پەیامبەرە، یان بۆ فیکرەی شاعیر–پەیامبەر–پاشا- بەردەوامییە، بۆچی ئەوت هەڵبژاردووە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە ئەو ناوەی تۆ بە هوشیاریی یان ناهوشیاری هەڵتبژاردووە، دووبارە بەردەوامی ئەو رێبازە پەیامبەرییە بۆ شیعری عەرەبی دەهێنێتەوە؟**

–لێرەدا لە هەڵبژاردنی موتەنەبی لایەنێکی ناهوشیارانە هەیە بۆ تاڤی منداڵی دەگەڕێتەوە. بەلاٚم لە ئاستی هوشیاریدا لەبەر ئەوە هەڵمبژاردووە چونکە لە مێژووی عەرەبیدا نوێنەرایەتی موفارەقەیەکی گەورە دەکات. موتەنەبی لە یەك کاتدا ناوەڕۆك و پەراوێزە: لە ناخی هەموو رووداوە سیاسی و شیعرییەکاندایە، لەگەڵ ئەوەشدا لە پەراوێزدایە، دەبایە لە لێواریش بێت، ئەو موفارەقەیە حاڵی هەموو شاعیرە گەورەکان بووە، کە لە نێو رۆشنبیریدا دەیانبینی و لە لایەکی دیکەش دەیانبینی، ئەو دوا کەس بوو کە بە بەشێك لەو ناوەڕۆکە دادەنرێت، ئەو لایەنە شاراوەو قوڵەش لە سیرەی موتەنەبی قسەی لێنەکراوە، سەرەڕای لایەنەکانی ژیانی کەسێتی، هەموو ئەو شتانەی کە لەبارەی ئەوەوە دەیڵێن جگە لە مەسەلەیەکی گشتی شتێکی دیکە نین، بەلاٚم من وەك سەربزێوترین

بوونەوەری سەردەمەکەی خۆی وێنەم گرتووە، سەربزێوترین بوونەوەری مێژوویی! ئەو موفارەقەیە وای لێکردم موتەنەبی هەڵبژێرم.

هەروەها هۆیەکی دیکەش هەیە ئەویش ئەوەیە، کە هەموو شاعیرانی عەرەب جگە لە (مەعەری) لە دەرەوەی پرۆژەی دنیابینییەوە شیعریان نووسیووە (واتە لە نووسینی شیعردا پرۆژەیەکی دنیابینیان نەبووە-و:ك). شیعریان وەك ئەزموونێکی سۆزاوی نووسیووە، دنیایان لە ڕێگەی پەیوەندی شاعیر بەو دنیایە سەیر کردووە. بەڵام موتەنەبی شیعری وەك ئەوە نووسیووە وەك ئەوەی لە دنیادا غەرق بووبێت، وەك ئەوەی کە لە پرۆژەیەکی سیاسی و فیکرییەوە هەڵقوڵابێت، بە بڕوای من گرنگی (مەعەری)و (موتەنەبی) لەوەوە دێت کە شیعریان لا لە ئەزموونی کەسێتی پێ گەورەتر بووە.

## مێژووی شیعر و مێژووی دەسەڵات

***تۆ ئەلکیتاب بە کۆمیدیای خواوەندی بەراورد دەکەیت، من (رساله الغفران)ی (ئەبو عەللای مەعەری)م بیر خستییەوە، بەڵام پێم سەیر بوو تۆ جیاتکردەوەو پشتت بە موتەنەبی بەست.**

-(رسالة الغفران) لە چوارچێوەیەکی خەیاڵی نیمچە ئایینییەوە نووسراوە، من ویستوومە ئەوە تەجاوز بکەم، من ویستوومە لە نێو مێژوودا لە بارەی ژن و پیاوەوە بنووسم.

وابزانم هۆیەکی مێژووی رووتە چونکە (موتەنەبی) دوای نزیکەی سەدەیەك لە پاش (ئەبو تەمام)ەوەیە، ئەو بە خۆی دەڵێت کە بووە بە قوتابی ئەبو تەمام. سەرەتاکانم (پێشەکی)ەکەم لە سەر دوو دامەزرێنەر کورتکردۆتەوە، لە بەر ئەوەی (موتەنەبی) دواتر هاتووە بۆیە ناشێ لەو قسەکردنانەی کە بە دامەزرێنەری تازەگەرییەوە بەندە قسە لەو بکەین، بەڵام موتەنەبی وەك کە دوێنێ دەمدی ئەمرۆ دەیبینم بۆ خۆی بەرهەمی پێگەیووی خودی ئەو دامەزراندنەیە. بۆیە ناشێت لە سەر ئاستی میتۆد و ئاستی زانستی فەرامۆشی بکەین. بەڵام کە من (موتەنەبی)م وەك دامەزرێنەرێکی تازەگەری نەخستە روو، لە بەر ئەوەیە کە دامەزرێنەر ئەوە نییە، لە هەمووان گرنگتر بێت، دەشێ گرنگی لەوانی دیکە کەمتر نەبێت. موتەنەبی تەواوترین پرۆژەی تازەگەری عەرەبییە لە پرۆژەش گەورەترە، موتەنەبی لە ئەلکیتاب هەر تەنها نموونە نییە، بەڵکو نوێنەرایەتی موفارەقەکان دەکات.

***لە ئەلکیتاب مێژوو دەخوێنینەوە، وەك ئەوەی مێژووی دەسەڵات و ململانێکردن بێت لە سەر دەسەڵات، مێژوو وەك ئاوێنەی تاوانەکان خۆی دەنوێنێت، ئایا ئەوە وایە؟**

-ئەوەی لە ئەلکیتاب دەیخوێنیتەوە، جگە لە مێژووی ململانێی دەسەڵات نەبێت، شتێکی دیکە نییە، ئەوەش مێژوو ناگرێتەوە، مێژوو لەوە زۆر بەرفرەوانترە. لە ئەلکیتاب من ناچار نیم هەموو لایەنەکانی مێژوو چارەسەر بکەم، ناوکۆیی لە ئەلکیتاب ناوکۆیی قسەکردنە لەسەر مێژوویەك کە دەسەڵات نووسیوویەتییەوە، نەك مێژووی رۆشنبیریی، یان کۆمەڵایەتی.

***هەڵبژاردنی مێژووی دەسەڵات چ پەیوەندیەکی بە هەڵبژاردنی موتەنەبی دایە؟ مێژووی دەسەڵات و مێژووی شیعر لە ئەلکیتاب هاوسەنگی دەبن و روو بەرووی یەکتر دەبنەوە، واپێدەچێت ئەو هەڵبژاردنە بۆ تۆ وەك هەڵبژاردنی موتەنەبی بکەوێتەوە، بەو سیفەتەی کە پیاوی نێو سیاسەت بووەو هەوڵیداوە بو دەسەڵات بگات.**

-مێژووی دەسەڵاتم هەڵبژاردووە، چونکە پەیکەری کۆمەڵگەی عەرەبی دەسەڵاتە، هەموو ئەوەی لە مێژووی عەرەبیدا هەیە بە دەوری

دەسەڵاتدا دەخولێتەوە، موتەنەبی لە نێو پەیوەندیەکی دەوڵەمەند و پەڕوپۆدار لەگەڵ دەسەڵات ژیاوە، لێرەدا ناشێ بۆ هەڵبژاردنی نەخشەیەکی پێشینە لە ئارادا هەبێت.

***کەواتە هەڵبژاردنی دەرئەنجامی زیاد لە ڕێکەوتێکە؟.**

–ڕەنگە، بەڵام ناشێ لە کۆمەڵگەی عەرەبی بگەین، تەنها بەهەڵوەشانەوەی میکانیزمی دەسەڵات نەبێت.

***هەموو ئەوەی لە ئەلکیتاب کردووتە، وەك کۆتایی سەردەمی ڕێنیسانس بێت وایە؟.**

–لەگەڵ پارێزیم بۆ بنەماکان، بەڵام ئەلکیتاب هەوڵدەدات دەسەڵات وەك ئەوەی کە عەرەب پرۆسیسەی دەکات ریسوا بکات. مێژووی عەرەب بە دیاریکراوی پێش هەموو شتێك مێژووی دەسەڵات بووە، هەتا زانیاری و فەلسەفە و ئەدەب، یان ئەوەتا ڕۆشنبیری دەسەڵات بوو، یان دژ بە دەسەڵات، هیچی دیکەی دانەهێناوە، ئەوە دەسەڵاتە کە خۆی لەو وێنانەدا دەخاتە ڕوو، منیش وەك چۆن دەمەوێت ئاوا دەیخەمە ڕوو. دەکرێت مێژوو وەك زنجیرەیەکی بەدوا یەکدا هاتووی کوشتن و بڕین بەدوایدا بچین، کە بە درێژای (1500) ساڵ دابڕانێکی تێنەکەوتووە.

***لە ئەلکیتاب کۆمەڵێك لایەنی بە نرخی ژیانی کەسی موتەنەبی تیایە، بەڵام هیچ لایەنێکی بە نرخی ژیانی کفتوگۆکەری تیا نییە کە خۆتی.**

–ئەوە بەشی یەکەمە، کە لە بنەڕەتدا جەخت لە سەر موتەنەبی کراوە، دەبێت چاوەڕێی هەر دوو بەشەکەی دیکە بکەیت تاکو پرسیارەکەت ڕاست بکەوێتەوە.

***مەبەستت چییە؟.**

–بۆ ئەوەی لە قسەکردندا نەکەومە تێهەڵقورتانی خودی خۆم هەوڵمداوە مەسافەیەکی نیمچە زانستیانە یان بابەتیانە لە نێوان خۆم و ئەوەی کە قسەی لێدەکەم دابمەزرێنم، هەروەها هەوڵمداوە زۆر بە وردی و زۆر بابەتیانە بیانڵێم، دەشێ لە بەشەکانی داهاتوو مەسەلەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت.

## شیعر کەموکوڕی دنیا تەواو دەکات

***یەکێك لە خوێندنەوەکان شیعر وەك ئاوێنەی ژیان وەسف دەکات، کەچی تۆ واتکردووە شیعر وەك ئاوێنەی شیعر بێت، وەك ئەوەی ئەلکیتاب گەمەی ئاوێنە جۆراوجۆرەکان بێت.**

–من بڕوا ناکەم شیعر ئاوێنەی واقیع بێت. شیعر دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەوە نییە کە تیایە ژیاوین. شیعر بە نیسبەت من ئاوێنەیەکی ڕەنگدەرەوە نییە، واقیعیش نییە، نە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی خودە، نە تەعبیرکردنە لە خود، ئەگەر وشە نەتوانێت شتێك ئاشکرا بکات، چۆن خودی خۆی ئاشکرا دەکات؟!.

شیعر بە نیسبەت من تەواوکەری ئەو کەموکوڕییانەیە کە لە دنیاو مرۆڤدا هەیە، ئەوەی لە پەراوێزی ئەلکیتاب مەبەستمە دووبارە بەرهەمهێنانەوەیە، بەڵام ناوەڕۆك جیاوازە، کۆمەڵێك دەنگی جۆراو جۆرو جیاواز لە نێوان پەراوێز و نێوەی لای سەرەوەی ناوەڕۆك و نێوەی لای خوارەوە هەیە.

## هەموو شاعیرێك پەیامبەرە

***ئەگەر شیعر تەعبیر نەبێت، یان بەرجەستەکردنی شتەکان نەبێت، کەواتە دەبێتە ئایین، یان ئەوەی لە ئایین دەچێ. ئەگەر بەو گریمانەش ڕازی بیت، کەواتە تۆ شیعر لە بەرامبەر ئایین دادەنێیت، لای عەرەب ئەو ململانێیە نەناسراو نییە.**

—له شێوەی پرسیارەکەت رازیم، ئەگەر بۆ دیاریکردنی ئایین بگەڕێینەوە و ئایین دامەزراوێك بێت و راستەوخۆ بەکاروباری ژیانی کۆمەڵایەتییەوە بەند بێت، لەو بڕوایەدام کە ئەو لەیەکتر نزیك کردنەوەیە هەڵە بکەوێتەوە، هەروەها ئەو دیاریکردنە بە سەر ئایینی ئیسلامیدا پراکتیزە نابێت، چونکە خۆی وەك بۆچوونێکی دنیایی دەخاتە روو، بۆچوونێك کە لە بۆچوونی ئایینی جیا نابێتەوە، وەك مێژووش ناتوانین دووەم لە یەکەم جیا بکەینەوە (واتە ناتوانین بۆچوونی دنیایی لە بۆچوونی ئایینی جیا بکەینەوە. و:ك) ئێمە لە نێو مێژوودا لە ژێر ئەو دوو بۆچوونە بەیەکەوە نووساوین، بۆیە بەپێی بۆچوونی باو نەبێت ناتوانین لە ئایینی ئیسلامی بگەین، ئەگینا ئێمە ناتوانین هیچ مەعریفەیەك لە دووتوێی ئەو سنوورە دابمەزرێنی، کە دیاریکردن تیایە گران دەکەوێتەوە.

بەڵام ئەگەر ئایین سیستەمێك بێت لە پەیوەندی نێوان بینراو نەبینراو، مرۆڤ وغەیب، وابزانم شیعر لێی نزیك دەبێتەوە، ئایینیش —خودی ئایین— دەبێتە جۆرێك لە شیعر، بەو مانایەش هەموو شاعیرێك دەبێتە پەیامبەر. درێژەی پێدەدەم و دەڵێم هیچ شاعیرێکی گەورە نییە کە بینراو بۆ ئەو نەبێتە دەریچەیەك بە رووی نەبینراودا. بەو مانایەش هەموو شاعیرێکی گەورە دەبێتە پەیامبەر. هەروەها من ناڵێم موتەنەبی پەیامبەر نەبووە. بەڵکو من پێموایە ئەو ئاوایە.

***ئایا ئەوە بەو مانایە نییە کە ململانێیەك لە نێوان شاعیر و پەیامبەردا هەیە؟.**

— کاتێك کە پەیامبەر بە تایبەتی هەوڵدەدات پێشبینیەکەی بکات بە دامەزراو، ئیتر کۆتایی دێت، بەڵام کاتێك کە شاعیرێك پێشبینیەکەی ناکات بە دامەزراو، داوای لێناکرێت.

***لەو بڕوایەدانیت کە لە مێژووی عەرەبیدا موتەنەبی ئەوەی نەکردبێت؟.**

—موتەنەبی شاعیرێکە تێگەیشتنی بەد دەکەوێتەوە.

***بەڵام ئەو دامەزراوەی دامەزراندووە.**

—دەشێ، بەڵام ئەوە تاوانی ئەو نەبووە.

***بەو مانایە کەواتە ئەوەی ئایین دایدەمەزرێنێت هەڵەیە.**

—بە تەواوی نا، لێرەدا کۆمەڵێك یاسا و ئەحکامی رێگا پێدراو هەن، کە شاعیر ناتوانێت رێزیان لێبگرێت.

## تازەگەری کوا؟

***ئایا پێتوا نییە ئەو قسەکردنانەی کە دەیکەیت، هیچ پەیوەندییەکی بە گوتاری تازەگەرییەوە نەبێت، گوتاری تازەگەری پشت بە رۆمانسیەت دەبەستێت، بە گۆڕان و فشۆڵی زەمەن و بەدواداچوونی تەعبیرکردن دەبەستێت، بەڵام تۆ قسە لە شیعری نازەمەنی و نا تەعبیری دەکەیت.**

—تۆ بۆ تازەگەری وەك شۆڕشێك وەرناگریت، کە بە سەر سێنتەری گەردووندا دەکرێت، ئەویش خوایە، تا مرۆڤ شوێنی بگرێتەوە. هەڵەی تازەگەری عەرەبی ئەوەیە کە سوود لەو مەسەلە وەرناگرێت، بەڵکو بە چوارچێوەی باوی دەبەستێتەوە، شۆڕشیش بەس لە تەبەنی کردنی شێوەگەلێکی تەعبیری نوێدا کورت دەکاتەوە، بەڵام ئەو بۆچوونە تەقلیدییە. ئەگەر سەرنج لە دەقەکان بدەین ئەو بۆچوونە تەقلیدییە دانەبڕاوە دەدۆزینەوە، لەوێوەش دەبینین رەگ و ریشەی رۆشنبیریی بە هیچ شێوەیەك بەر تازەگەری نەکەوتووە، ئەوەیە کارەساتی ژیانی فیکری عەرەبیی.

***ئەو شاعیرەی کە ئێستا قسە دەکات شاعیری قەسیدەکانی سەرەتاو (اوراق فی الریح)ە؟.**

—هەموو قەسیدەیەك كە دەینووسم، هەتا (ئەلكیتاب) كاتێك دووبارە دەیخوێنمەوە هەستدەكەم كە من ئەو كەسە نیم نووسیوومە، چونكە تەواوم ناكات و بۆشاییەكانم پڕ ناكاتەوە، دەژیم دەنووسم و پڕ بە هەبوونی خۆم هەستدەكەم من من نیم. بۆیە لەو بڕوایەدام كە شیعر لە ترۆپكی هێزی تەعبیركردندا جگە لە فەشەل شتێكی دیكە نییە، چونكە ناشێ وەلاَم بێت: هیچ وەلاَمێك لە ئارادا نییە كە مرۆڤ لە دنیادا وەلاَمی پێبداتەوە، بەڵكو فەشەلی سەرسوڕمێن گەورەترەو بە خودی سەركەوتن پێوانە ناكرێت.

كاتێك ئەوەی نووسیوومە دەیخوێنمەوە هەستدەكەم كە من شیعرم نووسیووە، لە هەمان كاتیشدا هەستدەكەم زۆر لە شیعر دوورم، لە قەسیدەدا شتێك دەڵێم ئێستا دەمەوێت روونی بكەمەوە، ئەو منداڵەی كە من بووم ئەوە منم.

(اغاني مهيار) وەك شیعر تەبەنی دەكەم، بەلاَم (قصائد اولي في واوراق في الريح و المسرح و المرايا) ئەزموون بوون. بەشێك لە كتێبی (التحولات) ئەزموون بوو بەشێكی شیعر، (دەمەوێت بڵێم بەشێكی زۆری بەرهەمەكانم چ وەك زمان، چ وەك دارشتن و پەیوەندیم لەگەڵ زمان وەك سەركێشی ئەزموونگەریانە مامەڵە كردووە، زۆر لە شیعرەكانم بە شێوەی ئەزموونی نووسیووە.)

(وقت بين الرماد و الورد)م وەك ئەزموون و شیعر خۆش دەوێت، چونكە ئەو سێ قەسیدەیە تاجی تەواوی ئەزموونەكانی پێشووم لە سەر دەكەن، بۆیە شێوەیەكی تەواویان وەرگرتووە، بۆ شیعری عەرەبی نوێش وەك دامەزراوێك دەكەونەوە، (مفرد بصيغة الجمع) یەكەمین نووسینە كە پەیوەندی بە ژیانی كەسێتیمەوە هەیە.

## چەمكی شیعر

***شیعری نوێ وەك سەركێشییەكی ئەزموونی توانیوویەتی چ بگۆڕێت چ بگوازێتەوە؟**

—لە سەرەتا دەمەوێت بڵێم كە ئەزموونی گۆڤاری شیعر بەدحاڵیبوونێكی تەواوی نایەوە، ئەو دەمەتەقێیەی كە بە دژی نووسینی تەقلیدی و كۆن نامانەوە، مەبەست تیایدا رەتكردنەوەی كەلەپور نەبوو، چونكە هەر تەنها نووسین بە هەمان زمان واتلێدەكات ببیتە بەشێك لەو كەلەپورە، خۆ زمان بەرد نییە، هەروەها شاعیر ناتوانێت خۆی لە زمان ئەو زمانەی كە بە مێژووی داپۆشراوە، رووت بكاتەوە. مەسەلەكە ئەوە نییە كە بەشێوەیەك بنووسی كە دژی كۆن دەكەوێتەوە، ئێمە وامان كرد كە (قەسیدەی پەخشان) شێوەیەك وەرگرێت كە دژ بە كۆن بێت، ئەوەش هەڵە بوو.

گرنگی شیعر لە گۆڕینی چەمكی شیعردا خۆی هەڵدەگرێتەوە، نەك گواستنەوە لە (تەفعیلە)ەوە بۆ (شیعری پەخشان). بە هۆی خراپ تێگەیشتنی ئەو ئەزموونەوە ئەمڕۆ شیعری نوێ وەك ئەوە وایە كە لە بازنەیەكی داخراو بخولێتەوە، دەیەوێت لەو چوارچێوە تەقلیدییە نزیك بێتەوە، كە ئێمە هەوڵماندا لێی رابكەین، بۆیە هەستدەكەم كە نووسینی نوێ جگە لە هەندێكی كەم نەبێت هیچ رۆشنبیرییەك یان ئەزموونێكی لە پشتەوە نییە، هیچ زاتكردنێكی تیا بەدی ناكرێت، بەڵكو لە زمانێكی بێ بەرامبەرو پەیوەندییەكی بێ بەرامبەر هەڵدەقوڵێت.

***كوا ئەزموونی پێشەنگەكان ئەوانەی كە ئەمڕۆ دەنووسن لە كوێیە؟**

—بە بڕوای من ئەوانەی كە ئەمڕۆ دەنووسن پەیوەندییان بە چەمكی گۆڤاری شیعر بۆ شیعر

نییه، ئەوان جۆرێکن لە شیعری پەرش و بڵاو، نووسینی ئەمڕۆ هەتا ئێستا وەك داوە دەزوو وایە، وەك قەسیدەی ستوونی، نە تیشكۆیەك و نە بناغەیەكی سێنترالی هەیە، نە توانیوویەتی پەیوەندییەكی نوێ لە نێوان زمان و شتەكان، زمان و دنیا دابمەزرێنێت، ئەو زمانە وایلێكردووین لە نێوان نووسەرو دەستەواژە هەست بەمەسافەیەك بكەین، بەڵام داواكراو ئەوەیە كە زمان لە دەرەوەی بوونی نووسەرەوە بێت.

***ئایا ئەو كەلەبەرە دەشێ لە ئاكامی بەدتێگەیشتنی ئەزموونەكانی سەرەتاوە بێت؟.**

–پێموایە لە ئاكامی كارلێكەری شیعری وەرگێڕاوەوە بێت، یان شیعری نووسراو بە زمانەكانی بێگانە، بەڵام ئایا دەشێ شاعیرێك ئاگایی لە مێژووی ئیستێتیكای زمانێك نەبێت و ئیستێتیكا لەو زمانە دابهێنێت؟! لێرەدا من بۆچوونێكم هەیە و پێموایە شاعیرانی ئەمڕۆ ئەو زمانە نازانن كە پێی دەنووسن، شاعیرێكیش توانای بە سەر ئامرازەكانیدا نەبێت، ئاگای لە نهێنییەكانی زمان و مەعریفەی زمان و ئیستێتیكای زمان نەبێت، ناتوانێت زۆر شتان بڵێت، هەڵبەتە ئەوە بێجگە لە بەهرە گەورەكان، چونكە من قسە لە باو دەكەم.

***بە گەڕانەوەمان بۆ شیعری تۆ، دەبینین هەر لە كۆمەڵەی یەكەمتەوە بەدوای شێوەیەكی نوێی قەسیدەدا دەگەڕێت، ئەو بەدواداگەڕانەش ڕێچكەگەلێكی جیاوازی وەرگرتووە، هەر لە كەوتنە ژێر كاریگەری ڕەمزییەكانەوە بگرە، وەك لە قەسیدە سەرەتاكانت دەبینرێت، پاشانیش شەپۆلی ئەفسانەیی، ئەو بەدواداگەڕانەی تۆ دەردەكەوێت و كەمتر دەردەكەوێت و پاشان وندەبێت، لە شیعری تۆدا تا ڕادەیەك شێوەكان لە زیاد بووندایە، شاعیری لە تۆدا جارێك ڕووبەڕووی دنیا دەبێتەوە، زۆرجاریش دەبێتە ڕەمزی دنیا، هەندێجاریش ڕووبەڕووی دنیا جۆراوجۆرەكان دەبێتەوە، لە هەموو ئەو ڕێچكانەدا ئایا شاعیر وەك تاك دەكەوێتە كوێوە؟ تا چ ڕادەیەك ئەو شاعیرە بەرهەمی ژیان و ئەزموونی ڕۆشبیریی خۆیەتی؟.**

–ئەو پرسیارە واملێدەكات كە ببمە ڕەخنەگری ئەزموونەكەی خۆم، گرانە كە بتوانم بۆخۆم ڕەخنە لە شیعری خۆم بگرم، زۆر شت هەن كە من تێیان ناگەم. وەڵامەكانم بۆ ئەو پرسیارە ورد ناكەونەوە، بۆیە داوای لێبووردن دەكەم.

## شێوە زمانێكی دیكەیە

***لە بارەی بەرەوپێشچوونی شێوەكاری نوسینەوە كە دەكرێت مەسەلەیەكی هونەركارییانە بێت چی دەڵێت؟.**

–شێوە بە نیسبەت من زمانێكی دیكەیە، وەك هەر یەك لە دەستەواژە، ڕستەی شیعری، وێنە، ئیقاع شتگەلێك ڕوون دەكەنەوە، شێوە زمانێكی دیكەیە دەخرێتە سەر هەر یەك لەو دەستەواژانەوە. داهێنانی شێوەگەلی زێتر زمان جۆراوجۆرترو دەوڵەمەندتر دەكات، یەكێك لەو پێوانانەی كە بە شێنەیی شیعری پێ دەخوێنمەوە وزەی شێوەكارییە، شێوە بە قوڵایی ئەزموونەوە بەندە، ڕۆشنبیریی دەوڵەمەند دەكات، بەرەوپێشبردنی شێوە بەرەوپێشبردنی مەعریفەو ئەزموونە، لەو دەریچەیە من وا هەستدەكەم كە ئەزموونەكەم بەرەو پێگەیین دەڕوات.

## بە زنجیرەوە سەما دەكەین

***ئایا پێتوایە چونكە خاوەنی ئازادی شێوەیت ئیتر لە شاعیرانی كۆن سەركەوتووتربیت؟.**

–هونەر دواجار شێوەیە. چەند هەست بەوەدەكەم كە لە شێوەدا ئیبداعم كردووە ئەوەندە هەست بە سەركەوتن دەكەم.

***بەڵام موتەنەبی شیعری ستوونی تێکنەشکاندووە!**

–بە مانایەك لە ماناکان تێکیشکاندووە. با یەکێك لەو قەسیدانەی وەرگرین کە بە (بەحری درێژ) نووسیوویە و بە قەسیدەیەکی دیکەی (حسان بن سابت) بەراوردی بکەین کە لە هەمان بەحرە، دەبینین: موتەنەبی لە نێو ستوونی (خەلیلی) ستوونێکی دیکەی داهێناوە، وەك دەڵێت:

شیم اللیالي ان تشکك ناقتي

صدري بها افضی ام البیداء

یان:

وجبت هجیر ا یترك الماء صادیا

***بەرای تۆ ئەگەر رۆشنبیریی عەرەبی بە شێوەی ئایینی بمابایە، ئایا دەیتوانی شیعری ستوونی تێکبشکێنێت؟.**

–ئایین لەگەڵ شیعر نەرم بووە، ئەرزشێکی بە شیعردا، بەڵام لە خۆشەویستییەوە نەبووە، چونکە لە ناخەوە ئایین شیعر رەتدەکاتەوە، لە ئاییندا تاکە سەرچاوەی مەعریفە سروشە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعر بەراوەستاوی مایەوە، چونکە شیعر نموونەی ئەو زمانەیە کە قورئانی پێهاتەخوارەوە، پارێزگاریکردنی ئایین لە زمان جۆرێکە لە پاراستنی زمانی قورئان. لە لایەکی دیکە ئایین پارێزگاری لە شیعری ستوونی نەکردووە، هەروەها تێکشکاندنی مەسەلەیەکی ئایینی نییە.

لە ناخیشەوە قەسیدەی تەفعیلی ستوونی تێکنەشکاندووە، بەڵکو پەرەی پێداوە، بۆیە ئەمرۆ پایەیەکی نیشتیمانی هەیەو وەك رازاندنەوەیەکی ئێسك گران دەکەوێتەوە، وەك قولآیی لە ستوون دەربازمان نەبووە، من هیچ کەسێك لەو بارەوە جیا ناکەمەوە، ئایا دەرچوونمان لە ستوون وەك دەرچوونی (ئەبی نەواس)ە لەو بەهایانەی کە پێش ئیسلام لە ئارادابوون. (لەو بارەوە ئەو لە ئێمە تەواوتر بوو، چونکە بەهایەکی نوێی شارنشینی هێنایە ئاراوە، کە ئێمە وەك ئەومان پێنەکراوە) ئێمە هەتا ئێستا هەر لە نێوان چوار دیوارەکەداین، سەماکردنمان هەر تەنها وەهمە! ئێمە بە زنجیرەکانەوە سەما دەکەین تەنها لەخزمەتی رۆشنبیری نوێ و کۆمەڵگەی نوێدا نەبێت، ناتوانین ستوون تێکبشکێنین.

***ئەو قسەیە سەربەخۆی رۆشنبیرییەکان دەسەپێنێت، ئەوەش شتێکی نادروستە.**

–دەمەوێت ئاماژە بەوە بدەم کە سادەترین مافی نووسین ئەوەیە کە بەوپەڕی ئازادی بتوانی تەواوی ئەو گیروگرفتانەی کە تیایە دەژیت بیخەیتە روو، لەو کۆمەڵگەیەدا ئەو مافەت نییە، من دەمەوێت وەك چۆن خوا دەبینم ئاوا بیخەمە روو، هەروەها سێکس وەك چۆن لەگەڵیدا دەژیم.

***تۆ –ئەدۆنیس–ی زاتی ئەو ناکەیت؟!.**

– دووبارە من بە نائاگایی پێوەندکراوم.

***ئایا زاتی ئەوە ناکەیت کە بە راستی چیت دەوێت ئەوە بڵێیت؟.**

–کۆمەڵێك چەمکی وەك سێکس، خوا، سیاسەت، ئایین، هەن–راستەوخۆ نا بەڵام بە نۆرە لە بارەیانەوە دەدوێم– من لەو بڕوایەدام کە لە دنیای عەرەبیدا لە زۆربەیان دلێرترم. بەڵام دلێری بە تەنها بەس نییە، هەر بە تەنها ژیانکردن لەو کۆمەڵگە کۆتکراوە، توانای سەرکێشیانەی ئیبداعی پووچ دەکاتەوە. هەروەها دەسەلآت کەس ناپارێزێت، بەڵکو لێرەدا دەسەلآت لایەنێکە لەنێوان لایەنەکاندا.

*** لە نێو زۆربەی رۆشنبیرییەکاندا شیعری تۆ وەك هێز بوونی خۆی هەیە، رێگرەکان رەتکراونەتەوە هیچ تەگەرەیەك لە پێش داهێنان نەماوە.**

–ئەوەی لای من بە گرنگ دەکەوێتەوە ئەوەیە کە لە نێو کۆمەڵگەکەی خۆم بمێنمەوەو کۆمەڵگەکەم

گوێم بۆ بگرێت، بە مانایەك لە ماناكان ئێمە هەتا ئێستا لەچەرخی ناوەڕاستدا دەژین، راستە كورە بۆ كتێب سووتاندن لە ئارادا نییە.. بەڵام تووندو تیژییەكی دوانەیی بەسەر هەریەك لەخوێنەر و نووسەر وجودی هەیە.

تۆ یەكێك لەو سەركێشیە گەورانەم لە تێگەیشتنی خوا نیشان بدە، یان لە تێگەیشتنی سێكس لە نێو ئەدەبی عەرەبی. لێرەدا زنجیرگەلێكی رۆشنبیری هەن كە ئێمە لە نێویدا دەجولێینەوەو بە هەمان ئەو زنجیرانەش كۆت كراوین. یەكێك لەو شاعیر و رۆماننووس و وێنەكێشە سەركێشانەم نیشان بدە كە لە بونیادنانی هونەری سەركێشی گەورەییان نواندبێت، بۆچی سەركێشییەكان ونن؟ لەبەر ئەوە نییە كە بەهرە نییە، بەڵكو چونكە پێشینەو چواچێوەی رۆشنبیریی باوو كۆت و پێوەندی كۆمەڵگە ئامادەیە. تاك تیژ رەو نییە، بەڵكو ئەوە كۆمەڵگەیە تیژ رەوە.

***یوسف ئەلخال پێشبینی نووسینی بە زمانی رەمەكی دەكرد، پەخشانی عەرەبی زاراوەگەلێكی رەمەكی بەكار دەهێنا، بەڵام شیعر بەكاری نەدەهێنا، ئایا تۆ پێتوانییە ئەوە یەكێك بێت لە تەگەرەكان؟.**

–بە هیچ شێوەیەك من دژی زمانی ئاسایی نیم، بە نیسبەت یوسف ئەلخال زمانی ئاسایی ئەو بە بێ لێكدانەوە زمانی پەتی بوو، زۆر كەس لێرە قسە لەو تیۆرە دەكەن، بەڵام بەلایەكی دیكە، كە من بەو زمانە ئاساییە دەنووسم ئەوە شتێكی دیكەیە، وەك خۆم حەز دەكەم شیعر بەو زمانە ئاساییە بخوێنمەوە، بەڵام بە زمانی پەتی نەبێت، ناتوانم بنووسم– سەرەڕای ئەو هەستە بەهێزەی كە زمان بە بوونەوەرێكی زیندوو دەچوێنێت، زیندەوەرێك كە گەشە دەكات و دەمرێت، زیندەوەرێك كە هیچ یاسایەك نییە رێگە لە مردنی بگرێت. سەرەڕای ئەو دركردنەش من بەلای نووسینی پەتیدام، ئەو نووسینەم خۆش دەوێت كە بەرەو مردن دەچێت.

***كەواتە ئایا دەشێ زمان رزگار بكرێت؟**

–ناكرێت زمان رزگار بكرێت، بەڵام شاعیرێكی دیاریكراو زمانەكەی خۆی رزگار دەكات، شاعیرێك زمانەكەی خۆی رزگار دەكات كە لە شێوەی تەعبیركردندا بە ترۆپك گەیشت بێت، نەتوانێت هەڵە بكات. موتەنەبی زمانی شیعری رزگار كرد، بۆیە ئێمە تەنها بە دژی ئەو نەبێت ناتوانین بنووسین. بەڵام زمان–وەك زمان– دەربازی نابێت. ئەوەش واملێدەكات كە بۆ جیاوازی نێوان زمانی شیعری و زمانی ئایینی بگەڕێمەوە: شیعرییەت دنیا دەكاتەوە، بەڵام ئایین بە سەر راستییەكاندا دادەخرێت و دنیا لە نێوان وشەكان زیندانی دەكات.

## سەرچاوە:

ئەو گفتوگۆیە لە لایەن (ئەلیاس خوری) ئەنجام دراوەو هەر یەك لە (بیلال خبیز) و (حسێن بن همزە) بەشداریان تیا كردووە. لە پاشكۆی ئەلنەهاری رۆژی شەممە 19ی تشرینی یەكەمی 1996 بڵاوكراوەتەوە، من لە سایتی (معابر) وەرمگرتووە.

(وەرگێڕ)

## (2)

***ئەگەر لە كتێبە نوێیەكەتەوە "ژینگەی رەش"دەستمان بە گفتوگۆ كرد، لێرە ئەوەی گومانی تیدا نییە ئەوەیە كە ناونان بەكردەی خۆی هەڵساوە، بەڵام ئایا ئەو ناوە هەر یەخەی دەوروبەری عەرەبی دەگرێ، یان دەچێتە ژینگەیەكی گەورەترو یەخەگیری هەرێمەكانی دیكەی دنیای ئەمرۆش دەبێتەوە؟ ئایا ئەو ناونانە لەو جوگرافیایە**

دەردەچێ‌و دەچێتە هەرێمەکانی دیکەی تایبەت بە مەسەلە ئایینییەکان‌و ناسنامەو کەلەپورو.......هتد؟

-دەلالەتی ئەو ناونانە لە ژینگەی عەرەبیدا دەخولێتەوە، بەڵام هەڵبەتە بەپێی مەودای هەژموونی دەرەوە بۆ ژینگەکانی دیکەش درێژبوونەوە، یان گەیشتن‌و کارلێکەری هەیە. پرنسیبی ئەو ناونانە رەخنەییە: پرسکردن‌و کۆشش کردنە لە تەواوی پانتاییە جیاوازەکانی رۆشنبیریی‌و ئایینی‌و هونەری بە کۆن‌و نوێوە.

*تێبینی ئەو کتێبە خوێنەر دەخاتە بەرامبەر کۆمەڵێك بابەتی نوێ کە رەگ‌و ریشەی کۆنی هەیە، لەوانەش خوێندنەوەی دەقی ئایینی، پەیوەندی لەگەڵ زمان، پەیوەندی لەگەڵ ئەویدیکە، قەیرانی ناسنامە، خود، تیرۆر، پەچە، داگیرکردنی عیراق، تەکنیکاری، گڵۆبالیزم، پەیوەندی خۆرهەلاَت بە خۆرئاوا، زۆری دیکە. ئایا پێتوانییە دەستبردن بۆ ئەو مەسەلانە بەرەو پرسیارگەلێکمان دەگەرێنێتەوە کە پێشتر هەر لە سەدەی بیستەمەوە دەستی بۆ بردراوەو هەتا ئەمرۆش لە دووبارە خستنەرووی نەبووینەتەوە؟.

- ناکرێ لەمەسەلە سەرەکییەکان جیاببینەوە، دەبێ بەردەوام بەرجەستەیان بکەین تاکو بە شێوەیەکی یەکجارەکی چارەسەریان بۆ دەدۆزینەوە، ئەگەرچی چارەسەری یەکجارەیەکی هەر تەنها لە ئایین‌و فیکری ئایدۆلۆژی‌و مەزهەبیدا نەبێ دەست ناکەوێت.

هەموو ئەو شتە کەینونییانەی وەك زمان‌و پیناسەو تەکنیك‌و سروشت‌و خۆشەویستی‌و مردن‌و هونەر........هتد فیکر ناتوانێ لە خستنەرووو دووبارە خستنەروویان واز بهێنێ.

راستە وەك ئاماژەت بۆ کرد زۆر لەو مەسەلانە چەندان جار خراونەتە روو، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە بە شێوەیەکی قووڵ نەخراونەتە روو، بەڵکو وەك بیروباوەڕ قسەی لێکراوە، مەبەستم ئەوەیە کە بە شێوەی ئایینی یان ئایدیۆلۆژی-سیاسی خراونەتە روو، هەرگیز بەشێوە فیکری- فەلسەفی بەرجەستە نەکراون. بۆ نموونە با مەسەلەی ئایین وەرگرین، ئەو مەسەلەیە هەر تەنها لەرووی زانستی- سیاسییەوە لێکۆڵینەوەی لەبارە کراوە، بەرزترین شتێکیش لەو مەسەلەیە کە پێی گەیشت بن خۆی لە گوتەزای جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەتدا هەڵدەگرێتەوە. بەڵام خودی ئایین بەو وەسفەی کە شێوەیەکە لە شێوەکانی مەعریفە، یان بەرزترین شێوە وەك هەندێ دەڵێن، یان بەو شێوەیەی کە سروش‌و پەیامبەرییە هەرگیز قسەی لێنەکراوە. توێژینەوەی فیکری لەبارەی ئایین هەر تەنها لە پراکتیزەکردن‌و پرۆسیسەکردنی ئایینیدا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو دەبێ دەست بۆ ئەسڵەکەی ببردرێت، بۆ ماناو مەبەستەکەی بگەڕێینەوە، هەروەها زەرورەتی چۆنێتی پێویستبوونی ئێمە بە ئایینەوە، یان چۆن دەیخەینەروو، ئایا بەراستی مەعریفەیە، پاشان پەیامبەرێتی مانای چییە...هتد هەموو ئەوانەش مەسەلەی بنەڕەتین‌و هەندێ لە پێشینانمان لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە کردووە، کەچی بیریارانی ئەمڕۆ پشتگوێیان خستوون، یان لە وروژاندنی خۆیان بەدوور دەگرن، هەموو ئەوانەی خەریکی ئەو مەسەلانەن بەبێ جیاوازی هیچ ئاکامێکیان بەدەستەوە نەداوە، تەنها دەکرێ وەك فوقەهای نوێ سەیریان بکەین‌و توانای فیکرییان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە ئایین گەورەیە، بەڵام ئەو تەئویلە باوەی کە بۆ ئایین دەیکەن خراپە، ئەوەتا ئێمە تەئویلی دروست پێشکەش بە ئایین دەکەین، بەقەد ئەوەی بچێتە بواری رەوادان یان فیقهەو هتد دەچێتە خانەی فیکرەوە، ئەوەی لە باری فیکری-مەعریفی لەسەر

ئایین دەگوترێ دەشێ لە بارەی زمان، ناسنامە، پەیوەندی بە ئەویدیکەوە بگوترێت، وەك چۆن دەشێ لە بارەی خودی شیعریشەوە هەمان شت بگوترێت. ئێستای فیکری عەرەبی رەگو ریشەی نییە، کەواتە بۆیە هیچ شتێکی نوێ پێشکەش ناکات، ناچێتە دووتوێی بزاڤی فیکری مرۆیی داهێنەرانەوە.

***لەو کتێبە دەڵێیت: "گرفتی حەقیقی لەخوێندنەوەی ئەو زاراوەیەوە دەست پێدەکات کە بە (فەندەمینتال-ئسول) ناو دەبرێت، خوێندنەوەی رەخنەیی نەك خوێندنەوەی ئەو خوێندنەوانەی کە لە کۆنەوە بۆ (ئسول) دەکرا". ئەو خوێندنەوەیەی کە تۆ داوای دەکەی (چ لە نێو عەرەبو چ لە نێو ئیسلام) بە ترس دەورە دراوە، ئێمە لەو بارەوە نموونەی زۆرمان لەبەر دەستدایە نە بە مستەفا عەبدولرەزاق دەست پێدەکاو نە لای نەسر حامد ئەبوزێد کۆتایی دێت، ئایا چ وامان لێدەکات بەردەوام ئێمە فەندەمینتال بخوێنینەوە، ئایا گرفتەکە لە بەردەوامیدایە یان لە خودی فەندەمینیتال دایە یان لە دەسەڵاتی خوێندنەوەدایە؟.**

-فیکرو هونەر بە دیاریکراوی ترسناکن، چونکە ئەوانە بەهاو بیرکردنەوەو بیروباوەڕو دابونەریتی خوێندنەوە....هتد دەگۆڕن، هەموو فیکرو هونەرێك کە هاوگونجانی دروستکرد گرفتی لێناکەوێتەوە هەروەها (هەستی هاوبەش) یان (عەقڵی هاوبەش) بە دروست ناوی دەباتو پەسەندی دەکات، ئەگەرچی خۆی ئەوە ترۆپکی نادروستییە یان نەخۆشییە. بەهیچ جۆرێك نە فیکرەو نە هونەرە بەڵکو (رەوای-حەلاڵی) ئەویدیە. بۆ زانین عەبدولرەزاقو ئەبوزێد بەوە ناویان دەبردرێت کە شتێکیان خستۆتە روو، بەڵام وەك چوونە ناخی مەسەلەکان بە قەد ئەوانەی پێش خۆیان جەربەزییان نەنواندووە، هیچ شاعیرێکی بیرکەرەوەی سەردەم نابینم کە بە زمانی (ئەبو عەللای مەعری) رەخنەی لە ئایینو بەها ئایینییەکان گرتبێ. فیکری بێ ترس بوونی نییە. لێرەوەیە کە دەڵێن کۆمەڵگای عەرەبی بەبێ فیکر دەژی، کۆمەڵگای عەرەبی لە رێگەی دەسەڵاتە ئایینییە-سیاسییەکەیەوە دەگوازرێتەوە، بێ ئەوەی بە ئازادی بخوێنێتەوە، بێ ئەوەی بە ئازادی بیر بکاتەوەو بنووسێ، بێ ئەوەی بە ئازادی گفتوگۆ بکات، کۆمەڵگای عەرەبی گۆمەڵگایەکە بە سەر رۆشنبیرییدا دەسەپێنێ کە لە زۆنگاودا بژی. بەمجۆرە رۆشنبیریی لە وڵاتی عەرەبیدا بە زیندان دەچێ-وەك دۆزەخێکی سیخناخ بە وشەو دەنگ، یان وەك بیابانێك کە هیچ مێرگی تیا بەدی نەکرێ.

***تۆ وەك پرۆژە سەیری ناسنامە دەکەیت(پێتوایە لە کارو داهێنانو کارلێکردنو گفتوگۆوە بونیاد دەنرێ) بە مانایەك لە ماناکان ناسنامە لای تۆ مۆرکێکی گەردوونی هەیە، ئەوە کورت دەکەیتەوەو دەڵێی (رەنگە ئاواتی خود لە رابردوودا هەر ئەوە بوو بێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەمڕۆ ئاواتی بەرزی خود دەکرێ ئەویدیکە بێ). ئایا ئەو قسەیەت لەگەڵ فیکرو چەمکەکانی سێنترالییەت بە هەموو هەرێمو رەنگەکانو تیزەکانی ململانێو توونددیدا بەریەك ناکەون، کە لە دنیای ئەمڕۆدا کار دەکەنو لەئاراستەکردنی سیاسەتە ئیمپراتۆرەکەدا بەرجەستە دەبێو پرۆژە کۆنو نوێیەکانی پێ جێ بە جێ دەکەن؟.**

-سێنتراللییەت؟ نموونەیەکی سێنترالییەتم بدەیە کە لە سەرووی هەستی (سێنترالییەت)ی عەرەبییەوە بێ: (بەرێزەکان)، (مامۆستاکان)...هتد. ئێمە بەردەوام بە هۆی لاوازیو ئیفلیجی خۆمانەوە وەهم دروست دەکەین، ئینجا بەراستیان دەزانین، مەسەلەکە لە (سێنترالیەت)و (بەیەکداچوونی ژیارییەکان).......هتد نییە، بەڵکو مەسەلەکە مەسەلەی ئادەمیزادە داهێنەرەکانە، ئەوانەی کە دنیا بونیاد دەنێنەوەو دەیگۆڕنو پێشەوایەتی

دەکەن، لەگەڵ ئەوانەی کە هیچ ناکەن، دەچنە ناوەوەی خۆیان‌و ئاخ هەڵدەکێشن، خۆیان بە خۆشگوزەرانییەوە بەستاوەتەوە بێ ئەوەی ئاسۆیان دیار بێ، بێ ئەوەی جگە لە کۆکردنەوەی سامان هیچ ئامانجێکیان هەبێت.لێرە بە مانا رۆشنبیریی‌و مرۆڤایەتیەکە هیچ سامانێك لە دنیادا لەوە نزمترو دەبەنگتر نییە، لەوەی کە لەبەر دەستی عەرەبدایە.

بەر لەوەی قسە لە (بەدرەوشتی ئەویدیکە) بکەین، پێویستە کار بۆ لەریشە هەڵکێشانی بەدرەوشتی خۆمان بکەین، چونکە لەبیرکردنی خۆمان‌و (بەدرەوشتی خۆمان) تەواو لە راژەی ئەویدیکەدایە، (هێرشەکەیان) بۆ سەرمان بەهێز دەکات، گرفتەکە یەکەمین جارو دواین جار لە خۆمانە لە سیاسەتی خۆمان‌و رۆشنبیریی خۆمانەوەیە، لە خودی بە مرۆڤبوونی ئێمەدایە. هەموو دەستەواژەکانی وەك (داگیرکەر) (ئیمپریالییەت)و (بەیەکداچوونی ژیارییەکان)و (سێنترالیەتی ئەوروپایی)....هتد بوونەتە هۆی دابەزین‌و دواکەوتن‌و نەزانین‌و بێگاریی‌و نەخوێندەواریمان، ئەو دەستەواژانە وایان لێهاتووە عەقڵییەتێکمان لا بچەسپێنن‌و دابین بکەن کە عەقڵییەتی دواکەوتنە، هەروەها ئەگەر (رۆشنبیرییەك) لای ئێمە بێ توانایی‌و پاشکۆیەتی برەو پێبدات ئەوە بەو مانایە نییە کە (بێگانە) دوژمنی یەکەممان بێ، بەڵکو بەو مانایەیە کە عەرەب بۆخۆی دوژمنی یەکەمی عەرەبە.

***لە لێکۆڵینەوەو هەوڵە نوێیە رەخنەییەکانی عەرەبی بە شێوەیەکی گشتی لە دەستبردنیان بۆ شیعرو بە تایبەتی بۆ شیعری ئەدۆنیس سێ شێواز هەڵدەگرینەوە، (محەمەد میفتاح) لە کتێبەکەی (چرای چەمکەکان: رەخنەی مەعریفی‌و شەرە شیر) لەوەی کە بە رەخنەی مەعریفی ناوبراوە دەستی داوەتێ، هەروەها (عادل زاهیر) لە کتێبەکەی (شیعرو وجود) لە تەئویلی فەلسەفییەوە بۆی چووە، وەك چۆن (عەبدوڵڵا غوزامی) لە کتێبەکەی (رەخنەی رۆشنبیریی) لە رەخنەی رۆشنبیریی‌و گوتەزای نەسەق‌و نێرایەتییەوە قسەی لێکردووە.**

**ئایا ئەو خوێندنەوە رەخنەییانە توانیوویانە رەنگدانەوەی ئەو لێکۆڵینەوە رەخنەییانەی ئەوچارەگەی دوایی سەدەی بیستەم بن‌و لە چوارچێوەی قوتابخانە کەڵەکە بووەکان دەرباز ببن، یان نەیانتوانیووەو لە نێو هەمان شێوازدا ماونەتەوە؟**

—زۆر بە داخەوە کە من هەتا ئێستا کتێبی مامۆستا (محەمەد میفتاح)م نەخوێندۆتەوە، زۆر رێز بۆ نووسینەکانی دادەنێم، هەڵبەتە ئەو درێخییە لە مندایەو دانی پێدادەنێم، بەڵام لەو کتێبانەیە کە لەو زووانە بەرنامەم بۆ خوێندنەوەیان داناوە.

بەڵام مامۆستا (عەبدوڵڵا غوزامی) کە دووبارە رێزم بۆ بەرهەمەکانی هەیە، لەبۆچوونەکانی‌و هەروەها بە تایبەتی لە تێگەیشتنی بۆ شیعر من بە تەواوی لەگەڵی جیاواز دەکەومەوە. (رەخنەی رۆشنبیریی) ئەو لە جەوهەردا ناونانێکی دیکەیە بۆ رەخنەی مارکیسی بە سادەکراوییەوە، واتە رەخنەیەکی راستەخۆو بە ئایدیۆلۆژیا کراوە، کە نایەوێ شیعر لە رێگەی شیعرەوە تێبگات، بەڵکو دەیەوێ بە هۆی دەوروبەری‌و بە هۆی ئەوەی لە دەرەوەیدایە تێیبگات، ئەوەش بەتایبەتی لە پرۆسیسەکردنی جیدانۆفی‌و ستالینییەکەیدا دەردەکەوێ، ئەوە رەخنەیەکە بە ناوی (دەرەوە) واتە:ئێمە، گەل، جەماوەر، کۆمەڵ... قسە دەکات. رەخنەیەکە بە ناوی (منی دەرەوە) پەیوەستبوون، ئایین، سیاسەت، ناسیونالیزم.....هتد دەدوێ. هەموو ئەوانەش لە چواچێوەدانان زێتر نییە، رەخنەی شیعریش رەخنەی چوارچێوە نییە، بەڵکو گەیشتنە بە جولەی هونەری‌و مەعریفی ناوەوەی شیعرو رەهەندەکانی، مامۆستا غوزامی لە گوڵدا

بۆنەکەی نابینیّ، بەڵکو هەر تەنها بەبینینی گوڵدانو پەینەکەی بەسەی لێدەکات. ئەو یەکەمجار بە کوشتنی شیعرو شیعرییەت دەستپێدەکات، دەقی شیعری بەرەو (بەڵگەنامە)ی کۆمەلایەتی دەگوازێتەوە. بەمجۆرە خودێتیو تاکێتی تێکەڵ بە یەکتر دەکات، لە نێوان نێرایەتیو ناوکۆییە هۆزایەتی–بەدەوییەکە هیچ پەیوەندییەك نادۆزێتەوە، هەموو سۆزو خودێتی ناوەوە، واتە هەموو ئەوانەی کە شیعری لە سەر وەستاوە پشتگوێ دەخات. رەخنەیەکە هەر تەنها بە منی دەرەوە، بە منی کۆمەڵگا، بە منی ئینتیما ئایدیۆلۆژیو ناسیونالیو کۆمەلایەتییەکەوە پەیوەستە، بەلام منی شیعری منی ناوەوەیە، کەواتە ئەو لەلایەکی دیکە وەستاوەو بیر دەکاتەوە کە لەگەڵ شیعر ناکۆك دێتەوە. ئەگەر تازەگەری شیعری لای عەرەب لە ماناوە بێ، ئەوە مانا لە شۆڕشی خودییەوە خۆی پەنا داوە، ئەوە تاکێتیو نێرایەتی نییە بە سەر (ئێمە)، (نەتەوە)، (کۆمەڵ)، (حیزب)، (هۆز)، (دەسەلات)، (بنەماڵە)، چونکە هەموو ئەوانە کەسێتیو خودێتی رەتدەکەنەوە، پاشان هونەرو شیعریش رەتدەکەنەوە. ئەو شیعری هەر تەنها لە دووتوێی (هەستی هاوبەش)دا دەوێ، هەروەها ئەو شیعرەی کە بە شیعری (عەقڵ) ناونراوە یەکێکە لە دەردە بێ دەرمانەکانمان، یان بە کورتی ئەو هەر تەنها ئەو شیعرەی دەوێ کە بەرگری لە کۆمەڵگاو بەرژەوەندی کۆمەڵگا دەکات واتە ئەو شیعرەی کە بە شیعری (عاقڵ) ناودەبرێ، ئەو شیعرەی کە هیچ گرفتێ ناوروژێنێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە (کۆمەڵ) و گردبوونەوەی کۆمەڵی لێدەکەوێتەوە، بە تایبەتی گردبوونەوەی (نیشتیمانی).

شیعری بێ نرخ بۆ جەماوەری بێ نرخو مەسەلەی بێ نرخە، لە هەموو ئەوانەدا واپێناچێ (غوزامی) وەك رەخنەگری شیعری بکەوێتەوە، هەتا وەك رەخنەگرێکی رۆشنبیریش ناکەوێتەوە، بە قەد ئەوەی وەك (فەقێیەك)و (رابەری مزگەوتێ) دەردەکەوێ، زۆر شتی دیکە ماوە کە لە لای (غوزامی) لەبارەی رەخنەی شیعریی هەروەها رەخنەی رۆشنبیرییەوە دەگوترێت، کورتییەکەی ئەوەی بە شیعرەوە بەندە، ئەوەیە کە ئەو بە ئامرازو رێبازی ناشیعری قسە لەسەر شیعر دەکات، ئەو لە دەرەوەی شیعرەوە قسە لەسەر شیعر دەکات، نەك لە ناوەوەی شیعر، ئەوەش بەڵگەیە بۆ گەندەڵی رەخنەکەی. بەلام قسەکردن لە سەر رەخنەی رۆشنبیریی بۆ ئەوانیدیکە کە لەو بارەوە لە من پسپۆرترن هەڵدەگرم.

بەلام کتێبی (شیعرو وجود)ی (عادل زاهر)ی مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی (نیویۆرك) لە قسە لە سەر کردنی دوودڵم چونکە بە دەوری ئەزموونی شیعری مندا دەخولێتەوە، بۆیە داوای لێبووردن دەکەم کە دەڵێم ئەوە لە رەخنەی شیعری لای عەرەب نموونەیەکی دەگمەنە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو رەخنەیەی بە بزاوتی رەخنەی شیعری لە دنیای تازە بەستاوەتەوە، بە تایبەتی وەك چۆن لای هایدگەر بەرجەستەیە، بە هەمان شێوەش بە مێژووی خۆی پەیوەستی دەکات وەك چۆن لە فەلسەفەی عەرەبیش (ئیبن سینا، فارابی، ئیبن روشد) نوێنەرایەتی دەکەن، هەروەها وەك چۆن لە ئەزموونی شیعری (ئەلمعری) نوێنەرایەتی کردووە، ئەو شیعری لە فیکر جیا نەکردۆتەوە، پێیوایە شیعر جوانترینو تەواوترین تەعبیرکردنە لە مرۆڤ.

## سەرچاوە:

ئەو چاوپێکەوتنە لە لایەن (عومەر کوش)ی نووسەر سوری 2005/5/16 سازکراوە.

حوار العرب عدد 11 /تشرين الاول/2005

*www. arabthought.org*

# لەچاوی دڵەوە بۆ نائاگایی!

## خوێندنەوەیەك لە كتێبی ( سۆفیگەری و سوریالیزم )دا

شاهۆ سەعید

**تا مەودای ڕوانین بەرفراوانتر بێ، ڕووبەری گوزارشتكردن بەرتەسكتر دەبێتەوە**

**-نیفەری-**

**دەگەڕێمەوە بۆ خۆرهەڵات، مەنزڵگای یەكەمین حیكمەتی ئەبەدیی**

**-رامبۆ-**




چ پەیوەندییەك لەنێوان سۆفیگەرییو سوریالیزمدا هەیە؟!. یەكەمیان ئەزموونێكی ئاینی و سروتێكی رۆحی دێرینە.. بەڵام دووەمیان رێچكەیەكی هونەری و ئەدەبی هاوچەرخە، كە لە سەدەی بیستەم بەدواوە لە خۆرئاوا سەریهەڵدا. چ پەیوەندییەك لەنێوان پرسیاری سۆفیو پرسیاری سوریالیستدا هەیە؟. پرسیاری یەكەمیان پرسیارێكە لەپێناو وێكهاتنەوە لەگەڵ تەواوی بوونەوەراندا تائاستی یەكبوونی ئەنتۆلۆجی. بەڵام پرسیاری دووەمیان پرسیارێكە بەمەبەستی هەڵاتن لە هەموو ئینتماو پابەندییەكی هوشیارانەی پێشوەخت؟!

سۆفیگەری بزاوتێکی ئاینییە کە موژدەی رزگاربوون و پاکبوونەوە دەداتە مرۆڤ، هەرچی سوریالیزمە بزاوتێکی ئیلحادییە کە هەڵگری هیچ موژدەیەکی ئاسمانیو زەمینی نییە!. بەڵام وێڕای ئەم دژبوونە، پەیوەندیو ئەزموونگۆڕینەوە لەنێوانیاندا هەیە، بەتایبەتی لەو خاڵەدا کە هەردوو ڕەوتەکە بایەخ بە جیهان دەدەن وەك بوونێکی جووت ئەدگار. یەکەمیان پێیوایە جیهان ڕوویەکی دیار (ظاهر)و ڕوویەکی نادیار (باطن)ی هەیە، کە دەبێ کەسی عارف هەوڵی دۆزینەوەو فراوانکردنی رووە نادیارەکەی بدا. بەڵام کەسی دووەم، سوریالیست، بوون بەسەر دوو هەرێمدا دابەشدەکا، کە یەکێکیان هەرێمی ئاگاییو ئەوی تریان هەرێمی نائاگاییە، ئەڵبەتە دەبێ ئەویش هەروەك عارف کار لە هەرێمە نادیارەکەدا کاربکا، کە هەرێمی نائاگاییە.

لێکچوونێکی دیکەی نێوان هەردوو ئەزموونەکە لەوێدا دەردەکەوێ کە دوا پلەی قووڵبوونەوە لە ئەندێشەی سۆفیگەریدا بە درکاندنی شەتەح کۆتایی دێ. دواپلەی ئەفراندنی سوریالیش بریتییە لە تەسلیمبوون بە نوسینی رەمەکی یان وێنەکێشانی نائیرادیی. شەتەح واتە ئەو گوزارشتەی کە بەزمانی ئاسایی ناچیزە، بەڵام لەزمانی عیرفاندا دوا پلەی ڕاستگۆییە لەگەڵ یەزدان و بوونەوەراندا. هەرچی داهێنانی رەمەکیو نائیرادییە واتە ئەو نوسینە یان ئەو وێنە خۆڕسکەی کە خۆبەخۆ، لەناوچە شاراوەکانی نائاگاییەوە، بێ هیچ چاودێریو سانسۆرێکی پێشوەختی ئاگایی و ئەقڵ لەدایك دەبێ.

هەندێ پرسیارو کێشە هەن کە مرۆڤ ناتوانێ لەڕێی ئەقڵو وەڵامی لۆجیکییەوە چارەسەریان بکا. هەستێکی خۆڕسك هانی سۆفی دەدا هەروەکچۆن هانی سوریالیست دەدا بۆ تاقیکردنەوەی ئەزموونگەلێك لەدەرەوەی ئەزموونە باوەکان، بەرەو شوێنێك کە یەکەم ناویدەنێ غەیب و دووەم لەوێنەی حەزێکی پەنهانی چەپێنراودا، بەدەر لە دەسەڵاتی ئەقڵو ئەزموونی زانستی، دەیبینێ.

(گی-رینێ دۆمیرۆ) بەراوردێك لەنێوان سوریالیزم و ئیزۆتیریزم (الباطنیة) ئەنجامدەداو پەنابردن بۆ توانا نائەقڵانییەکانی مرۆڤ بە سەرچاوەی هەردوو چالاکیەکە دەبینێ. هەردوو چالاکیەکە دژی دۆزینەوەی قاڵب و چوارچێوەی پێشوەختن. سوریالیزم دژی ئەو داهێنانە ئەدەبییە، یان هونەرییەیە، کە لەبەرچاوگرتنی نمونە پێشوەختەکان دێتەبەرهەم، هەروەکچۆن ئیزۆتیریزم دژی خواپەرستییەکە کە بەگوێرەی سرووتە باوەکان و لەژێر چاودێریو لەبەخەر خاتری مرۆڤەکان بەڕێوەدەچێ.

سوریالیزم، هەروەك (ئەندرێ بریتۆن) دەڵێ، پەیوەندییەکی پتەوی بە سروشتەوە هەیە. ئەڵبەتە مرۆڤ رۆژ بەڕۆژ لە سروشت دووردەکەوێتەوەو لە زێدی راستەقینەی خۆی دەترازێ. مرۆڤ ئەو کلیلانەی ونکردووە، کە کاتی خۆی دەرگا نهێنیەکانی سروشتی پێدەکردەوە. لەو رۆژەیشەوە، بۆ ئەو مەبەستە، کلیلی تر تاقیدەکاتەوە، بەڵام هەموو تاقیکردنەوەکانی بێ بەرهەم و بێهوودەن.

بەمجۆرە، (دۆمیرۆ) ئەوە دەسەلمێنێ کە رەهەندێکی نێوخواهی ئیزۆتیری لەسوریالیزمدا هەیە، هەروەکچۆن رەهەندێکی سیحریو ئەستێرەگەریی لەهەمان رەوتدا هەیە، کە لە مانیفێستی دووەمی سوریالیستەکاندا ئاماژەی پێدراوە. پەنابردن بۆ ئیزۆتیریزم و سیحر هەڵقولاوی قەیرانێکی قووڵ بوو کە مرۆڤی هاوچەرخ گیرۆدەی بوو، پاش چەندین سەدە لە

خەفەکردنی ئارەزووەکان و دەستەمۆکردنی فیکرو لەقاڵبدانی ئەزموونەکانی.

سوریالیزم جۆرێکە لە سۆفیگەری، بەڵام بێ یەزدان.. هەروەکچۆن سۆفیگەری جۆرێکە لە سوریالیزم بەڵام لەگەڵ چاوەڕوانی رزگاربوونی تاهەتاییدا. لە هەردوو ئەزموونەکەدا مرۆڤ هەستدەکا کانگای بیرکردنەوەو ئەفراندن تەنها ئەقڵ نیە، بەڵکو هەندێجار جەستەو هەندێجار (حەدس)ە. چونکە پلەی باڵای بیرکردنەوە، یەکگرتنی دوو بیرۆکە نیە، بەڵکو راستتر یەکگرتنی دوو جەستە یان یەکگرتنی جەستەو جیهانە. مرۆڤ ، لەڕێگەی دەزگای ئەقڵەوە، رۆژ بەڕۆژ زیاتر لەجیهان دووردەکەوێتەوە بەجۆرێك لەبری ئەوەی ئەو دەزگایە بەجیهانی بناسێنی تووشی نامۆبوونێکی گەورەی کردووە لەئاست دەوروبەردا.

مرۆڤ تینوی یەکبوونە نەك دابڕان، تامەزرۆی بەشدارییە نەك بالادەستی. گەر یەزدانیش زاتێك نەبێ لەپێناو وێکهاتنەوەو یەکبووندا، واتە گەر مەبەستی یەزدان خۆجیاکردنەوە بێ لەبوونەوەرەکانی لەپێناو بالادەستی و ملکەچکردنیاندا.. ئەوا جیهان هیچ نیە جگە لە گەردو تۆزێك کە شایەنی ژیان و بوون نیە. بەمانایەکی تر، گەر "بوون" تەنها بەهەشت و دۆزەخ بێ، ئەوا گەمەو گرەوێکە لەئاستی ئەندێشەی قوولی مرۆڤ و خواپەرستیدا نیە.

گەردوون بوونێکی ناکۆتایە. هەستەکانی مرۆڤیش بێکۆتان. مرۆڤ هەستدەکا توانا و ئارەزوەکانی لەوەگەورەترن کە تەنها لەجەستەی خۆیدا جێگایان ببێتەوە. خۆشەویستی ئەو چرکەساتەیە کە تواناکانی مرۆڤ دیوارەکانی جەستە دەبەزێنن. ژن و پیاو لەکاتی خۆشەویستیدا بۆ یەکەمین جار هەستدەکەن بڕێك لەبوونیان لەدەرەوەی خۆیانە، کاتێك بەو بڕەی بوونی خۆیان شاددەبنەوە، هەستدەکەن لەوە گەورەترن کە هەن.. ئەوان تەنها خاوەن جەستەیەکی واقعی نین، بەڵکو خاوەن بوونێکی رەهایشن، تەنها سەر بەجیهانێکی سروشتی نین، بەڵکو لەجیهانی میتافیزیکیشدا پشکێکیان هەیە.

بەڵام بۆچی مرۆڤ هێندە تامەزرۆی پەیبردنە بە نهێنییە شاراوەکانی جیهان. بۆچی مرۆڤ حەزدەکا لە دەرگاکانی ناکۆتاو مەحاڵ بدا لەکاتێکدا سوور دەزانێ کە وەك هەموو عاشقەکانی پێش خۆی هیچی چنگ ناکەوێ؟! رەنگە مرۆڤ خوازیاری ئەوە بێ لەڕێگای گەڕان بەدوای نهێنی بوون و ناکۆتادا، نهێنی خۆی وەك بوونەوەرێکی خاوەن خەون، ئاسۆکانی ئارەزووی ناکۆتای خۆی، کەشف بکا. واتە مرۆڤ لە یەك کاتدا دوو سەفەر، یەکێکیان بەرەو هەرێمە نادیارەکانی دەرەوەو یەکێکیان رووەو هەرێمە پەنهانەکانی ناوەوە دەست پێدەکا. هەردوو سەفەرەکەش بە وێڵبوون لەناکۆتاو ئەبەدیەتدا کۆتاییان دێ.

سوریالیزم، هەروەك سۆفیگەری، یەکێتی لەنێوان نوسین و ژیاندا دەسازێنێ. تەنها هێندە بەس نیە شیعر بنوسین، بەڵکو دەبێ شیعر بژیین. شیعر ئەزموونێکی ژیانییە، نەك ئامرازێك بۆ ژیان. بەهای شیعر، وەك (بۆدلێر)و (مالارمێ) پێیانوابوو، بەندە بەخۆیەوە، بەڵام لەسەردەمی ئەواندا بەند بوو بەو سوودە مادییەی کە لەڕێگەیەوە بەدەست دەهات. داهێنەر دەبێ وریا بێو تەسلیمی خواستەکانی جەماوەرو کۆمەڵگە نەبێ، تەنها لەگەڵ خۆی راستگۆ بێ. دەبێ جڵەو بۆ خەیاڵی خۆی شل بکا نەك بۆ شتێکی تر. هەربۆیە سوریالیستەکان سەرسام بوون بە رۆمانسیەکان و رەمزیەکان و ئەو

نوسـەرە یاخییانـەی کـە دەقـی سـەیرو نامـەئلوفیان دەنوسی.

کەلـــەپوری سوریالیســـتەکان مەعریفــــەی ئیزۆتیرییـــە، کـــە مەعریفەیـــەکی ترانســـندنتالْو حەدســـییە، مەعریفەیەکـــە بـــۆ دامەزرانــــدنی میتـافیزیکێکی گـەردوونی، کـە تاکەکـەس خـاوەن ئـەزموونی سـەرەکییە، نـەك ئـاین یـان ئیلـهامێك کـە خاوەنەکەی کەسێکی تـر بێ غـەیری کەسـی خـاوەن ئەزموون. ئەوان دژی ئەو جیاکارییە بوون کە ئاینی مەسیحی خستبوویە نێوان جەستە و رۆح، دژی ئەو تێگەیشـتنەی "گونـاه" بـوون کـە دەیانبەسـتەوە بـە ئیرۆتیکای جەستەییەوە.

سەرچاوە خۆرئاواییەکانی سوریالیزم، جگە لە رۆمانسـیەت و هێماگـەری، بریتـی بـوو لـەتێزەکانی فرۆیــد کــە "نائاگـــایی" کــردە کۆگـــاو کانگـــای حەقیقــەتی مــرۆڤ و هـــەر داهێنـــانێکی شـیعریو هونـەریی. شـێتی، دالْغـە، ورێنـە، وەهـم و خـەیالْ.. ئـەو چـالاکیانەن کـە تواناکـانی نائاگـایی بـەهێزتر دەکەن. بەلاّم لـەپالْ ئـەو سەرچاوە خۆرئاواییانـەدا، سـوریالیەکان بایـەخی تایبـەتیان بـە خۆرهـەلاّت و سیحری خۆرهـەلاّت دەدا، کـە ئەلْبەتـە سۆفیگەری و رامـانی میتـافیزیکی بەشـێکی گـرنگ لـە کەلـەپوری خۆرهەلاّتیەکان پێکدێنێ.

گەڕانـەوەی راستەقینە بۆ خۆرهـەلاّت بریتیـە لـە گەڕانـەوە بۆ کەلـەپوری کۆنی فەیلەسـوفانی بـەر لـە سـوکرات. ئـەوان جیاوازییـان نەدەخسـتە نێـوان فیکـرو مـادە، بابــەت و خــود، جیهــان و مــرۆڤ. ســوریالیەکان ســـەر بـــەم رەوتـــە فەلســـەفییە نائەقلاّنییـەن، کـە فیسـاگۆریەکان و پێڕەوانـی ئاینـە نهێنیەکان بڕوایان پێبوو، لەپێناو دۆزینەوەی کانگا راستەقینەو رەسەنەکانی داهێنان و ئەندێشـەی بـەر لەدایکبوونی وتەزاکانی لۆجیك و فەلسەفەی ئەقلّی.

پەیوەنــدیی نێــوان ســۆفیگەریو ســوریالیزم، پەیوەندیی نێوان دوو کایە نیـە کـە یـەکێکیان لـەژێر کاریگەریی ئەوی تریان بێ، پەیوەندیی نێوان دوو رەوتی کۆن و نوێ نیە کە دووەمیان درێژبوونەوەی یەکـــەمیان بـــێ. بـــەلْکو پەیوەنـــدیی نێـــوان دوو ئەزموونی مرۆییە کە لە خالْی نیگەرانییەکی قوولْدا دەگـەن بەیـەك، لەچـەقێکی نائـەقلاّنی داهێنەرانـەدا سوود لەیەکتر وەردەگرن و ئەزموون دەگۆڕنەوە.

## مەعریفە:

پەیوەنـدیی نێـوان مـن و بـوون، خـودو بابـەت.. پەیوەندییـەکی مەعریفییـە. واتـە تـا رووبـەری نێـوان مـــرۆڤ و جیهـــان بەرتەســـکتر ببێتـــەوە، رووبـــەری مەعریفـە بـەرفراوانتر دەبـێ. بـەم مانایـە، دوا پلـەی کەمالْی مەعریفە بریتیە لە یەکبوونی تـەواوی نێـوان خودی عارف و ئەو شتەی کە پێویستە بناسرێ.

بوون لەدیدی سۆفیدا بابەتێکی دەرەکی نیە، کە لـەڕێگای ئـەقلْ یـان لۆجیکـەوە لێـی نزیـك ببینـەوە. هەرچـــەندە ئـــەقلْ سەرچـــاوەی مەعریفەیـــە، بـــەلاّم خامۆشکەری مەعریفەیشە. ئەقلْ وەك خۆر وایە کە سەرچـــاوەی ڕووناکییـــە، بـــەلاّم گـــەر راســـتەوخۆ تەماشـای بکـەین نـەك رووناکیمـان پێنابەخشـێ، بەلْکو لـە تاریکیـدا دەمانخنکێنێو کوێرمـان دەکـا. بۆیــە ئـیبن عــەرەبی دەلْــێ: "رووناکی جۆرێکـە لـە پەردە"(ل39).

ئـەو مەعریفەیـەی بـوون دابـەش دەکـاو بەپارچـە پارچــــەیی لــــەجیهان رادەمێنــــێ مەعریفەیــــەکی سـاختەیە. مەعریفـەی سـۆفی لەناسـینی بـوونی رەهاوە دەستپێدەکا کە یەزدانەو کۆکەرەوەی هەموو بوونــەوەرو ئاســتە جیاوازەکــانی جیهانــە. بــەلاّم یـەزدانی سـۆفی یـەزدانێك نیـە لـەدەرەوەی جیهـان، بـەلْکو لـەدۆخی ئـاوێزانبوونی تەواودایـە لەگـەلْ

بوونەوەراندا. مەعریفە بەناکۆتایەك دەستپێدەکا کە یەزدانەو بە ناکۆتایەکیش کۆتایی دێ کە گەردوون‌و بوونەوەرانە. مەعریفەی راستەقینە وێڵبوونە لە وێڵگاکانی بووندا بەئەندازەیەك شوناسی کەسی بناس (عارف) لەگەڵ شوناسی کەس یان شتی ناسراو (مەعروف)دا دەتوێتەوە. ئەو دۆخە دۆخی فەنایە، کە هەروەکو (بەستامی) دەڵێ شوناسی کەسی عارف لەشوناسی ئەوی دیدا دەفەوتێ‌و دەتوێتەوە. بەڵام دۆخی فەنابوون، وەك هەندێك پێیانوایە، دۆخی دڵنیایی‌و ئارامی نیە، بەڵکو دۆخی پشێوی دەروونی‌و سەرسامییەکی بێکۆتایە. بناسی یەزدان ئەو کەسە نیە کە دەگاتە دڵنیایی‌و ئارامیی رۆحی، بەڵکو کەسێکە دەچێتە دۆخی سەرسامی‌و راچەنینەوە لەئاست کەشفی ناکۆتادا، یان هەروەك (سەهلی کوڕی عەبدوڵڵا) دەڵێ: "عارفترین کەس بەیەزدان سەرسامترینیانە لەئاستیدا"(ل40). یان وەك (زونونی بەسری) دەڵێ: گەر پرسییان عارف کێیە؟ بڵێین: "لێرە بوو، بەڵام ڕۆی"(ل40).

مرۆڤ، وەك خودێکی دابڕاو لەجیهان و دەوروبەر، کۆسپێکی گەورەیە لەبەردەم مەعریفەدا. مرۆڤ دەبێ خودی خۆی تێبپەڕێنێ لەپێناو ناسینی جیهان و ناسینی خودی خۆیشیدا. کاتێ مرۆڤ لەخودی خۆی دەترازێ، دەچێتە دۆخی فەنابوونەوە، واتە دۆخی هەڵگرتنی هەموو کۆسپ و لەمپەرەکان، دۆخی وێکهاتنەوەی خودی عارف و جیهان کە بابەتی مەعریفە. تۆ بۆ ئەوەی بناسی دەبێ دوورکەویەوە لەخۆت، یان هەروەك یەکێك لە سۆفییە گەورەکان وتی: "تا نامۆ بی بەخۆت، لە ناسیندا بەتواناتری"(ل41).

گەیشتنە دۆخی فەنابوون پێویستی بە سێ قۆناغی سەرەکی هەیە: ئاشکرابوون، دەرکەوتن و بینین. لەدۆخی یەکەمدا بوونی رەها، کە بوونێکە بەهۆی جیهانی شتەکانەوە پەردەپۆشکراوە، ئاشکرا دەبێ. مرۆڤ لەم قۆناغەدا جوانی‌و شکۆی یەزدان، کە جوانی‌و شکۆیەکی رەهایە ئاشکرادەکا. لەدۆخی دووەمدا نووری یەزدانی دەردەکەوێ. لەگەڵ تەجەللای ئەو نورەدا تاڵە تیشکیەکان دەردەکەون، کە هەر تاڵێك و دەچێتەوە سەر شتێك و سەر بوونەوەرێك. بۆ نمونە نووری رۆحەکان دەردەکەون، کە بەپەردەی جەستەکان داپۆشراون. لەقۆناغی سێیەمدا تەجەللای نوور دەبینرێ‌و لەدڵی عارفدا دەبریسکێتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی هەست بەبوونی خۆی ناکاو بەتەواوی بووندا پەرش و بڵاودەبێتەوەو هەموو پەیوەندییەکی هوشیارانە بە جیهانەوە لەدەستدەدا. ئەم دۆخە لای هەندێ عارف کاتییە، لای هەندێکی تریان هەمیشەییە، واتە ونبوون و جیابوونەوەی رۆحی لەدنیاو تووشبوون بەدۆخێك، کە لەدێوانەیی دەچێ.

لەکتێبی "یەکبوونی ئەنتۆلۆجی‌و خولقانی بەردەوام لەسۆفیگەری ئیسلامیدا"، (تۆشیکۆ ئیزۆتسۆ) جیاکاری لەنێوان مەعریفەی زانستی‌و مەعریفەی سۆفیگەریدا دەکا بەوەی یەکەمیان بەدوای شوناسدا دەگەڕێ، واتە مەعریفەیەکی لۆجیکییە لەهەوڵی دۆزینەوەو دیاریکردنی پێناسەی تایبەتدایە بۆ هەموو شتەکانی بوون. لێرەوە بەگوێرەی مەعریفەی زانستی، (بوون)ی ئەبسراکت و پەتی بوونی نیە، بەڵکو ناسینی هەر شتێك پێویستی بەجیاکردنەوەی هەیە لە شتەکانی تر. (ئیزۆتسۆ) فەلسەفەی ئەم مەعریفە زانستییە–ئەقڵییە ناودەنێ فەلسەفەی شوناسگەری.

بەڵام مەعریفەی سۆفیگەری مەعریفەیەکە لەسەر بنەمای ناسینی راستەوخۆی بوون دامەزراوە، کە پێکهاتەکانی بوون لە یەکەیەکی یەکتەواوکەردا

دەبینێ‌و لەیەکیان جیاناکاتەوە. یەك بوون هەیە، بەڵام ئەو بوونە سیفەتی جیاوازی هەیە، بۆ نمونە گوڵ سیفەتێکە لە سیفەتەکانی بوون و هیچ بوونێکی سەربەخۆی لەدەرەوەی بوونی هەمەکی نیە، هەروەك چۆن شەپۆل سیفەتێکە لە سیفەتەکانی دەریاو خاوەنی هیچ بوونێکی سەربەخۆ نیە لەدەرەوەی دەریا. هەموو ئەو شتانەی ئێمە تایبەتمەندییان دەدەینێ‌و شوناسی جیاوازیان پێدەبەخشین، هیچ نین جگە لەچەند وشەیەکی مەجازی کە خۆمان دامانتاشیون و دروستمانکردوون. (ئیزۆتسۆ) فەلسەفەی ئەمجۆرە مەعریفەیەش ناودەنێ فەلسەفەی بوونگەری (وجودی).

فەلسەفەی سوریالیزم سەبارەت بە مەعریفە لە فەلسەفەی سۆفیگەرییەوە نزیکە. گرنگترین قۆناغ لەداهێنانی سوریالیستیدا بریتیە لە تەسلیمبوونی تەواو بە خەون و وڕێنەو ئەنگێزەکانی نائاگایی‌و رزگاربوونی تەواو لە چاودێری‌و دەسەڵاتی ئەقڵ‌و ئاگایی. لە مانیفێستی یەکەمی سوریالیزمدا، کە ساڵی 1924 دەرچوو، (بریتۆن) باس لەپاشخانی فەلسەفی‌و سایکۆلۆجی‌و چەمك و پرنسیپە سەرەکیەکانی سوریالیزم دەکاو رۆڵێکی مەرکەزی دەبەخشێ بە خەیاڵ‌و وەهم و داڵغە. پێی‌وایە کاتێ مرۆڤ جڵەو بۆ خەون و خەیاڵ شلدەکا دەگاتە دوا پلەی ئازادی، بەتایبەتی ئازادیی داهێنانی فیکری. چونکە تەنها لەکاتی خەونـدا سنووری لۆجیکی‌و ئەقڵییەکان هەڵدەگیرێن و مرۆڤ بە سروشتی قووڵ‌و چەپێنراوی خۆی شاددەبێتەوە. مرۆڤ ئەو کاتەی بێدارو بەئاگایە لەهەموو کاتێکی تر بێئاگاترە لەحەقیقەتی بوون، چونکە بێداری پەردەیەکە بەسەر پەیوەندیی یەکتەواوکەری نێوان شتە ئەزەلیەکانەوە.

ئامانجی سەرەکی سوریالیزم، هەروەك دوائامانجی سۆفیگەری بریتییە لە یەکبوونی شتە دژەکان، یان یەکبوونی وجود. واتە یەکبوونی نێوان خودو بابەت، جیهانی دەرەکی‌و مەعریفەی ناوەکی. لێرەدا سوریالیزم دەگەڕێتەوە بۆ قسەکەی هیراکلیتس، کە پێیوابوو هەموو شتێك بەرهەمی هاودژەکەی خۆیەتی: "دەریا بەرهەمی یەکەمین خۆگۆڕینی ئاگر بوو"(ل49).

بریتۆن ئەو خاڵی بەیەکگەیشتنەی ناونا "پنتی باڵا"، ئەو پنتەی کە تیایدا هاودژی دەتوێتەوەو نامێنێ: "پنتێکی رۆحی کە تیایدا دژبوون لەنێوان ژیان و مەرگ، واقع و خەیاڵ، رابردوو و ئایندە.. نامێنێ"(ل49). ئەم دیدە نە دیدێکی ئایدیالییە نە حوکمێکی ماتریالییە، چونکە ئایدیالیزم نکوڵی لە بوونی نزم دەکا بەبیانووی بوونی زاتێکی باڵا، هەرچی ماتریالیزمە نکوڵی‌دەکا لە بوون، وەك ئاستێکی باڵای ئەندێشە، بەبیانووی حەقیقەتی مادیی شتە نزمەکان.

کەواتە پرسیاری سوریالیزم و سۆفیگەری چیەو دوا وەڵام لەئاست ئەو پرسیارەدا چیە؟! گرنگترین تایبەتمەندیی ئەو پرسیارە لەوەدایە کە وەڵامی ناوێ، چونکە ئەو دەربارەی رەهایی‌و ناکۆتایی پرسیاردەکا ئیدی چۆن بەوەڵامێکی سنوردار رازیدەبێ. واتە پنتی باڵا لەهەردوو ئەزموونەکەدا بریتی نیە لەگەیشتن بە ئەنجامێکی دیاریکراو بەڵکو بریتییە لە فەزایەکی بەردەوام بۆ سەفەری بەردەوام.

بریتۆن سەرسامە بەو نووسەرو ئەندێشەمەندانەی کە ئەقڵانی‌و لۆجیکی نین، وەك: هیراکلیتس، ئابیلار، ئەکهارد، ریتس، رۆسۆ، سویفت، لۆتریامۆن.. هەروەك چۆن سەرسامە بەرامبەر ئەفسانەو ئەندێشە خورافییەکانی خۆرهەڵات، وەك سیحرو بەختگرتنەوەو ئەبراج و

ئەستێرەگرتنەوە.. کە هەموویان زادەی خەیاڵ و وەهم و داڵغەی عارفە نائەقڵانیەکان بوون، بەڵام کاریگەریی ڕۆحییان لە زانستە ئەقڵانیەکان زۆرترەو بەردەوامیشە.

کەلەپوری سۆفیگەری لە خۆرهەڵات و خۆرئاواش جەخت لە مەترسیی باڵادەستی ئەقڵ دەکاتەوە وەك کۆسپێك لەبەدەم ئیشراقدا. مەرجی یەکەمی ئیشراق، یان تەجەللای نوور لەناخدا، بریتیە لەپاشەکشێ بەرەو داڵانە نهێنییەکانی ناخ. کاتێ مرۆڤ دەگاتە گەنجینە پەنهانەکانی ناخ لەوێوە سەفەرێکی پێچەوانە دەستپێدەکا بەرەو گەنجینە شاراوەکانی جیهان، لەوێدا خودو بابەت دەچنە دۆخی ئاوێزان و حلولەوە. واتە تا مرۆڤ زیاتر توانای ڕۆشنکردنەوەی ناخی خۆی هەبێ زیاتر لە نهێنیەکانی وجودو گەردوون تێدەگا.

جۆرج باتای بەمجۆرە گوزارشت لەو دۆخە دەکا:

"تەسلیم بە بێدەنگی دەبم تا نامێنم

ژاوەژاوی ململانێکان لەبۆتەی مەرگدا دەتوێنەوە

هەروەکچۆن ڕووبارەکان لەدەریادا دەتوێنەوە

یان وەکچۆن درەوشانەوەی ئەستێرەکان لەئاسماندا وندەبن (...)

دەچمە نێو بێدەنگییەوە وەك ئەوەی بچمە نادیارێکی تەمومژاوییەوە

دەکەومە نێو نادیارێکی تەمومژاوی

پاشان خۆم دەبمە تەمومژی ئەو نادیارییە"(ل54).

بەڵام ئەقڵ ئەم دۆخە ناسەلمێنێو وەك جۆرێك لە وڕێنە لەقەڵەمی دەدا. بۆیە یەکێك لە پێشەنگەکانی سوریالیزم کە (ئەندرێ ماسۆن)ە دەڵێ: "ئەقڵ بەددترین دوژمنی ڕۆحە، ئەقڵ بۆئێمە، کە گەنجانێکی سوریالی بووین ساڵی 1924، لە وێنەی (سۆزانییەك)ی گەورەدا بوو. پێمان وابوو دیکارتیەکان و ڤۆڵتێریەکان و کەسانێکی تر کە فەرمانبەری ئەقڵ بوون، هیچیان نەکردووە جگە لەپاراستنی بەها جێگیرو مردوەکان"(ل55).

(ئارسۆر رامبۆ) کە ژێدەرێکی گرنگی سوریالیەکان بوو لەژێر کاریگەریی سۆفیگەریدا بوو. لەدیدی ئەودا شتە بینراوەکان دەچنەوە سەر شتە نەبینراوەکان و هەست بەشتە بینراوەکان ناکەین گەر هەستمان لەئاست شتە نەبینراوەکاندا نەجووڵێ، یان وەك (نۆفالیس) دەیوت: "هەموو ئەو شتانەی بیریان لێدەکەینەوە پەیوەستن بەو هەموو ئەو شتانەوە کە بیریان لێناکەینەوە"(ل59). لە چامەی (کیمیای وشە)دا رامبۆ دەڵێ: "دەخوازم هەموو نهێنیەکان ئاشکرا بکەم: نهێنییە ئاینیو سروشتیەکان، مەرگ، لەدایکبوون، ئاینده، رابردوو، دروستبوونی گەردوون، عەدەم... من ئوستادم لەئامادەکاریی مەحاڵدا. جا گوێگرن"(ل61).

خەونبینین لەهەردوو ئەزموونی سۆفیگەریو سوریالیزمدا شتێك نیە لەدەرەوەی واقع یان نامۆ بێ بەجیهانی دەرەوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، خەون و واقع، لەهەردوو ئەزموونەکەدا، دوو ڕووی یەك هەقیقەتن.

## خەیاڵ:

لەنێوان بوون و نەبوون، دیارو نادیاردا.. نێوەندێك هەیە کە ئیبن عەرەبی ناویدەنێ بەرزەخ. بەرزەخ نە سەر بەدنیای بوونە نە سەر بەدنیای نەبوون، بەڵکو سەر بەدنیای وەرچەرخان و تەجەللای وێنەکانە.

هەقیقەتی جیهان لای ئیبن عەرەبی سێ پلەی هەیە: پلەی باڵا، کە شوێنی بیرۆکە پەتیەکانە. پلەی نزم، کە شوێنی شتی ماتریاڵو هەستی پەتییە. پلەی بەرزەخیی، کە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئەو دوو پلەیەی پێشووە، کە ئەمیش شوێنی ئەفراندنی خەیاڵییە.

خەیاڵ چیە؟

گەر بە رەهایی بڕوانینە خەیاڵ، واتە گەر باس لە خەیاڵی رەها بکەین، ئەوا بریتیە لەونبوون لە وێڵگاکانی عەدەمدا، یان وەك ئیبن عەرەبی دەڵێ: بریتیە لە نابینایی. چونکە هەروەك چۆن تا لەجیهانی واقع نزیکتر ببینەوە لە بیرۆکە پەتیەکانی جیهانی باڵا دوورتر دەکەوینەوە، بەپێچەوانەشەوە تا زیاتر لە جیهانی خەیاڵ نزیك بکەوینەوە زیاتر لەجیهانی بیرۆکە پەتیەکاندا دەتوێینەوە. دەگێڕنەوە لە پیغەمبەری خوایان پرسیوە: یەزدان لەکوێ بوو بەر لەوەی بوونەوەران بخولقێنێ؟ لەوەڵامدا وتوویەتی: "لە نابیناییدا بوو، لەشوێنێك کە سەرەوەی بۆشاییو ژێرەوەی بۆشایی بوو"(ل76).

خەیاڵیش رەهەندێکی بوونە، بەڵام لەهەموو بوونەوەران باڵاترە و لە هەموو سپێسەکان فراوانترە، چونکە پنتی بەیەکگەیشتنی ئەو دوو شتەیە کە هەمیشە ناکۆك و هاودژن: وجودو عەدەم. بۆ نموونە: بڕوانە وێنەی خۆت لە ئاوێنەدا، هەستدەکەی لەیەك کاتدا وێنەکەی بەرامبەرت ناسراوو نەناسراویشە. وێنەی تۆ لە ئاوێنەدا بەرزەخێکە لەنێوان جەستەو رۆحتدا، لەنێوان بوونت وەك بیرۆکەیەك و بوونت وەك جەستەیەکی هەستپێکراو.

ئیبن عەرەبی باس لە بایەخی خەیاڵ دەکاو دەڵێ: یەزدان، کە هەرگیز لە هیچ وێنەیەکدا بەرجەستە نابێ، هەندێ جار لەخەیاڵی مرۆڤدا تەجەللا دەکا. کەواتە تەنها خەیاڵ پێوەری مەعریفەیە، ئەو کەسەی خەیاڵ لە مەعریفە دادەماڵێ، مەعریفەیەکی نوقسان و بێتاموبۆ دێنێتە بەرهەم. خەیاڵ نزیکترین شتە لە هەقیقەتەوە، چونکە هیچ شتێك خاوەنی هەقیقەت نیە کاتێ دژەکەی پەیدادەبێ. بۆ نموونە بوون هەقیقەت نیە، چونکە توانای لەخۆگرتنی عەدەمی نیە، هەروەك چۆن عەدەم هەقیقەت نیە چونکە دژی بوونە. لەم نێوەندەدا خەیاڵ ئەو هەقیقەتەیە کە توانای بەیەکگەیاندنی رەگەزە هاودژەکانی هەیە. هەقی رەهایش، کە زاتی یەزدانییە، توانای بەیەکگەیاندنی بوون و نەبوون، ئەوەڵو ئاخر، ئەزەل و ئەبەد، دیارو نادیاری هەیە.

خەیاڵ هەمیشە هەقەو توانای رۆشنکردنەوەی ئەو شوێنانەی هەیە کە ئەقڵ دایاندەپۆشێ. بەڵام بەرواڵەت ئێمە وادەبینین کە ئەقڵ رەسەنترە، چونکە ئەقڵ توانای سنوردارکردن و راگرتن و خەزنکردنی هەیە. بەڵام خەیاڵ راگوزەرە، دێت و ونەبێو دەسگیرنابێ. خەیاڵ دیل ناکرێ، چونکە کە دیلکرا ئیدی واقعە.

مرۆڤ دوو دۆخی هەیە: دۆخی بێداریو دۆخی لەهۆشچوون. لەدۆخی یەکەمیاندا بینین دەخاتەگەڕ، بەڵام لەدۆخی دووەمدا شتە واقعیەکان نابینێ بەڵکو خەون و خەیاڵ دەبینێ. مرۆڤ لەکاتی لەهۆشچووندا دەچێتە ناوچەی بەرزەخ، پنتی بەیەکگەیشتنی بوون و نەبوون، دیارو نادیار، رۆح و جەستە. بەمجۆرە خەیاڵ نیشانمان دەدا کە بوون لەدۆخی بزاوتی بەردەوام و گۆڕانی بەردەوامدایە.

لای سوریالیەکانیش لۆجیك زیندانی خەیاڵە. چونکە لۆجیك ئەو زانستەیە کە شوناسی نەگۆڕو سنوردار دەبەخشێ بە شتەکان، لۆجیك هەمیشە

جیاکاری دەخاتە نێوان دیارو نادیار، ژیان و مەرگ، بوون و عەدەمەوە. خەیاڵ بکوژی فیکر نیە بەڵکو زادەی راستەقینەی جۆرێکە لە فیکر کە ئاڕاستەناکرێو لەقاڵب نادرێ.

لەدێر زەمانەوە خەون سەرچاوەیەکی سەرەکیی ئیلهامی ئەندێشەمەندان و پێغەمبەرو عارفان بووە، یان هەروەك (ئەراگۆن) دەڵێ: لەخەونـدا هەموو شتێك دێتەدی، یەزدان وتویێژ لەگەڵ قوربانیەکانی خۆی دەکا. بەڵام هەموو کەس ئەو شانسەی نیە کە لەخەودا مەحاڵ ببینێ، هەربۆیە سوریالیزم دەرفەتێکە بۆ ئەو کەسانەی کە شەوانە خەونە گەورەکان نابینن، تا لە رۆژداو لەکاتی بێداریدا ئەو ئەزموونە تاقیبکەنەوە، ئەزموونی کۆکردنەوەی مەحاڵەکان.

خەون راکردن نیە لە واقع بەڵکو دارشتنەوەو نوسینەوەی واقعە بەجۆرێکی تر. خەون یارمەتی سروشتناس و زانا ئەقڵانیەکانیش دەدا تا ئاسۆی بینین و کەشفەکانیان فراوانتر بێ. بریتۆن لەمبارەیەوە دەڵێ: "مەعریفەی زانستی سروشتناسی هەڵگری هیچ بەهایەك نیە، تا بەشێوەیەکی شیعریی، یان بەشێوەیەکی ئەفسانەیی کە ئەوێرم بیڵێم، پەیوەندیی راستەوخۆ لەگەڵ سروشتدا دانەمەزرێنێ"(ل91).

شاعیری سوریالی لەرێگەی خەون و خەیاڵو داڵغەی قووڵەوە دەگاتە هەرێمە نادیارەکان. لەوێندەر ئەو شتانە دەبینێ کە نابینرێن، ئەو دەنگانە دەبیستێ کە نابیسترێن. خەیاڵ دووبارەکردنەوەی هیچ شتێك نیە بەڵکو دامەزراندن و ئەفراندنی نوێیە، پێکەوەگرێدانی ئەو رەگەزە هاودژانەیە کە هەرگیز بەیەك ناگەن. خەیاڵ هەوڵێك نیە بۆ قەناعەتپێهێنانی بەرامبەر، بەڵکو هەوڵێکە بۆ بەخشینی چێژو سەرسامی پێی، هەوڵێکە بۆ دەوڵەمەندکردنی هەستیاریو قووڵکردنەوەی هوشیاری.

لە کەلەپوری ئیستاتیکی ئیسلامیشدا، هاوزەمان لەگەڵ بایەخدان بە ریتم و فۆرمی دەرەکیی شیعر، بایەخ بەخەیاڵیش دراوە وەك رەگەزی بنەڕەتیی شیعر. بۆ نمونە ئیبن سینا جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە هیچ دەقێك نابێتە شیعر گەر رەگەزی خەیاڵی تێدا نەبێ، تەنانەت گەر کێش و سەرواداریش بێ.

خەیاڵ، لەدیدی سۆفیگەریدا، ئامرازێك نیە بۆ بەرزکردنەوەی مرۆڤ بۆ پلە باڵاکان یان بۆ دابەزاندنی یەزدان بۆ پلە نزمەکان، بەڵکو پنتی ژوانە کە تیایدا لایەنەکانی پەیوەندی یەکسانن. بێ ئەوەی هیچ کام منەت بکاو هیچ کام شەرمەندە بێ. خەیاڵ ئەڵقەی پەیوەندییە لەنێوان رۆح و جەستەدا، ئەڵبەتە رۆح سەر بەجیهانی غەیب و جەستەش سەر بەجیهانی مادیی هەستپێکراوە.

## ئەوین:

ئەوین، لەدیدی سۆفیگەریدا، وەك خۆی پێناسە ناکرێو سنوردار ناکرێ، بەڵکو لەرێگەی ئەو هەست و هەڵچوونەی دەیخاتەوە دەکرێ قسەی لێبکرێو باس لەدەرەنجامەکانی بکرێ. ئەوین دۆخێکە لە وەرچەرخان و بزۆکیی رۆحیی بەردەوام، شتێك نیە رابگیردرێ تا پێناسەو وەسفبکرێ. ئەوین لەرێگەی ئەویندارەوە وەسف ناکرێ، چونکە ئێمە کەسێکمان لەبەر خاتری خۆی خۆشناوێ، بەڵکو لەبەر ئەو سیفەتانە خۆشمان دەوێ کە بۆی دەخوازین.

ئەوین شەریك قبوڵ ناکا، چونکە هیچ دڵێك جێگەی دوو مەعشوقی تێدا نابێتەوە. ئەوین هەوڵێکە بۆ یەکتاکردنەوەی بوونەوەران لە تاقە بوونەوەرێکدا. بۆیە لە راستیدا مرۆڤ ئەویندارى

خۆیەتی. مەعشوق ئاوێنەی عاشقە کە وێنەی خۆی تێدا دەبینێتەوە.

حوکمی ئەوین لەلای دڵەوە دەردەچێ نەك لەلای ئەقڵەوە. ئەقڵ هەمیشە خوازیاری ڕاگرتنی شتەکانە تا بەڕوونی بیانبینێ‌و حوکمیان لەسەر بدا، بەڵام عەشق ڕاناگیردرێ، کە ڕاگیردرا ئیتر عەشق نیە. دڵ تەنها شوێنێکە توانای لەخۆگرتنی عەشقی هەیە، توانای لەخۆگرتنی ئەو وێنە تەمومژاویانەی مەعشوقی هەیە کە لەهیچ دۆخ و وێنەیەکدا ناسرەون.

ئەوین یان لە بینینەوە دەستپێدەکا، یان لە بیستنەوە. پاشان هەستدەکەین ئەو کەسەی کە دەیبینین یان دەنگی دەبیستین، لەوێنەی ئەو کەسەیە کە لە خەیاڵماندا ئامادەیە، هەندێ جار لەسەروو ئەوو هەندێ جار لەخوار ئەوەوەیە. مرۆڤی ئەوەیندار هەمیشە سەرگەرمی بەراوردە لەنێوان وێنە خەیاڵیەکەی مەعشوق و وێنە واقعیەکەیدا. سەرەنجام، وەك ئیبن عەرەبی دەڵێ، هەستدەکا ئەو سەرگەرمی ئەوینداریییە لەگەڵ ئەویندا، نەك لەگەڵ کەسی بەرامبەردا. واتە ئەوەی گرنگە خودی ئەوینەکەیە، نەك ئەو کەسەی ئەوینەکەی لەگەڵ دەگۆڕدرێتەوە. ناتوانی لە عاشق بپرسی بۆ مەعشوقت خۆشدەوێ، چونکە گەڕان بەدوای هۆدا (تەعلیل) ئەرکێکە لە ئەرکەکانی ئەقڵ نەك ئەرکی دڵ. ئەو عەشقەی ئەقڵ بڕیاری لەسەردەدا عەشقێکی دۆڕاوە، چونکە ئەقڵ و عەشق پێکەوە لەیەك شوێندا کۆنابنەوە، تەنانەت هەندێجار حوکمی عەشق و حوکمی ئەقڵ دژی یەکدین. بگرە هەندێ جار دێوانەیی‌و عەشق، یان لاڵبوون و عەشق زیاتر پێکەوە دەگونجێن تا ئەقڵو عەشق.

مرۆڤ کاتێ عاشق دەبێ شێتیش دەبێ، بەڵام ناتوانێ گوزارشت لەو شێتییە بکا چونکە لاڵە، بۆیە بالاترین پلەکانی عەشق ئەو چرکەساتە بەرجەستەدەبێ کە مرۆڤی عاشق زاڵدەبێ بەسەر لاڵیداو بۆی دەڕخسێ گوزارشت لەدێوانەیی‌و شێتی خۆی بکا، ئەڵبەتە ئەوەش چرکەساتێکی شیعرییە.

ئەویندارى، لەدیدی ئیبن عەرەبیدا، بەچوار شێوە بەرجەستەدەبێ: یەکەمیان، دۆخی کەوتن، ئەو دۆخەی کە عاشق هەستدەکا کەوتۆتە حاڵەتێکی چاڵئاساوە کە لەهەموو شوێنێکەوە گەمارۆیداوە. مرۆڤ لەسەرەوە، لە پێگەی ئیرادەی فەردییەوە، دەکەوێتە خوارەوە کە ئیتر چیتر خاوەنی ئیرادەی تایبەتی خۆی نیە، بەڵکو هەستدەکا بەشێکە لە ئیرادەیەکی باڵا، کە ئیرادەی عەشقە. لەزمانی عەرەبیدا وشەی (هوی) بۆ ئەم دۆخە دانراوە، کە ئەویش بەمانای کەوتن دێ.

دووەم: ئەوین یان خۆشەویستی، لەم دۆخەدا مرۆڤ هەستدەکا ڕاستگۆیە لەگەڵ دڵی خۆیداو بەئیرادەی خۆی، دوور لەهەر خەوش و لێڵییەك مەعشوقی خۆشدەوێ.

سێیەم: عەشق، ئەو دۆخەی کە ئەوین، وەك ئاگر، هەموو بوونی عاشق گەمارۆدەداو بەتەواوی دەچێتە ژێر دەسەڵاتی مەعشوقەوە. عەشق لەزمانی عەرەبیدا لە وشەی (عشقە)وە وەرگیراوە، کە بەمانای ڕووەکی لاولاو دێ، ئەو ڕووەکەی لەڕووەکی نزیك خۆی دەئاڵێ‌و بەزەحمەت، یان بە قرتاندن، لێی دەترازێ.

چوارەم: هاویاری، یان ئولفەت و (ود)، ئەو دۆخەی کەتیایدا خۆشەویستی دەگیرسێتەوە. بەجۆرێك کەسی ئەویندار یان عاشق هەست بەهیچ دوودڵی‌و دردۆنگییەك ناکا لەئاست مەعشوقداو هەستدەکا هاویاری خۆشی‌و ناخۆشیەکانیەتی.

پەڕینەوە لەدۆخی ئاساییەوە بۆ دۆخی ئەویندارى، مرۆڤ تووشی پەشۆکان و نائارامییەکی

ئەوتۆ دەكا كە وەك قۆناغێكی ئینتقالی وایە بۆ ئامادەكاریی بۆ ژیانێكی نوێو جیاواز. لەنیشانەكانی ئەو دۆخی پەڕینەوەیە: خەم، مەستی، ناسكبوونەوە، گریان، پەژموردەیی، لاوازبوون، تێكشكان، دالْغە، نیگەرانی، بێخەویو گێژبوون و.. هتد.

لەم دنیایەدا ئافرەت گەورەترین هێمای ئەویندارییە لای پیاو. ئافرەت سیمبولی مێینەی خولقێنەر و مناڵدانی گەردوونییە.. عیللەتی بوون و شوێنی بوونە. ئافرەت سیمبولی خاكێكە كە مرۆڤ تیایدا لەدایكدەبێو هەر لەوێشدا وندەبێ. كەواتە مەرگ لەباوەشی خاكی مێینەدا دوا ئارامگەی مرۆڤ و دوائامانجی كەسی عاشقە. عەشق یەكێكە لەئامرازەكانی مەرگ، یان هەر وەك مەولانا جەلالەدینی رۆمی دەڵێ: "ئەوین ئەشكەنجەیە، ئەوین بكوژە"(ل107). مرۆڤ لەرێگەی ئەو مەرگە ئارەزوومەندانەیەوە لە خۆپەرستی رزگاری دەبێو دەبێتە كەسێكی هاوبەش لەگەڵ مەعشوق و بوونەوەراندا. حەللاج یەكێك بوو لەو سۆفیگەرانەی زۆر بڕوای بە مەرگ هەبوو، وەك دوا وێستگەی عەشق و پاكبوونەوە: "بمكوژن.... ژیانم لە مەرگمدایە"(108).

لای سوریالیەكانیش، ئەوین وشێتی دوو سەرچاوەی گرنگی داهێنانن. تەنها لەكاتی ئەوینداری قووڵو شێتیدا مرۆڤ لەگەڵ هەقیقەتی خۆیدا ئاشتدەبێتەوە. مرۆڤی ئاقڵ بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتی ساختەیە، تەنها رواڵەتێكەو هیچی تر. بەڵام مرۆڤی عاشق یان مرۆڤی دێوانە كەسێكە خۆی لە كۆت و بەندی ئەقڵو خوونەریتە باوەكان رزگاركردووەو لەگەڵ مەعدەنی راستەقینەی خۆیدا ئاشتبۆتەوە. سێ بیریار كاریگەرییان لەسەر ئەم دیدەی سوریالیەكان هەبووە: (ساد) كە بانگەشەی بۆ ئازادكردنی تەواوی حەزو ئارەزووەكانی مرۆڤ كرد، (فرۆید) كە تیۆرەیەكی رەخنەیی سەبارەت بە چەپاندن و خەفەكردنی كەسایەتی راستەقینەی مرۆڤ پێشكەشكرد كە خۆی لە حەزو ئارەزووە پەنهانەكاندا دەبینێتەوە. پاشان (ماركس) كە تیۆریزەی بۆ ئازادیی كۆمەڵایەتی كرد وەك سەرەتایەك بۆ ئازادی تاكەكەس و رەهابوونی خەونە خەفەكراوەكانی مرۆڤ.

لای سوریالیەكان زەبری چەپاندن و كۆت و بەندە كۆمەڵایەتیو ئاینیەكان چەندە بەهێز بێ لەبەردەم هەڵچوون و ئیرادەی ئەویندا بەرگەناگرێ. تەنها مرۆڤی ئەویندار هەست بە گوناه ناكاو بەوپەڕی متمانەوە كۆسپە كۆمەڵایەتیو ئەقڵیەكان تێدەپەڕێنێو دەیانبەزێنێ. ئافرەتی فریودەر، ئەو بوونەوەرەی كە پیاو بەهەموو لووتبەرزی خۆیەوە لەئاستیدا تەسلیمدەبێ، مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ جیهانێكی رەسەن، كە لەپەیوەندیی راستەوخۆدایە لەگەڵ سروشت و چێژە رەسەنەكاندا.

ئیرۆتیكای سوریالی لەسەر بنەمای ئازادیی ئارەزووەكان و یاخیبوون لە یاسای دامركاندنەوەی جەستە دامەزراوە، ئەو یاسایەی كە ئاینی مەسیحی بایەخێكی زۆری پێداوە. سوریالیزم بڕوای بەو دیوارە كۆنكرێتییە نیە كە لەنێوان رەگەزی نێرو رەگەزی مێینەدا هەڵچنراوە. نێربوونی رەهای پیاوو مێبوونی رەهای ئافرەت هەردوو رەگەزەكەی لەیەكتر دادەبڕیوە. پیاو بەهەشتی خۆی هەیەو ئافرەت بەهەشتی خۆی. تەنها ئەوین زامنی دامەزراندنی تاقە بەهەشتێكە بۆ هەردوو رەگەزەكە، ئەوكات رەگەزێكی لێكدراو لەدایكدەبێ كە هەڵگری خەسڵەتەكانی نێرو مێیشە، ئەو بوونەوەرە لێكدراوە ئەفسانەییەی كە لەكەلەپووری كۆندا باسی لێكراوە.

ئافرەت لای سوریالیەکان بوونەوەرێکی پەرستگاییە، نهێنییەکە لە نهێنیەکانی بوون و سەرچاوەیەکە کە هەمیشە گەرمی دەبەخشێ بە ژیان. بەبێ ئافرەت نهێنیەکانی بوون کۆتاییان پێدێ. بەبێ رەگەزی مێینە، پیاو رەگەزێکی پەرت و بێ ئامانجە، بەڵام ئافرەت ئەنگێزەی دارشتنی ئەو ئامانجانەیە کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، کە گرنگترینیشیان گەیشتنە بە پیرۆزیو نەمری.

مرۆڤی تاك لە هەردوو دیدی سوریالی و سۆفیگەریدا هیچ نیە گەر بەشێك نەبێ لە بوونی رەها. مرۆڤ بۆ ئەوەی کەینونەی خۆی پێرەوبکا، دەبێ هەمیشە بەدوای بوونێکی دەستەجەمعیدا بگەڕێ کە لەیەك کاتدا ئامادەو نائامادەیشە. یەزدان لە دیدی سۆفیگەریدا ئەو زاتەیە کە تا زیاتر بیپەرستی و خۆشت بوێ، زیاتر دووردەکەوێتەوە، کەسی عاشقیش زۆرتر لەعەشقیدا وندەبێو دەتوێتەوە. بەهەمان شێوە ئافرەت لەدیدی سوریالیزمدا ئەو مەعشوقە سەرابئاسایەیە کە لەچنگ گیر نابێ.

ئافرەت یەکەمین هێزی ئازادکردنی ئیرادەی مرۆڤ بوو. ئەو بوونەوەرەی پیاوی فریودا تا نەبێتە دیلی چێژە رۆحییە پەتیەکانی، یان هەروەك بریتۆن دەڵێ ئافرەت بەردی بناغەی جیهانی مادییە، هەر بەهۆی ئەویشەوە خاکمان خۆشدەوێ، خاکیش ئێمەی خۆشدەوێ. ئەم دیدە سوریالییە هەرچەندە پێچەوانەی دیدی سۆفیەکانە سەبارەت بە ئافرەت وەك سیمبولی ئەوینی رۆحیو پاکیزەیی، بەڵام ئەو قسەیەی ئیبن عەرەبی بەیاددێنێتەوە کە وتی: "هەر شوێنێك بەمێینە نەکرێ چاوەڕێی هیچی لێناکرێ"(ل113).

## نوسین:

نوسین دەرفەتێك بووە لەبەردەم عارفاندا، بۆ راگەیاندنی بیرو ئەندێشەو بەیانکردنی ئەزموونی تایبەت بەخۆیان لەئایینداریدا. لەجیهانی ئیسلامیدا هەمیشە ئەندێشەی سۆفیگەری لەپەراوێزی کۆمەڵگاو لەدەرەوەی ئایدیۆلۆجیای رەسمیو زۆرجاریش دژ بە ئاینی رەسمی تەماشای کراوە.

دەق و زمانی شیعری دوا نیشتمان بوون کە کەسی سۆفی پەنای بۆ بردوون. دوا پلەکانی ئازادی تەنها لە بازنەی دەقدا پراکتیزەکراوە. بەڵام زۆرجار نوسینی عیرفانی سەرئێشەی بۆ پارێزەرانی ئایدیۆلۆجیای دەسەڵاتدارو مەترسییان بۆ عارفەکان دروستکردووە، بەتایبەتی کاتێ نوسین گەیشتۆتە ئاستی درکاندنی شەتەح.

شەتەح چییە؟

کتێبی (لسان العرب) کە گەورەترین قامووسی زمانەوانی عەرەبە وشەی شەتەح لەخۆناگرێ. ئەمەش لەلایەکەوە مانای وایە وشەکە بەگوێرەی زمانی رەسمی کولتوری باو ناچیزە بووەو لەلایەکی تریشەوە مانای ئەوەیە کە لەبنەڕەتدا وشەیەکی خوازراوەو عەرەبی نیە. ئەبو نەسری سەراج پێیوایە شەتەح لەکاتی قووڵبوونەوەو کەفوکوڵو پژانی وەجدی عیرفانیدا دەدرکێندرێ. پاشان دەڵێ هەرچەندە شەتەح لە رواڵەتدا ناچیزە، بەڵام لەکرۆکدا راست و بێخەوشە.

وەجدو قووڵبوونەوە لە ئەوینی یەزدانیدا، هاوکاتە لەگەڵ مەستیو توانەوە لەو ئەوینەدا. بەڵام مەستی هەروەك عەبدوڕەحمان بەدەوی باسیدەکا مەستییەکی رۆحییە نەك جەستەیی، لەو کاتەدا دەنگێکی ئیلاهی لەناخەوە مرۆڤ بانگدەکاو داوای یەکێتی لەگەڵ دەکا. پاشان کەسی عارف لەدۆخی

نائاگاییەکی تەواودا هەموو ئەو وێنە زەینیو دەنگە ناوەکیانـــەی کـــە بەزەینیـــدا ختـــورە دەکـــەن تەرجەمەدەکا بۆ وشەو عیبارەت.

مەسـتیی عیرفـانی یەکێکـە لـە سەرچـاوەکانی درکاندنی شەتەح. مەستی بریتیە لەهۆشچوون، ئەو دۆخـەی کـە مـرۆڤ هـەموو پەیوەندییـەك بـە ئـەقڵ و لۆجیـك و ئاگاییـەوە لەدەسـتدەداو لـە چـاودێریی زمـــان و ئایـــدیۆلۆجیای کۆمەڵایـــەتیو رەسمـــی دەربـازی دەبێ. لـەکاتی مەسـتیی عیرفانیـدا کەسـی عـارف تـەنها جڵـەوی رۆح لەدەستدەدا نـەك جڵـەوی جەســـتە. هەســـتدەکا مەعشـــوق، کـــە یەزدانـــە لەشـوێنێکی پەنهانـەوە بـانگی دەکـا، ئـەو شـوێنەش نـاخی خۆیـەتی. وەك ئـەوەی عاشـق و مەعشـوق لەدۆخی ئاوێزان و تەماهی تەواودا بن.

لەئـەدەبیاتی سـوریالیدا، بەرامبـەر شـەتەحی عیرفـانی زاراوەی نوسـینی نـائیرادیی یـان نوسـیی (رەمـەکی)مان بەرچـاودەکەوێ. نوسـینی نـائیرادیی جۆرێکـە لەنوسین لـەدەرەوەی کـۆنترۆڵو سانسـۆری ئـەقڵو ئاگـاییو پێـوەرە کۆمەڵایەتیـەکان. بـەبڕوای سـوریالیەکان، چـڵەپۆپەی شۆڕشـی وان، لەزمانـدا بەرجەســـتەدەبێ، لەڕێگـــەی تایپێـــك لەنوســـینی ئـــازادەوە یـــان وەك خۆیـــان دەڵـــێن لەڕێگـــەی ئیستاتیکاو زانستێکی جوانناسیی نوێوە کـە ژیـان و ئازادی دەبەخشنەوە بەزمان.

گێڕانـــەوەی خـــەون و داڵغـــە وەك خـــۆی، تەسـلیمبوونی نـائیرادیی بەدەسـەڵاتی نائاگـایی، نوسینی رەمەکیو بێڕتووش.. ئەو سێ رێگایەن کە شـــاعیری ســـوریالی دەیانگرێتەبـــەر لـــەپێناو هێنانەقسەی ئەو ئاستە قووڵانەی بوون و ژیـان کـە بـەزمانی ئاسـایی ناکەونـە قسـە. لـە مانیفێسـتی یەکـەمی سـوریالیزمدا جـەخت لەسـەر ئـەم خاڵـە کراوە، چونکە وەك بریتـۆن روونیکردۆتـەوە هـەموو دەقیقـەو چـرکەیەك دەڕوا بێئـەوەی مـرۆڤ پێڕابگـا ئاخـاوتنی نائاگـایی بنوسێتەوە، ئاخـاوتنی ئاگـایی لەیـــەك دژ بـــەخودی بـــەئاگاو دژی گوتـــاری دەسـتەجەمعی بەئاگاشـە: "پێویسـتە لەیـەك کاتـدا خۆمـــان لەسانســـۆری کۆمەڵایـــەتیو سانســـۆری ئەخلاقی رزگار بکەین"(ل126).

زمـــان لای ســـوریالیەکان ئامرازێـــك نیـــە بـــۆ پەیوەندیبەســـتن لەگـــەڵ دەرەوەدا، بـەڵکو راســـتتر ئامرازێکـــە بـــۆ دامەزرانـــدنی پەیوەنـــدیی لەگـــەڵ (خـود)دا. مـرۆڤ لەپێگـەی خـودەوە نـاخی خـۆی رۆشـندەکاتەوە. زمـان ئامرازێکـە بـۆ پتـەوکردنی پەیوەنـــدی لـــەنێوان (مـــن)و (ئـــەو)دا بـــەمانا فرۆیدیەکەی، واتە لەنێوان ئاگاییو نائاگایی. مرۆڤ، وەك فرۆید پێیوایە، تووشی نامۆبوون بووە لەگەڵ خـودی خۆیـدا، چونکە لـەناو تـۆڕێکی کۆمەڵایـەتی ئاڵۆزو دەزگایەکی بەرهـەمهێنان و پاراستنی یاساو نـەریتی ئەوتۆدایـە کـە خـودی خـۆی لـەبیرکردووە، لەلایەکەوە لەژێر سانسۆری کۆمەڵگادایە لەلایەکـەوە لـــەژێر سانســـۆری خـــودی خۆیدایـــە. بـــەلای سوریالیەکانەوە مـرۆڤ لەڕێگـەی نوسـینی نـائیرادیو رەمەکییەوە، وردە.. وردە، لە جەبریەتی ئـەو یاساو سانســـۆرانە دەردەچـــێو لەگـــەڵ خـــودی خۆیـــدا ئاشتدەبێتەوە.

ســـوریالیەکان پێیـــان وایـــە مرۆڤـــی هاوچـــەرخ بوونـەوەرێکی ئـازاد نیـە، چونکە تـەنها نیـوەی ئـەو مرۆڤە، کە ئەقڵو ئاگاییە ئازادە.. هەرچی نیوەکـەی تریـــەتی، کـــە نائاگاییـــە، ئیفلـــیج و دیلـــە. بۆیـــە ســـوریالیزم، وەك ئـــەراگۆن دەڵـــێ، "جاڕنامەیـــەکی نـوێی مافـەکانی مرۆڤـە"، کـە نیـوەی مـرۆڤ لەگـەڵ نیوەکەی تری ئاشتدەکاتەوەو دەرفەت دەڕەخسێنێ تـا خـەیاڵ لەگـەڵ واقعـدا هـەڵبکاو ئاگـایی لەگـەڵ نائاگاییدا لێبوردە بێ.

لێرەوە، ئەرکی سۆفی گەڕان نییە بەشوێن جوانیدا، بەڵکو ئەرکی وی بەپلەی یەکەم کەشف و ئاشکراکردن و پەردەهەڵماڵینە لەسەر رەهەندە پەنهانەکانی بوون. بەم مانایە شەتەح وڕێنە یان درکاندنی قسەیەکی مەترسیدار نییە، بەڵکو قسەیەکە لەسەر ئاستی ئەنتۆلۆجی کەڵەکە بووە، لەپەیوەندیی بەردەوامی کەسی عارف بە گەردوون و بوونەوەرانەوە پەنگی خواردۆتەوەو لەناکاو دەتەقێتەوە، یان وەك دەڵێن شەتەح زمانێکی گەردوونییە، گەردوون لەڕێگەی قسەکەرێکەوە کە کەسی عارفە دەیدرکێنێ. بەرامبەر ئەم ئەرکەی سۆفی ئەرکی سوریالیست تەنها نەقڵی نائیرادیو راستەوخۆی وڕێنەکانی نائاگایی نییە، بەڵکو گەیاندنی پەیامێکە کە نائاگایی پاریزگاری لێکردووە، سەرباری گوشارەکانی ئاگاییو ئەقڵ.

## رەهەندی ئیستاتیکی:

مرۆڤ، چەندە خواپەرست بێو چەندە غەرقی عەشقی ئیلاهی بێ، دواجار لەنێوان ئەو و مەعشوقەکەیدا بۆشاییەکی گەورە هەیە کە پڕ نابێتەوە. گەورەیی یەزدان، لەدیدی سۆفیگەریدا، لەوەدا نیە کە پرسیار دەربارەی نەکەین و تووشی راچەنین و دڵەڕاوکێو گومان نەبین لەئاستیدا. گەر یەزدان نهێنییەکی گەردوونی مەزن بێو مرۆڤ دەستەوسان بێ لەئاستیدا، ئەوا ئەوین و پەرستنی وی پێویستی بە گەڕانی ناکۆتاو نیگەرانییەکی هەمیشەییو کەشفی ئەبەدیی هەیە. لەکاتێکدا زاتی یەزدانی سنوردار ناکرێ، تێگەیشتن بەو زاتەش بێسنورو بێکۆتایە.

ئیستاتیکای سۆفیگەری لەسەر دوو پایەی سەرەکی دامەزراوە: یەکەمیان، گەڕانی ناکۆتا بەدوای غەیبدا کە لەگەڵ هەموو کەشفێکدا بازنەی گەڕانەکە فراوانتر دەبێ. دووەم، گوزارشتکردن لەو گەڕانە گوزارشتکردنێکی تەمومژاویو هێمائامێزە، کە ملکەچی هیچ پێوەرێکی ئەقلانیو لۆجیکی نیە.

ئەزموونی سۆفیگەری پەنا بۆ رەگەزی پارادۆکس (کۆدژی)یش دەبا، بەو مانایەی بۆ گوزارشتکردن لەهەر شتێك دەبێ پەنا بۆ دژەکەی بەرێو بیکاتە شەریکی شتە گوزارشتلێکراوەکە. مەرگ بەشێکە لە ژیان و رۆژ بەشێکە لەشەو، وێکهاتنەوەی کەنارە هاودژو دوورەکان: جوڵەو بزاوت، هەقیقەت و خەیاڵ، ناوەو دەرەوە، دیارو نادیار. ئەزموونی نوسینیش لە سۆفیگەریدا ئەزموونێکی خاکییە کە ئیدعای بەرهەمهێنانی هیچ بیرۆکەیەکی فەلسەفی بەمانایەکی ئەبستراکت ناکا، بەڵکو تەنها تەعبیر لە کەش و دۆخە سەیرەکان دەکا. هیچ حیکایەتێك ناگێڕێتەوە، بەڵکو شتەکان بەئاگادێنێتەوەو نهێنیەکانیان دەتەقێنێتەوە.

شەتەح، بەشێکە لە ئیستاتیکای عیرفانی، ئاشکرابوونی کیشوەرێکی راستەقینەیە لە قەوارەی رۆحی مرۆڤدا کە (ئەقڵ)ی ئاینی رەسمی دایپلۆسیوەو یاساغی کردوەو چەپاندوویەتی. بەڵام سەیرەکە لەوەدایە ئەو ئەقڵە ئاینییەی بڕوای بە جنۆکەو جیهانە غەیبییەکان هەیە، بڕوای بەجیهانێکی شاراوەو غەیبی نییە لەناو ناخی مرۆڤدا، کە دەشێ هەڵگری هەندێ پرسیارو نیگەرانی بێ جیاواز لە پرسیارو نیگەرانییە دیارو باوەکان.

لەڕووی تەکنیکییەوە، زمانی سۆفیگەری پەنا بۆ مەجاز دەبا، چونکە مەجاز ئەو رەگەزە هونەرییەیە کە لەیەك کاتدا کەشف دەکاو تەمومژیش دەخولقێنێ. لەکاتێکدا مەجاز هەوڵدەدا وەڵام پێشکەش بکا، بەڵام پرسیار دەوروژێنێ. واتە مەجاز، لەڕووی مەعریفییەوە، فاکتەری نیگەرانیو

ورووژاندنی پرسیارە، هەربۆیە کولتوری رەسمی عەرەبی دژایەتی زۆری بەکارهێنانی مەجازی کردووە، بەتایبەتی لەبواری ئاینییدا.

داهێنانی سۆفیگەری هێندەی گرنگی بە بینین دەدا، هێندە بایەخ بە تێگەیشتن نادا. واتە وێنەکان بەشێوەیەکی راگوزەرو خێرا نمایشدەکا، بێ ئەوەی لەسەریان بوەستێو لەڕووی لۆجیکیەوە ڕوونیان بکاتەوە. واتە وێنە لەبەرترە لەمانا. نمایشکردنی وێنە هەوڵێکە بۆ رزگارکردنی ئەو گەردوونەی کە لە مانادا قەتیس ناکرێ.

لەڕێگەی (مانا)وە گوزارشت لە وێنە ناکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوە وێنەیە رەهەندێکی ئیستاتیکی دەبەخشێ بە مانا ئەبستراکت و پەتیەکان. بەڵام وێنە وەك مانا سنوردار ناکرێ، هەندێ جار مرۆڤ بێهوودە هەوڵدەدا وێنەکان وەك ماناکان بەرجەستەو سنووردار بکا تا بەڕاوەستاوی لێیان بڕوانێ، لەکاتێکدا وێنەکان تەنها بەشێکی بچووك و راگوزەریان نیشاندەدەن و رازی نابن داوا قەوارەیان بدەن بەدەستەوە. گەر یەزدان بەرجەستەکاری ئەو گەردوونە بێ کە هەموو وێنەکانی بەسەر یەکەوە لەخۆگرتووە، ئەوا تەنها زاتی وی دوا وێنەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا تەنها زاتی ئەویش لەهیچ وێنەیەکدا بەرجەستە نابێ. موسا پێغەمبەر (یەزادن)ی وەك مانایەکی گشتی دەناسی، بەڵام وێنەی ئەو یەزدانەی نەدەناسی، بۆیە لەکاتێکدا داوای لە یەزدان کرد وێنەی خۆی، وەك ماناکەی بەیان بکا، یەزدان داواکەی رەتکردووەو ئەوەی ئاشکراکرد کە ئاشکرابوونی وێنەی ئەو واتە کۆتایی، بەتایبەتی کاتێك خۆی نیشانی کێوێك داو کێوەکەش دەستبەجی گڕی گرت و بوو بە خەڵووز.

نیفەری، تەوحیدی، ئیبن عەرەبی.. سێ جەمسەری گرنگی سۆفیگەری عەرەبین، کە ئیستاتیکایەکی نوێیان سەبارەت بەشیعریەتی نوسین و فەلسەفەی بوون دامەزراند. ئەم ئیستاتیکا سۆفیگەرییە شۆڕشێکی سێ لایەنەی راگەیاند:

یەکەم: شیعرسازیو نوسینی ئەدەبی تەنها گەمەیەکی زمانەوانی نیە. وشەو رستەکان تەنها خشڵگەلێك نین بۆ رازاندنەوەی زمان، بەڵکو هەموو وشەو فریزێك هەڵگری بارگەیەکی ئەوتۆیە گەر بەڕاستی بەکاربهێنرێن هەستیاری مرۆڤ لەئاست بوون و ژیاندا قووڵتر دەکەنەوەو ئاسۆکانی بیرکردنەوە فراوانتر دەکەن.

دووەم: ژیان و رەهەندەکانی بوون زۆر لەوە فراوانترو هەمەجۆرترن کە ئێمە دەیانبینین و هەستیان پێدەکەین، بگرە ئەوەی ئێمە دەیبینین لایەنە بەرتەسك و ساختەکەی بوونە. مرۆڤ بەهۆی گیرخواردنی لەنێو پێوەرە کۆمەڵایەتیو رەسمیەکان و گیرخواردنی لەنێو ئابلۆقەی ئەو شتەی ناونراوە لۆجیك و حوکمی ئەقڵ.. هەموو هەستیاریەکی لەئاست گەردووندا لەدەستداوە.

سێیەم: ئەوەی ناومان ناوە هەقیقەت لە جیهانی دیاردە مادیو راستەوخۆکاندا بوونی نیە، هەروەها مەعریفەی زانستیو پۆزەتیڤیستی توانای کەشفکردن و حوکمدانی لەسەر هەقیقەت نیە. بەڵکو هەقیقەت ئەو کاتە هەقیقەتە کە هەمیشە وەك نهێنی بمێنێتەوە.

هەرچەندە مرۆڤ نکوڵی لە ئەفسانەو حیکایەتە خورافیەکان دەکا، بەڵام هەمیشە وەك پێکهێنەرێکی زیندووی یادەوەری نەتەوەو مرۆڤەکان دەمێننەوە. سەرباری پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆجیا سەردەمی ئەفسانەکان بەسەر ناچێ. بایەخی ئەفسانەکان لەوەدایە کە هەمیشە لە نائاگایی

دەستەجەمعیی مرۆڤەکاندا دەمێننەوە. رەمز کە رەگەزێکی گرنگی ئەفسانەیە، دەبێتە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان هەقیقەتە بەرجەستەکان و هەقیقەتە ئاشکرانەکراوەکان، نێوان دوێنێو ئەمڕۆ، مەرگ و ژیان، دیارو نادیار.

## جیاوازی/ هاوبەندی

سۆفیگەری هەمیشە، لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو سیاسی، لەلایەن ئایدیۆلۆجیای رەسمییەوە دژایەتی کراوە. لەنێوان ئەزموونی سۆفیگەریو دەزگای کولتوری رەسمیدا، لەنێوان عارف و فەقیهدا، هەمیشە کێشەو ململانێ هەبووە، کە ئەڵبەتە لەڕێی بەکارهێنانی هێزو دەسەڵات و هوشیاری گشتیەوە لەبەرژەوەندیی دەزگای فیقهی رەسمی شکاوەتەوە.

سۆفیگەری عەقیدەیەکە ئاینی نیە، بەڵکو شێوازێکی تایبەتە بۆ ئایینناسیو خواپەرستی. خوێندنەوەی عارف بۆ دەقی ئاینی خوێندنەوەیەکی رواڵەتی نیە بەڵکو خویندنەوەیەکی تەئویلی ئیزۆتیریە، کە بایەخ بە رەهەندی شیعریو فرەمانایی دەدا بۆ دۆزینەوەی ئەو ئاسۆ نوێیانەی کە لەگەڵ فرە پرسیاریو نیگەرانی بەردەوامی مرۆڤدا دەگونجێ.

بەڵام خویندنەوەی تەئویلی/ ئیزۆتیری بۆ دەقی ئاینی، بەهەمان ئەو ئەندازەیەی ئارامیی رۆحی بۆ کەسی عارف دەستەبەر دەکا، کێشە بۆ فیکری رەسمیو پاشان بۆ ئەو دەسەڵاتە دروستدەکا کە پشتئەستووره بەو فیکرە. بۆیە ململانێی نێوان سۆفیگەریو دەسەڵاتی فیقهی رەسمی تەنها بەوەوە نەوەستاوە کە ململانێیەکی فیکری بێ، بەڵکو زۆرجار گەیشتۆتە ئاستی داپڵۆسین و قەدەغەکردن و پاکتاوکردنی جەستەیی پێشەنگانی سۆفیگەری.

گەر سۆفیگەری، لەجیهانی ئیسلامیدا، لە ململانێدا بووبێ لەگەڵ دەزگای فیقهیو سیاسییو هوشیاری گشتی عەوامی خەڵکدا، ئەوا سوریالیزمیش لە خۆرئاوا بەشەڕێکی گەورە دژی هەموو دەزگا کولتوریو سیاسیو میللیەکان دەستی پێکرد. سوریالیزم دژی هەموو ئەو پێوەرو قاڵبانە بوو کە دیدی کۆمەڵایەتیو سیاسیی باو و چێژی ئیستاتیکیی ئەو دەمەی خۆرئاوای لەسەر دامەزرابوو. سوریالیەکان لەو شەڕەیاندا هیچ سازشێکیان قەبوڵ نەبوو، بڕوایان بەتێکوپێکدانی تەواوی ژیاری مەعنەویو رۆحیی خۆرئاوا هەبوو. بەڵام بەرپەرچدانەوەی ژیاری ئەو دەمەی خۆرئاوا بۆ سوریالیەکان راستەوخۆ نەبوو، واتە وەك بەرپەرچدانەوەی سۆفیگەری لەجیهانی ئیسلامیدا بەپێکدادان و پاکتاوکردنی رەمزە سەرەکیەکانی کۆتایی نەهات. بەڵکو دژایەتیکردنێکی ئەقڵانی بوو، واتە خۆرئاوایەکان بەهەمان ئەو چەکە دژایەتی سوریالیزمیان دەکرد، کە سوریالیزم لەبناغەوە دژایەتی دەکرد، ئەو چەکە ئەقڵ بوو کە لەسەرەتای پەیداکردنی باڵادەستیی تەواو و بەهێزکردنی پێگەی خۆیدا بوو لە ئەوروپا.

گەر درکاندنی شەتەح ئەو تۆمەتە ئاینییە بوو بێ کە لەجیهانی ئیسلامیدا درایە پاڵ عارفەکان.. ئەوا وڕێنەو قسەبزڕکان ئەو تۆمەتە زانستیو ئەقڵانییە بوو کە درایەپاڵ سوریالیەکان. عارفەکان لەجیهانی واقعی دەرکران بەوەی وەك خەڵکی ئاسایی نیشتەجێی جیهان نین بەڵکو نیشتەجێی غەیبن، هەرچی سوریالیەکانە بەوە تۆمەتباردەکران کە یەخسیری گرێو نەخۆشییە دەروونیەکانیانن.

بەڵام لەراستیدا هەموو شاعیرێکی گەورەو هەموو هونەرمەندێکی ئەفرێنەر.. یان عارفە یان سوریالییە. کەسێکە هەمیشە جیهانێك دەخولقێنێ

کە ئەم جیهانە نیەو پرسیارگەلێك دەوروژێنێ کە لەهوشـیاری گشـتیدا ناچـیزن و هێشـتا کاتیـان نـەهاتووە. شـاعیرەکان دەیانـەوێ، لەگـەڵ خۆیانـدا، لـەو کـەش و سـرووتانە دەرمـان بێـنن کـە بوونەتە بەشێك لە ژیانی رۆتین و ئەرکی رۆژانەمان. پـەنابردن بـۆ جیهـانی بوونـەوەرو شـتە نادیارەکـان، گـەڕان بـەدوای ژیـان و شـوێنێکی یۆتۆپیـدا، پرسـیارکردن لـە غـەیب و لەئاسـۆ دوورەکـانی کەشف... خولیا هەمیشەییەکانی هەر شاعیرێکن.

سـۆفیگەریو سـوریالیزم دوو ئـەزموون نـین دژ بەزانست و ئـەقڵ، بەڵکو دژ بەو تایپـەی زانستن کە بەرهەمـەکانی وەك دوا بەرهـەم و دژ بـەو تایپـەی ئـەقڵن کـە حوکمـەکانی بـەدوا حـوکمی لـۆجیکی دەزانـێ. لای سـۆفیو سـوریالیەکان کۆتـایی بـوونی نیە، ئەوی مرۆڤ ئاشکرای دەکا کۆتـایی نیـە بـەڵکو ئاسـۆیە. سـۆفیگەری لەسـەردەمێکدا لـەجیهانی ئیسلامیدا گەشەی کرد کە کولتوری رەسمی هـەموو زانستەکانی بەسـەر ئـەقڵو نەقڵـدا دابـەش کردبـوو، بەوەش قفڵی لەئاسۆ نوێیەکانی بیرکردنەوەو روانین دابـوو، چـونکە دەبـوو زانسـتە ئەقڵییـەکان لەگـەڵ بەڵگـە نەقڵیەکانـدا بگـونجێن، بەڵگـە نەقڵیـەکانیش ئەوانـەن کـە لـە رواڵـەتی دەقـە پیرۆزەکانـدا بەدەردەکـەون وقـابلی هـیچ تـەئویلێك نـین. بـەڵام سـوریالیزم لەسـەردەمی گەشـەی تەکنـەلۆجیاو زانستە ئەمپیریەکانـدا سـەریهەڵدا، ئـەو زانسـتانەی کـە رۆڵێکـی مەرکـەزیو یەکلاکـەرەوەیان دەبەخشـی بەئـەقڵ، بـەوەش قفڵیـان لەهـەر ئاسـۆیەکی نـوێی بیرکردنـەوەو روانین دەدا کـە سەرچـاوەکەی ئـەقڵو بەڵگەی ئەمپیری نەبێ.

### بینراو/ نەبینراو:

یەکێك لەو عارفە گەورانەی عەرەب کە دابڕانێکی شیعری، فیکریو مەعریفی لە کولتوری سۆفیگەریی عـەرەب و موسـڵماناندا بەگشـتی ئەنجامـداوە (نیفەری)یـە. ئـەزموونی نوسـینی وی رسـکێکی گەورەیـە لـە فـەزای زمـان و خەیاڵـدا. نیفـەری سەرلەنوێ سیستمی ناونان دادەڕێژێتەوە بەجۆرێك لەگەڵ ئەزموونی زاتی خۆیدا بگونجێ. ئەزموونێك کـە پەیوەنـدیی نـوێ لـەنێوان وشـەو وشـە، وشـەو شتەکاندا دەدۆزێتەوە.

تـاوەکو مـەودای روانـین و جیهـانبینی نیفـەری بـەرفراوانتر ببـێ، شـێوازی نوسـینەکەی ئـاڵۆزترو نەفەسـی تـەعبیرکردنی کـورتتر دەبێتـەوە. لای وی زمـان دەزگایـەکی نوقسـانە بـۆ گوزارشـتکردن لـە ئەزموون و فیکری عیرفانی، بۆیە تـا ئـەو ئەزموون وفیکـرە قـووڵتر ببنـەوە، زمـان دەسـتکورتی خـۆی زۆرتر نیشاندەدا. قسە بەناوبانگەکەی کە دەڵێ: "تا مـەودای روانـین بـەرفراوانتر ببـێ، رووبـەری تـەعبیر تەسکتر دەبێتەوە"، جوانترین گوزارشتە لەو دۆخی ناکۆتایە، ناکۆتا لەگەورەیی نهێنیەکان و ناکۆتـا لـە سـانایی و بچـووکییاندا، لەهـەردوو حاڵەتەکـەدا دەسـتگیر نـابن، لەحاڵـەتی یەکەمیانـدا روانـین لـەفراوانی مەوداکانـدا دەڕەوێتـەوەو دەپووکێتـەوە، لەحاڵـەتی دووەمیشـیاندا زمـان لـە بێدەسـەڵاتیدا تەسـلیم دەبـێ. نیفـەری دەڕوانێتـە شـتەکان وەك ئـەوەی پێشـتر ناونـەنرابن، دەڕوانێتـە جیهـان وەك ئەوەی پێشتر بیری لێنەکرابێتەوە. لەو جیهانەدا کە هـیچ شوناسـێك قـەبوڵ ناکـا، مـرۆڤ نهێنییـەکی گەورەیـە، خـود بـوونێکی نـامۆی هەیـە لەئاسـت خاوەنەکەیـدا. واتـە مـرۆڤ تـەنها لەئاسـت جیهـانی بێکۆتادا بوونـەوەرێکی تاساو نیە، بـەڵکو لەئاسـت نهێنی خۆیشیدا نامۆو بێوەڵامە.

لەکاتێکـدا نیفـەری دەکەوێتـە کێشـمەکێش و پرسـیارەوە لەگـەڵ جیهـان و (خـود)دا، کولتـوری

بالادەستیش دەکەوێتە کێشەو ململانێوە لەگەڵیدا. چونکە هەموو هەنگاوێکی شیعریو مەعریفی ئەو بەئاڕاستەی هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکە پێشوەختەکانی ناو مێشکی خۆی یەکسانە بە هەڵوەشانەوەی سیستمی پەیوەندیەکانی مەعریفەی کۆمەڵایەتی ئاینیی باو کە هەمیشە سنوور بۆ دیاردەکان دەکێشێو شتەکان ناودەنێ. ئەو پەیوەندی لەگەڵ ئاسۆ دوورەکان و چەمکە نادیارەکان وجیهانە کەشف نەکراوەکاندا دادەمەزرێنێ. ئەڵبەتە هەموو کارکردنێکیش لە جیهانی نادیاردا، بەگوێرەی ئایدیۆلۆجیای رەسمیو ئاینیی بالادەست، جۆرێکە لە توخنکەوتنی حەرام لە دنیایەکدا کە دەبێ هەموو کونجەکانی دیارو هەموو پرسیارەکانی وەلامدراوە بن.

لە جیهانی خۆرئاواشدا، شاعیرێکی گەورە کە دەبێتە ژێدەرێکی سەرەکیو گرنگی سوریالیزم، رۆڵێکی لەمجۆرە دەبینێو لەدەقەکانیدا دەنگدانەوەی نیگەرانیو پرسیارە ناکۆتاکانی ئیشراقی سۆفی دەبیسترێ. ئەوشاعیرە (ئارسۆر رامبۆ)یە، کە لە هەردوو دیوانە شیعرییە سەرەکیەکەیدا "ئیشراق"و "وەرزێك لە دۆزەخ" مرۆڤێکی گەڕیدە دەبینین، مرۆڤێك لە زۆنگاوەکانی خۆرئاوا هەڵدێ بەشوێن سیحرێکدا کە سەرچاوەکەی خۆرهەلاتە.

نەفەسی شیعریی رامبۆ نەفەسێکی دژە خۆرئاوایە، ئەو خۆرهەلاتە ون و سەرابییەی ئەو بەشوێنیدا وێڵە نە لە ژێدەرە گریکیو نە لەژێدەرە کریستیانە کۆنەکاندا وێنەیان نیە، بەڵکو زیاتر لە کەلەپوری عیرفانی خۆرهەلاتیەکاندا دەیبینینەوە. لە یەکێ لە چامەکانیداو لە وەلامی هاوارێکی (گۆتە)دا کاتێ دەڵێ: "خۆت دەربازکە. بڕۆ بۆ خۆرهەلاتی بێگەرد... هەڵمژە هەوای باپیران"(ل236)، رامبۆ بڕیار دەدا لە زۆنگاوە خۆرئاواییەکان هەڵبێ: "دەگەڕێمەوە بۆ خۆرهەلات، مەنزڵی یەکەمین حیکمەتی ئەبەدیی"(ل236).

رامبۆ کودەتایەك دژی ئەقلانیەت و لۆجیکی خۆرئاوا بەرپادەکا، بەلام بە چەکی ئەقڵ ئەو شەڕە ناکا، بەڵکو لەڕێگەی ئیشراقی عیرفانییەوە هەموو پەیوەندییە فیکریو رەگەزە ئیستاتیکییە جێگیرەکان هەڵدەوەشێنێتەوە. بانگەشە بۆ جوانبینییەکی نوێ دەکا کە پشتئەستوورە بە خەونبینینی بەردەوام و جێگۆڕکێ لە وەزیفەی هەستەکاندا.

تایبەتمەندیی یەکەمی شیعری رامبۆ بریتییە لە ئاڵۆزی تا دوا ئاسۆ. ئەو هەمیشە جیهانێك تەرجەمە دەکا بۆ زمانی شیعر کە تا دوا ئەندازە نادیارو نەبینراوە، جیهانێك لە چوارچێوەی هیچ دەقێکدا وێنا ناکرێ جگە لە دەقی رامبۆیی. زمانی وی زمانێکی درێژدادڕ نیە بەڵکو ترانسندنتاڵە، هەمان ئەو قسەیەی (نیفەری)یمان دێنێتەوە یاد کە دەڵێ تا ڕوانین ئاڵۆزتر ببێ ئاماژەکانی زمان راگوزەرتر دەبن.

تایبەتمەندیی دووەم، هەلاتنی بەردەوامە لەجیهانی خۆرئاوا، کە تەنراوە بە ئەندازەی ئاکلیدیو ئەقلانیەتی دیکارتی. چونکە جیهانی وی لەوە سیحری ترە کە فەلسەفەی دیکارت تەفسیری بکاو رەهەندە گەردوونی وی لەوە ئاڵۆزتر و دەوڵەمەندتر و هەمەجۆرترن کە لە قالبی ئەندازەناسی ئاکلیدیدا جێگەیان ببێتەوە.

تایبەتمەندیی سێیەم لە ئەزموونی شیعریی رامبۆدا پەیوەندیی بە تێپەڕاندنی دوالیزمەکانەوە هەیە، بەتایبەتی دوالیزمی خود/ بابەت ( *Subject/ Object*) کە دوالیزمێکی ئەقلانییەو لەسەر بنەمای

سـنوربەندیو جیاكـاریی دامـەزراوە. مەعریفـەی شـیعریی، بـەگوێرەی یاسـای دوالیزمـەكان، مەعریفەیەكی هەڵخەڵەتێنەرە، چونكە پشتئەستورە بـە (حەدس)ـی فـەردیی نـەك یاسا كۆنكرێتیـەكانی ئەقڵو جیهانی بابەتی. بەڵام جیهان لەدیدی رامبـۆدا قابلی دابەشبوون و پارچە پارچەكردن نیە، لەپشـت سـنوورە ئـەقڵیو لۆجیكیەكانـەوە ئـەو پەیوەندییـە شیعریانە ئامـادەن كـە یـەكێتی ئـەنتۆلۆجی لـەنێوان خودو بابەتدا دادەمەزرێنن، ئیدی سنورێك لـەنێوان (من)و (ئێمە)دا، لەنێوان (من)و (بوون)دا نامێنێ.

بۆیـە دەبـێ دەقـی رامبـۆیی بەهـەمان شـێوەی دەقـی عیرفـانی بخوێندرێتـەوە، لـەو دەقـەدا ئامـاژە گرنگـە نـەك مانـا، ئاسۆ گرنگـە نـەك سـنوور، پرسـیار سـەنتراڵە نـەك هەقیقـەت. لـە دەقـی سـۆفیگەری/ سـوریالیدا ئامـاژە راگـوزەرو ناجێگیرەكـان پێـوەری جـێگیری هـەموو هەقیقـەت و ماناكانن، یـان وەك حـەللاج دەڵـێ: "ئـەو كەسـەی لـە ئاماژەكانمان ورد نەبێتـەوە، گوزارشتەكانمان دادی نادا"(ل240).

## سەرچاوە:

أدونـيس، "الصـوفية والسـوريالية". بـيروت: دار الساقي، 1995،ط2.

# شیعر و فەلسەفە

## دەروازەیەك بۆ جیهانی ئەدۆنیس

خوێندنەوەی: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین گرنگترین بەشەکانی کتێبی (شیعر و بوون، لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی لە شیعری ئەدۆنیس) بخەینە ڕوو، بە تایبەتی بەشی یەکەمی کە بریتییە لە دەروازەیەکی گشتی بۆ چوونە ناو دنیای ئەدۆنیس و خوێندنەوەی شیعرەکانی لە تێڕوانینێکی فەلسەفییەوە، دانەری ئەم کتێبە (د. عادل ضاهر) خاوەنی چەندین کتێبی ترە کە لە ڕوانگەیەکی فەلسەفییەوە لە مەسەلە فیکرییە گرنگەکان دەدوێت، یەکێ لەوانە کتێبی "بنەما فەلسەفییەکانی عەلمانییەت"ە کە تیایدا گرنگترین تێزە فەلسەفی و بنەما ئیپستیمۆلۆژییەکانی عەلمانییەت دەخاتە ڕوو.

ئەم کتێبەی بەردەستمان کە لە بارەی ئەدۆنیسی بیریار و شاعیر نووسیویەتی بەناوی (الشعر و الوجود، دراسة فلسفية في شعر ادونيس) لە (دار المدى) لە سوریا لە ساڵی 2000دا چاپکراوە، جگە لە پێشەکیەك لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە، بەشی یەکەم ئەم ناونیشانانە لە خۆدەگرێت: دەروازەیەك بۆ جیهانی ئەدۆنیس،




لە نێوان فەلسەفەو شیعردا، فەلسەفەکردنی شیعرییانە، تەماهی شیعر و فەلسەفە لە ئەزموونی ئەدۆنیسدا. بەشی دووەم: دیالێکتیکی خودگەرایی

ئەدۆنیسی، گەڕانەوە بۆ خود، ئازادی و ئەزموونی نەفیکردن، ئیرادەی دۆزینەوە یان ئیرادەی خوڵقاندن. بەشی سێیەم: خوێندنەوەیەکی فەلسەفی بۆ تێکستی "الکتاب امس المکان الان"، ڕەخنە لە ڕۆشنبیریی دەسەڵاتگەرایی، ئیرادەی نا ڕۆشنی و گوناهی هیراکلیتی.

ئەم نووسەرە یەکەمجار نییە لە ڕوانگەیەکی فەلسەفییەوە ئەدۆنیس دەخوێنێتەوە، یاخود بەدوای تێڕوانینە فەلسەفیەکانی ئەدۆنیسدا دەگەڕێ و جیهانبینی فەلسەفیی لە شیعرەکانیدا بەرجەستە دەکات. یەکەم خوێندنەوەی فەلسەفییانەی بۆ ئەدۆنیس لە سەرەتای شەستەکاندا بوو کاتێك کۆمەڵە شیعری "گۆرانییەکانی میهیاری دیمەشقی"ی چاپ کرد، ئەمە بوو بە سەرەتای پرۆژەیەکی گەورەتر کە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا دەستی پێکرد و گرنگترین بەرهەمە شیعرییەکانی ئەدۆنیسی لە دیدی فەلسەفییەوە یەکالاکردەوە.

د. عادل لە سەرەتادا خوێنەر لە چەند مەسەلەیەك ئاگادار دەکاتەوە، بۆ نموونە دەڵێت کاتێك خوێندنەوەیەکی فەلسەفی بۆ ئەدۆنیس ئەنجام دەدەین، نابێ خوێنەر پەلە بکات لەوەی بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەدۆنیس تێڕوانینێکی فەلسەفیی کامڵی بۆ ژیان و جیهان هەیە و لەسەر بنەمایەکی ئەقڵی و بە جیاواز لە ئەزموونە شیعرییەکەی گەیشتۆتە ئەو تێڕوانینە، واتە نابێ خوێنەر وا تێبگات کە ئەدۆنیس لە بنەڕەتدا خاوەنی دیدێکی فەلسەفیی ئەقلانییە و دواتر هەوڵدەدات ئەو دیدە فەلسەفییە لە قاڵبێکی شیعریدا دابڕێژێت. نەخێر، بەڵکو ئەدۆنیس بەر لە هەرچی شاعیرە و لە خەیاڵێکی شیعریی بەرفراوانەوە دەڕوانێتە ژیان و جیهان کە لە دواییدا لە چەند بیرێکی فەلسەفیدا دەردەکەون.

## شیعر و بیر

بێگومان ئەدۆنیس بە تەنها شاعیر نییە، بەڵکو تیۆریستی شیعریشە، یەکێکە لە گرنگترین دارێژەرانی تیۆری شیعریی ئەم چەرخەمان، هەروەها ئەدۆنیس خاوەنی بیر و تێڕوانینێکی پێشکەوتووانەیە بۆ ژیان کە لەبەرهەمە شیعری و لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەریدەبڕێت، لەسەرجەم نووسینەکانیشیدا چەندین پرسیاری فەلسەفی دەوروژێنێت و دیدێکی فەلسەفی قووڵ نیشاندەدات، بەڵام نابێت بیری ئەدۆنیس و تێڕوانینی بۆ ژیان و جیهان لە شیعرەکانی جیا بکەینەوە و پێمان وابێت ئەوەی لە شیعرەکانیدا دەریدەبڕێت گوزارشتێکی مەجازییە لەو بیرە فەلسەفییەی بە ئەقڵ پێی گەیشتووە یان بەرێگەیەکی ناشیعری پێی گەیشتووە. لە ڕاستیدا ئەو دیدە فیکری و ئەو جیهانبینیە فەلسەفییەی لە شیعرەکانیدا دەیبینین بە دابڕاوی لە ئەزموونە شیعرییەکەیەوە لە دایك نەبوون، بەڵکو لە نێو خودی پرۆسە شیعرییەکەیدا گەڵاڵەبوون و پێگەیشتن. واتە شیعری ئەدۆنیس گرنگترین ڕێچکەیە بەرەو بیری فەلسەفی و تێڕوانینی بۆ ژیان، ئەمەیش شتێکی زۆر ئاساییە چونکە ئەدۆنیس بەر لە هەر شتێکی تر شاعیرە نەك بیرمەندێکی میتۆدگەرا و فەیلەسوفێکی پسپۆر بە مانای قووڵی وشەی فەیلەسوف، بەڵکو شاعیرێکی جیاواز و دەگمەنە و دەشێت بە (شاعیر/ بیرمەند) ناوی ببەین، ئەو کاتێك شیعر دەنووسێت بیر دەکاتەوە نەك لە سەرەتادا بیرێکی فەلسەفی هەبێت و پاشان بیکات بە شیعر، بەڵام مادامەکی فەلسەفە یەکێکە لە پێکهاتەکانی فیکری ئەو، کەواتە ئاساییە

فەلسەفە لەو حاڵەتانەدا دەربکەوێت کە بە شێوەیەکی شیعریی بیردەکاتەوە نەك بەشێوەی فەیلەسوفێك کە بیرە فەلسەفییەکانی لە ئەنجامی تیۆرسازییەکی ئەقڵی و میتۆدیدا لەدایك دەبن، بەڵکو بیرە فەلسەفییەکانی ئەدۆنیس لە ئەنجامی بیرکردنەوەی شیعری و هەست و خەیاڵێکی شیعریی بەرفراوان لەدایك دەبن. کەواتە ئەدۆنیس بەهۆی چوونە نێو قووڵایی جیهانی شیعر و تەماهیکردنی لەگەڵ شیعر و ئەزموونی شیعریدا، مومکین نییە وەکو فەیلەسوفێك بیر بکاتەوە،

## دیدی فەلسەفییانەی شاعیر

بالێرەدا ئەم مەسەلەیە روونتر بکەینەوە و چەند نموونەیەك لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانیدا بهێنینەوە، بۆ نموونە لە کتێبی "زەمەنی شیعر"دا وەکو تیۆریستێکی تازەگەریی شیعری بۆچوونەکانی لە بارەی شیعر و ژیان دادەرێژێت، لەوێدا خوێنەری رۆشنبیر و شارەزا لە فەلسەفە هیچ زەحمەتییەك لەوەدا نابینێت دەرك بە سروشتی فەلسەفییانەی ئەو پرسیارانە بکات کە هەر خۆی وەڵامیان دەداتەوە و تیۆریزەیان بۆ دەکات، بۆ نموونە پرسیاری وەکو: شیعر چییە؟ تازەگەریی شیعری مانای چییە؟ پەخشانە شیعر چییە؟ ئەم پرسیارانە بێگومان پرسیارگەلێکن سروشتێکی فەلسەفییان هەیە و ئەدۆنیسیش لە قووڵایی دیدێکی فەلسەفییەوە وەڵامیان دەداتەوە، بەڵام بێئەوەی پەیرەوی یاسا و رێساکانی نووسینی فەلسەفی بکات وەك بونیادی لۆجیکی و رێکخستنی فیکرەکان بەشێوەیەکی مەنتیقی، بۆ نموونە کە دەڵێت "شیعر بریتییە لە میتافیزیای ناوەوە"، وا هەست دەکەین ئەم گوتەیە مەدلولێکی فەلسەفیی قووڵی هەیە و رستەی لۆجیکیی و سەلمێنەری بەدوادا دێت، بەڵام ئەدۆنیس لەوێدا دەوەستێت، چونکە هەمیشە لە شیعردا نیشتەجێیە، تەنها بە زمانی شیعر دەتوانێت بدوێت تەنانەت لەو کاتانەشدا کە دەبێ بە زمانی فەلسەفە قسە بکات.

جگە لەو دیدە فەلسەفییەی لە لێکۆڵینەوەو تیۆرییە ئەدەبییەکانیدا هەیە، هەمان دید و تێڕوانین بەشێوەیەکی فراوانتر لە نووسینە فیکرییەکانیشیدا دەبینین و پرسیاری فەلسەفیی لە چەشنی ئەنتۆلۆجی و ئیپستیمۆلۆجی دەوروژێنێت، بۆ نموونە: سروشتی حەقیقەت چییە؟ پەیوەندیی نێوان واقیعی دیار و واقیعی نادیار چییە؟ پەیوەندیی واقیع بە زمانەوە چییە؟ سروشتی مەعریفەی شیعری چییە؟ چ پەیوەندییەك لە نێوان ئەزموونی شیعری و ئەزموونی سۆفیزمدا هەیە؟ ئایا مەجاز (میتافۆر) وەسیلەیەکە بۆ ئیپستیم؟ ئاخۆ ئیپستیمی ئەقڵی بەرزترین جۆری ئیپستیمە؟ ئایا بوون یەکە یان فرەیە؟ ئاخۆ دەشێت دەستبەسەر حەقیقەت لە خۆیدا، بگرین؟

ئەدۆنیس لە چوونە نێو وەڵام و یەکالاکردنەوەی ئەو پرسیارانەدا دەستبەرداری کەرەستە لۆجیکی و شیکردنەوە فەلسەفییەکان دەبێت بەتایبەتی دیالێکتیکی سوکرات، بۆچی؟ چونکە ئەدۆنیس بە گیان و هەست و خەیاڵێکی شیعری و بەرێگەیەکی نائەقلانی دەچێتە نێو نهێنییەکانی بوون، واتە بەرێگەیەکی شیعری لە مانا فەلسەفییەکانی ژیان رادەمێنێت، چونکە شیعر لەلای ئەدۆنیس جۆرێك لە ئیپستیمی نائەقلانی دەنوێنێت، یان ئەوەی کە تێڕوانینی مەعریفیی راستەقینە پێویستی بە چوونە نێو ئەودیوی هەستەکان هەیە. مرۆڤ هەندێجار وا هەست دەکات کە فیکرەکەی تەنها لە سەریدا نییە بەڵکو لە هەموو جەستەیدایە، دەشێت هەندێجار لە هەردوو پێدا ئامادەبێت پتر لەوەی

لەسەردا ئامادەیە، حەقیقەتیش لە دەرەوە نایەت، واتە لە کتێب یان لە شەرع یان لە یاسا یان لە بیر و ڕێنوێنییەکانەوە نایەت، بەڵکو لە ناوەوە دێت، لە ئەزموونی زیندووەوە دێت، لە خۆشەویستی و لە پەیوەندیی بەردەوامدا لەگەڵ شتەکان و گەردووندا دێت. لێرەدا ئەقڵ هەموو شتێك نییە، زانینی حەقیقەتیش سەرتاپای مرۆڤ دەگرێتەوە نەك تەنها لایەنی ئەقڵیی مرۆڤ. خەیاڵ یەکێکە لە پێکهاتە هەرە گرنگەکانی بیر و ئەندێشەی مرۆڤ کە ئەدۆنیس بایەخێکی زۆری پێدەدات و زمانی شیعر لە لۆجیك دوور دەخاتەوە.

## زمانی ڕەهاو جیهانی بێسنوور

ئەدۆنیس وایدەبینێت کە سروشتی شیعر خۆی، ئەو دوورکەوتنەوەیەی نێوان زمانی شیعر و لۆجیك تەفسیر دەکات، ئەدۆنیس دەڵێ نهێنی شیعر لێرەدایە، واتە لەو تایبەتمەندییە شیعرییەدایە کە گوزارشت لە جیهانێك دەکات زمانی ئاسایی دەستەوستانە لە بەرامبەریدا. زمانی ئاسایی زمانێکی دیاریکراو و سنووردارە، کەچی جیهان سنووری نییە، ئێمە ناتوانین بەشتێکی سنوردار گوزارشت لە جیهانی بێ سنوور بکەین، بۆیە زمانی شیعر زمانێکی ڕەهاو هەمیشە کراوەو بێسنوورە بۆ گوزارشتکردن لە ڕەهەند و لە نهێنییەکانی ژیان و بوون.

لێرەوە ئەدۆنیس هەوڵێکی زۆری داوە خۆی لە کۆتەکانی لۆجیك و ڕێسا و یاساکانی میتۆدێکی برینگ ڕزگار بکات، ئەمەیش لە ڕاستیدا گوزارشتە لە هەڵوێستێکی فەلسەفی کە چەند ڕەهەندێکی ئیپیستیمۆلۆجی و میتازمانەوانیی هەیە، دەرەنجامی ئەم هەڵوێستەیش ئەو گوتەیەیە کە دەڵێت مەعریفەی ئەقڵی باڵاترین جۆری مەعریفە نییە، شیعریش ڕێگەیەکە لەو ڕێگە نائەقڵییانەی دەگاتە بەرزترین مەعریفەی حەقیقەت. لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە دوورکەوتنەوەی ئەدۆنیس لە یاسا و ڕێساکانی لۆجیك و میتۆد شتێکی سروشتی نییە کە لە سروشتی نووسینی شیعرییەوە هاتبێتە دەرێ، بەڵکو گوزارشتێکیشە لە هەڵوێستی لە بەرامبەر ئەقڵ و بچوککردنەوەی توانای ئەقڵ کە هەموو مەعریفە بەشەرییەکان لەسەر تواناکانی ئەقڵ نەوەستاون. شیعریش گرنگترین پاڵپشتە بۆ مەعریفەی فەلسەفی.

مەعریفەی فەلسەفی هەوڵدەدات بگاتە شوێنێکی دوورتر لەوەی ئەقڵی ئاسایی و ئەقڵی زانستی پێی گەیشتوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت بازێکی گەورە بدات تا بگاتە شوێنێکی دوورتر، ئیدی وەك دیلی لۆجیك و چوارچێوەکانی میتۆد دەمێنێتەوە. لێرەدا ڕۆڵی "ئیپستیمی" نائەقڵانی دێتە پێشێ، واتە ئیپستیمی شیعری، بۆ تەواوکردنی ئەو هەنگاوانەی کە ئیپستیمی فەلسەفی ناتوانێت تەواویان بکات. کەواتە شیعر دەمانگەیەنێتە مەعریفەیەك قووڵتر لە مەعریفەی فەلسەفی، یان بڵێین مەعریفەیەکی فەلسەفی قووڵتر لە مەعریفەی فەلسەفیی ئەقڵی.

## فاکتەرەکانی پێکهاتەی فیکریی ئەدۆنیس

هەر داهێنەرێك لە بواری ئەدەب و هونەردا دید و جیهانبینی خۆی بۆ ژیانو شتەکان ڕادەگەیەنێت، ئەمەیش شتێکی سروشتییە کە تێڕوانینی فەلسەفییانە لەو کارانەدا ببینین، چونکە کاری مەزنی هەر داهێنەرێك بەشێکە لە ژیان و ئەزموون و بیر و هەڵوێست و توانای داهێنەرەکە، بگرە پەیوەستە بەلایەنی سایکۆلۆژیی داهێنەرەکە، واتە پەیوەستە بە هەموو ئەو هۆکارانەی کەسایەتیی

داهێنەرەکەیان خولقاندووە، لێرەوە دەشێت بەدوای ئەو فاکتەرانەدا بگەڕێین کە توانایەکی جیاواز بە داهێنەرەکە دەبەخشێت و ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت لە پێکهێنانی کەسایەتیی فیکری و ڕۆشنبیریی داهێنەر.

کەواتە لێرەدا پەنا دەبەینە بەر زانینی ئەو فاکتەرانەی بەشێوەیەکی بنچینەیی بەشدارییان لە دروستکردنی کەسایەتیی فیکریی خاوەن داهێنانێکی گەورەدا کردووە. کەواتە لێرەوە دەپرسین: ئەو فاکتەرانە چین کە بەشدارییان لە پێکهێنانی کەسایەتیی فیکریی ئەدۆنیسدا کردووە؟

بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، پێویستە ئەو تێبینییەی نووسەری کتێبەکە بە بیر خوێنەر بهێنینەوە کە دەڵێت کەسایەتیی فیکریی ئەدۆنیس دابڕاو نییە لە کەسایەتیی شیعریی. پێکەوە گرێدانی لایەنی فیکری و شیعری لە ئەدۆنیسدا، وای لێکردووە وەکو شاعیرێکی بیریار بنووسێت، بە ئەقڵ و زمانێکی شیعری بیری فەلسەفی دابڕێژێت کە ئەو بیرە فەلسەفییە لە بنەڕەتدا گەڵاڵەی نێو ئەزمونە شیعرییەکەیەتی نەك خوێندنەوەی فەلسەفە و رامان لە ژیان و جیهان لە دەرەوەی شیعردا، بۆیە دەشێت ئەم وەسفەی خوارەوە بۆ ئەدۆنیس بەڕەوا بزانین کە "بیریاری شاعیران و شاعیری بیریارانە".

وتمان کەسایەتیی شیعریی ئەدۆنیس بەر لە کەسایەتیی فیکریی لەدایك بووە، بەر لەوەش هەندێ فاکتەری وەکو: (یەکەمین ژینگە، پەروەردەی ماڵەوە لەسەر دەستی دایك و باوکی، پەیوەندییەکانی دەورەبەر و سروشتی شوێنی نیشتەجێبوون و.. هتد) کاریان لە پێکهاتەی سایکۆلۆجیی ئەم داهێنەرەماندا هەبووە. لێرەدا پێکهاتەی سایکۆلۆجیی ئەدۆنیس بەر لە پێکهاتەی شیعرییدا بووە و پێگەیشتنی فیکریشی لە دوای پێگەیشتنی شیعرییەوە بووە. کەواتە کەسایەتیی فیکریی ئەدۆنیس لەناو مناڵدانی کەسایەتیی شیعرییەوە هاتۆتە دەرێ نەك بە پێچەوانەوە.

ئێستا لەو فاکتەرانە دەدوێین کە ڕۆڵی بنچینەییان لە پێکهاتەی شیعری و فیکریی ئەدۆنیسدا هەبووە. نووسەری کتێبەکە وایدەبینێ لێرەدا ژمارەیەك فاکتەری سەرەکی لە ڕێچکەی ژیان و مەعریفیی ئەدۆنیسدا هەیە، بەڵام سێ فاکتەری گرنگ دەستنیشاندەکات کە بایەخێکی تایبەتییان بۆ لێکۆڵینەوەکەی ئەو هەیە، یەکەم: پەیوەندیکردنی بە بزوتنەوەی نەتەوەیی کۆمەڵایەتیی سووری، دووەم: لە تەمەنێکی زوودا کەلەپووری سوفی و شیعیی ناسیوەو تێکەڵیان بووە، سێیەم: لە نیوەی دووەمی پەنجاکاندا دیمەشقی جێهێشت و گواستیەوە بۆ بەیروت.

لەوانەیە زیادەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێین فاکتەری یەکەم — واتە پەیوەندیکردنی بە بزوتنەوەی نەتەوەیی کۆمەڵایەتی سووری — لە سەرووی فاکتەرەکانی ترەوە دێت کە ڕۆڵێکی گرنگی لە گەڵاڵەکردنی دید و تێڕوانینی ئەدۆنیس بۆ شتەکان هەبووە، بەتایبەتی ئەوکاتە ئەدۆنیس لە تافی لاویدا بووە و لە سەرەتای دەرککردنی شتەکاندا بووە.

فاکتەری یەکەم دیدی ئەدۆنیسی بۆ زۆر مەسەلە گۆڕی، لەوانە: تێڕوانینی بۆ ڕابردوو، ڕۆشنبیریی باو و تەقلیدیی نێو خەڵك، باوەڕهێنان بە بیرۆکەی گۆڕانکاری، نوێکردنەوە لە شیعردا، تازەگەری بە مانا بەرفراوانەکەی.

## جیاوازی و لێکبوردن

خاڵێکی تری گرنگ لە فاکتەری یەکەمدا ئەوەیە کە ئەدۆنیس لە ماوەی ژیانی حزبیدا، لەلایەن

نەیارانی ئەو حزبەوە، دوچاری چەوسانەوەی دەروونی بوو و بەهۆی بیروباوەڕی و ئینتیمای بۆ حزبی نەتەوەیی کۆمەڵایەتی سووری، ئازاری سایکۆلۆجی دەدرا، سەرباری ئەوە ئەدۆنیس سەر بە کەمایەتیی عەلەوی بوو کە بەهۆی ئەمەشەوە دوچاری دوورخستنەوە و پەراوێز خستن بوو لە نێو ژینگەیەکی سوننی کۆنەپارێز کە جیاوازی و لێبوردەیی ناناسێت. کەواتە سەیر نییە کە "جیاوازی" ببێت بە یەکێك لە تەوەرە هەرە گرنگەکانی بیری ئەدۆنیس و ئەزموونە شیعرییەکەی.

هەروەها مەسەلەی لێبوردەیی و لێکبوردن و پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی جیاوازییەکان و زەرورەتی هەبوونی جیاوازی، ئەمانە لەسەرجەم نووسین و شیعرەکانی ئەدۆنیسدا بایەخێکی گەورەیان پێدراوە کە لە دیدێکی قووڵی فەلسەفییەوە لەم کێشانە دواوە.

پەیوەندیی ئەدۆنیس بە (ئەنتوان سەعادە)ی دامەزرێنەری بزوتنەوەی نەتەوەیی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکی ساکار و تێپەڕ نەبوو، تا کاتی جیابوونەوەی لەو بزوتنەوەیە، کەسێکی ئەمەکداری بیروباوەڕەکانی ئەنتوان سەعادە بوو، بەڵام نەك بە ڕووکاری و بەبێ ئارگۆمێنت لەگەڵ کتێبەکانی سەعادەدا، بەڵکو بەردەوام بەدوای ئەو تێزانەدا دەڕۆیشت و پەرەی پێدەدان تا شتی زیاتر فێربێت. بە پێچەوانەی سادق جەلال عەزم کە بۆ ماوەیەکی کورت لەو بزوتنەوەیەدا مایەوە بێئەوەی هیچ چالاکییەکی هەبێت. بەڵام ئەدۆنیس لەماوەی دەساڵی مانەوەی لەو حزبەدا چەندین چالاکیی سیاسی و ئەدەبی و ڕۆژنامەوانیی هەبووە بە هاندانی ئەنتوان سەعادە، بۆیە لە سێدارەدانی ئەنتوان سەعادە ئازارێکی دەروونیی گەورەی بۆ ئەدۆنیس جێهێشت. وەنەبێ ئەدۆنیس لەگەڵ تەواوی بۆچوونەکانی سەعادەدا بووبێت، بەڵکو لە چەندین تەوەردا بە پێچەوانەی سەعادە بیری دەکردەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی بەرپرسی کاروباری ڕۆشنبیریی بزوتنەوەکە بوو، گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد، ئەنتوان سەعادە وایدەبینی کۆمەڵگە لە سەرووی تاکەکەسەوەیە و دەبێت تاکەکەس لە خزمەتی کۆمەڵدا بێت، بەڵام ئەدۆنیس بە پێچەوانەوە هەمیشە دەیووت تاکەکەس ئامانجی سەرەکییە و لە پێش کۆمەڵگەوەیە و نابێت تاکەکەس لە کۆمەڵدا بتوێتەوە، ئەم دیدە دەگەڕێتەوە بۆ گیانی هونەرمەندێتی لە ئەدۆنیسدا کە شەیدای تاکگەرایی و خودگەراییەو داهێنانیش پرۆسەیەکی خودیی تایبەتییە بە تاکەکەسەوە.

## ئەدۆنیس و سۆفیزم

ئەدۆنیس هەر لە تەمەنێکی زووەوە ئاشنای بیری سۆفیزم بوو، بەر لە قۆناغی زانکۆ هەندێ لە کتێبەکانی کەلەپووری سۆفیزمی خوێندبووەوە، لە زانکۆشدا پەیوەندیی بە سۆفیزمەوە قووڵتر بووەوە و بەرهەمی ئەو پەیوەندییەیش بریتی بوو لە تێزی ماستەر نامەکەی لە زانکۆی دیمەشق بەناوی (الهو —هو عند المكزون السنجاري)، لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەمیشدا کتێبە گرنگەکەی چاپ کرد بە ناوی "سۆفیزم و سوریالیزم" کە لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی و فەلسەفیی قووڵە لە بارەی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانی نێوان سۆفیزم و سوریالیزم.

کاریگەریی سۆفیزم لەسەر ئەدۆنیس کاریگەرییەکی قووڵە، شیعرەکانی تێراوکردووە بەهێمای سۆفییانە، چونکە پێیوایە لێکچوونێکی گەورە لە نێوان ئەزموونی شیعری و ئەزموونی

سۆفیزمدا هەیە، بەلاّم لێرەدا دەبێ ئەوە بزانین کە هێمای سۆفییانە لە شیعرەکانی ئەدۆنیسدا بارگاوی نییە بە ئایین، بەڵکو ئەو هێمایانە لە مانا ئایینیەکانی بەتاڵکراونەتەوە. بەلاّم ئەگەر مانای ئایینی لە سۆفیزم داماڵین، چیی تیا دەمێنێ؟

بۆ ئەوەی بزانین وەلاّمی ئەدۆنیس بۆ ئەم پرسیارە چییە، با لە سەرەتادا لەو لایەنانەی سۆفیزم بدوێین کە کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر ئەدۆنیس هەبووە، لایەنی یەکەم پەیوەندیی بە بیرۆکەی وەسف نەکردنەوە هەیە، واتە *Ineffability* (اللاموصوفیە)، واتە ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت "ناکۆتایی" شتێکە قابیلی وەسفکردن نییە لە ڕووی ڕەنسیپەوە (لێرەدا ناکۆتایی بریتییە لە خودا لە بیری سوفیدا). لە باشترین حاڵەتدا دەتوانین بڵێین ناکۆتایی بریتییە لەوەی کە نە ئەم شتەیە نە ئەویدی، جیهانی ئەو ناکۆتاییە جیهانی نهێنییەکانە کە هەمیشە بە نهێنی دەمێنێتەوە، لەبەرئەوە مومکین نییە ڕاستییەکانی ئەو جیهانە نهێنییە بسەلمێنرێت، بەڵکو تەنها دەشێت بە ئیحا و هێما ئاماژەی بۆ بکرێت.

ئەم بیرۆکە سۆفیزمە لەسەر دەستی ئەدۆنیسدا بوو بە بیرۆکەیەك پابەندی جیهانی شاعیرە، واتە ئەو جیهانەی شاعیر هەوڵدەدات بیسمێ و بچێتە ناوی و کەشفی بکات و لە میانی ئەزموونە شیعرییەکەیەوە بیناسێت. واتە لێرەدا جیهانی شاعیر لە جیهانی سۆفیزم دەچێت، جیهانی نهێنییەکان و ناکۆتایی و بێسنوور کە لە ڕێگەی هەست و ئەقڵەوە دەستی لێنادرێت، جیهانێکە ئەقڵی ئاسایی نایناسێت و پڕە لە شیعر و سیحر.

کەواتە بیرۆکەی نامەوسوفیەت لە مانا ئاینییەکەی بەتاڵکراوەتەوەو لە زەینی ئەدۆنیسدا تەنها پابەندە بەلایەنی نادیاری بوون کە بە مانا هایدگەرییەکەی لە (کەینونە) دەچێت.

بە کورتی سۆفیزم لە تێگەیشتنی ئەدۆنیسدا بریتییە لە زیندەگی و بزاوت "دینامیك" نەك جێگیر و بێجوڵە "ستاتیك". هەڵوێستی ئەدۆنیس لە سۆفیزم – پاش بەتاڵکردنەوەی لە مەدلولە ئاینییەکەی – هەڵوێستێکە ناوی دەنێت "سۆفیزمی هونەر" کە ئەو هەڵوێستە لەم خالاّنەی خوارەوەدا کورت دەبێتەوە:

یەکەم: ئەم هەڵوێستە داوای جیابوونەوە لە واقیع ناکات، بەڵکو داوای جیابوونەوە لە دیاردەی ڕاستەوخۆیی دەکات بۆ ئەوەی بگاتە قوولاّیی واقیع تا لە دیارەوە بۆ نادیار بڕوات.

دووەم: جەخت لە "ئەزموونی زیندوو" دەکات نەك "تەجریدی تیۆری"، لێرەدا ڕوانینی هونەری ملکەچی پێوەرەکانی ئەقڵ نابێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم دیدە هونەرییە ئەقڵ دەکات بە ملکەچی پێوەرەکانی خۆی.

سێیەم: ئەم هەڵوێستە ژیان ڕەتناکاتەوە بە سیفەتی ئەوەی ژیان بریتییە لە ژیانی لە نێو چوو لە دیدی سۆفیستە ئاینخوازەکان، بەڵکو ئەو لایەنانەی ژیان ڕەتدەکاتەوە کە "ژیانی ڕاستەقینە دەشارێتەوە".

چوارەم: لەم هەڵوێستەدا سۆفیزم جێنشین و بێجوڵە نییە بەڵکو گەشتێکی بەردەوامە بە نێو شتەکاندا بەرەو نێوجەرگەی جیهان، بەو جۆرە تەماشای دنیا دەکات کە جولاّنەوەیەکە تەواو نابێت، داهێنانیش ڕۆیشتنێکی بەردەوامە بەرەو پێشەوە و هەرگیز تەواو نابێت.

پێنجەم: ئەمە سۆفیزمێکی پێکهاتەییە بە مانا دیالێکتیکییەکەی، هاوگونجانێك لە نێوان لایەنە

دژەکان دروست دەکات بە جۆرێك وایدەبینێ هەر دژێك تەواوکەری دژەکەی تریەتی.

شەشەم: مانای قووڵی ئینسان لەو شوێنەدا پەنهانە کە بەردەوام سەیری ناکۆتایی دەکات، خاسیەتی هونەریش بریتییە لە چۆنێتی گوزارشتکردن لەو بێکۆتاییە.

حەوتەم: شتی باوو گشتی جێدەهێڵێت بەرەو جیهانی نادیار، سروشتی تێڕوانینی هونەریی ئەم هەڵوێستە لەوەدایە کە هەمیشە هەوڵدەدات منداڵێتی جیهان کەشف بکات.

هەشتەم: ئەمە سۆفیزمێکی دینامیك و پڕ لە جوڵە و گۆڕانە و هەمیشە کار بۆ ئەوە دەکات جیهان لە وێنەیەکی تازەو جیاوازدا پێشکەش بکات و لە میانی ئەزموونێکی تازەو جیاوازدا بیخاتە ڕوو.

نۆیەم: دژی هەموو سیستمێکی داخراوە، جا ئەو سیستمە فەلسەفی بێت یان ئاییني یان ئەخلاقی یاخود سیاسی، ئەمە کرانەوەو جووڵانەوەیە.

دەیەم: بەو شێوەیە سەیری داهێنان دەکات کە بریتییە لە پڕکردنەوەو لێڕژان و شەتەح، لە دەرەوەی هەموو سانسۆرێکی ئەقڵی.

## لە نێوان دیمەشق و بەیروت

فاکتەرێکی تر کە بایەخێکی گرنگی لە پێگەیاندنی رەوتی شیعریی و فیکریی ئەدۆنیسدا هەبووە، کۆچکردنی بووە لە دیمەشقەوە بۆ بەیروت، ئەوسا تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو. گواستنەوە بۆ بەیروت خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو لە ژیانیدا چونکە لەوێدا هەلومەرجێکی تری هاتە پێش و کۆمەڵێ دەرفەتی نوێی لە بەردەمدا کرایەوە، کەشوهەوای رۆشنبیریی بەیروت لە هەموو ئاستەکاندا یارمەتیدەرێکی باشی پەرەسەندنی شیعریی و فیکریی ئەدۆنیس بوو، لەوێدا ئەزموونی شیعریی دەوڵەمەندتر کرد و چەند رەهەندێکی تری ناسی کە پێشتر بە ئەندازەیەکی کەمتر دەیناسین، بەتایبەتی رەهەندی فەلسەفی و رەنگدانەوەی لە شیعرەکانیدا.

یەکێك لە دەرەنجامە گرنگەکانی ئەو گواستنەوەیە بۆ بەیروت، تیۆریزەکردنی شیعر بوو، لەوێدا ئەدۆنیس لەتەك داهێنانی شیعری تازەگەریدا بوو بە تیۆریستی شیعری نوێیش، چونکە شوێنگەیەکی بڵندی لە بزووتنەوەی شیعری نوێدا گرتبوو بە تایبەتی ئەو کاتەی لەگەڵ یوسف ئەلخالدا گۆڤاری (شیعر)یان دەردەکرد، ئەوسا ئەدۆنیس بەردەوام بیری لەماناکانی مۆدێرنە و مۆدێرنیزم لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا دەکردەوە نەك تەنها لە شیعر و ئەدەبدا.

چۆن نوێکردنەوە و نوێکاری دیاریی بکەین؟ ئەدۆنیس لە زۆر شوێندا بە قووڵی بەدوای ئەو پرسیارەدا دەچێت، بەتایبەتی لە کتێبە گرنگەکەی "ستاتیك و دینامیك" کە تێزی دکتۆراکەیەتی و، بە درێژایی ئەو کتێبە لە هۆکارە مێژووییەکانی بزاوتی نوێکردنەوە دەدوێت، ئەو پێی وایە خوڵقاندنی سیستمێکی نوێ لە بیرکردنەوە و گوزارشتکردن مەرجێکی هەرە پێویستی پرۆسەی نوێکردنەوەیە، کاتێك دەڵێین شاعیرێك ڕێگەکانی گوزارشتکردن و دەربڕینی گۆڕیوە، واتە لە بنەڕەتدا ڕێگەی بیرکردنەوەی گۆڕیوەو تێڕوانینی بۆ شتەکان تێڕوانینێکی تازەیە و دیدو جیهانبینییەکی نوێ و جیاوازی لە لا گەڵاڵە بووە.

لە بەیروتدا ئەدۆنیس بەشێوەیەکی قووڵتر دەستی کرد بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی مێژووی کولتووری عەرەبی و شیعری جیهانی و هەروەها وەرگێڕانی شیعری هەندێ لە شاعیرە ناودار و داهێنەرەکانی جیهان وەك شیعرەکانی سان جۆن

پێرس، لەو ساتەدا ئەدۆنیس لە ململانێیەکی توندا دەژیا لەگەڵ لایەنگرانی شیعری کۆن و سەلەفییەکان، ئیدی لە چەندین نووسین و لێکۆڵینەوەدا دەستی کرد بە داکۆکیکردن لە تازەگەری و تیۆریزەکردنی شیعری نوێ.

یەکەم دەرکەوتەی فەلسەفی لە شیعرەکانی ئەدۆنیسدا، لە گەڕانیدا بوو بە دوای ماناکانی شیعر، ئەمەیش کارەکانی ئەوی بارگاوی کرد بە ئاگاییەکی تیۆرییانەی شیعری بە جۆرێك شیعر بوو بە چەشنێك لە میتاشیعر، لەم دۆخەشدا شیعر و میتاشیعر دوو ڕووی دراوێکن، واتە کاری شیعریی بریتییە لە تەماهیی نێوان شیعر و فەلسەفەکەیدا، بەو پێیەی داهێنانی شیعری لەگەڵ خۆیدا فەلسەفەی خۆیشی هەڵگرتووە، ئەمە هەمان ئەو تێڕوانینەیە کە هایدگەر لە بەرامبەر هۆڵدەرلیندا هەیەتی و لە وتاری "هۆڵدەرلین و ماهییەتی شیعر"دا بەدوای دید و مانا فەلسەفییەکانی شیعری هۆڵدەرلیندا دەگەڕێت.

دانەری کتێبەکە د. عادل ضاهر وایدەبینێ کە هەوڵەکانی بۆ خوێندنەوەیەکی فەلسەفییانەی شیعرەکانی ئەدۆنیس، لەلای ژمارەیەك لەو کەسانەی لە فەلسەفەدا کاردەکەن، هەوڵێکی ناسەرکەوتووە، هەروەك چۆن هایدگەریش لە خوێندنەوەی شیعرەکانی هۆڵدەرلیندا دوچاری هەمان کێشە بووەوە، ئەمەیش لەو تێڕوانینەوە هاتووە کە ناشێت فیکر و فەلسەفە لە شیعردا هەبێت، واتە ڕەخنەی ئەو جۆرە کەسانەی لە بواری فەلسەفەدا کاردەکەن، ڕەخنەیەکە داوا دەکات سنوورێکی جیاکەرەوە لە نێوان شیعرییەتی شیعر لە سەرێك و فیکر لە سەرێکی تر دابنرێت، واتە جیاکردنەوەی ئەحکامە ئیستاتیکییەکان و ئەحکامە ئەقڵییەکان، ئەم دید و تێڕوانینە لەلای هایدگەر ئاوەژوو دەبێتەوەو ئەم دێت شیعر و فیکر، یاخود ئیستاتیکا و ئەقڵ لە یەکتر نزیك دەکاتەوە و ڕەهەندێکی فەلسەفی و فیکری لە شیعردا دیاری دەکات، ئەو کاتیگۆرییە ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێت فەلسەفە پابەندە بە ئەقڵ و حەقیقەتەوە، شیعریش پابەندی وەهم و هەڵچوونە. هەوڵەکانی ئەدۆنیسیش لە بواری نووسینی شیعری و تیۆریزەکردنی شیعریدا دەچێتەوە سەر هەمان ڕەوت، لێرەدا مومکین نییە کاری شیعری تایبەتمەندیی شیعریی خۆی بپارێزێت ئەگەر فەلسەفە بەراستەوخۆیی و وتراوی لە شیعرەکەدا هەبێت نەك بەشێوەیەکی ئیحائی. کەواتە بیری فەلسەفی و ئیشراقاتی فیکری لە شیعری داهێنەرانی وەکو ئەدۆنیس و هۆڵدەرلیندا بەشێوەیەکی ئیحایی و تیشکهاوێژ دەردەپەڕێت.

# ئەدۆنیس وەك نیگارکێش

## هونەری شێوەگەری لە شیعری عەرەبی ئێستامان زۆر دەوڵەمەندترە

**لە عەرەبییەوە: قادر میرخان**



لە هەفپەیڤینێکی گۆڤاری "هونەرە جوانەکانی فەرەنسا" ئەلیوزار ئەدۆنیس باسی لە تابلۆ شێوەگەری و سەرقاڵیە هونەرییەکانی دەکات کە بە (رەکیمە) لە بریتی (کۆلاژ) ناوزەدی کردووە.. هەروەها ڕوانینی بۆ ڕەوتی شێوەگەری هاوچەرخ و پەیوەندی شیعر بە نیگارەوە لەسەر ئاستی هۆشمەندی و دەلالەت.. گرنگترین ئەوانەی لە هەفپەیڤینەکەدا هاتووە:

***گۆڤار: چۆن بایەخت بە نیگارکێشان دا؟**

**-ئەدۆنیس: لە ڕاستیدا گرنگیدانم بە نیگارکێشان دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییەکانم لەگەڵ هونەرمەنداندا. بەدرێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو زۆر لە نیگارکێشە عەرەبەکانم ناسی. کە زۆربەیان بۆ ڕازاندنەوەی قەسیدەکانم بە نیگارەکانیان پەیوەندییان پێوە دەکردم، لە پێشەوەی ئەوانە هونەرمەند شەفیق عەبود، پاشان محەمەد عومەر خالید، و مەروان، و زیاد دەلول و سەلیم عەبدوڵڵا و گەلێك هونەرمەند لە عێراق و چەند نیگارکێشی دی.. و بە پێچەوانەی ئەوەی هەیە، هونەری شێوەگەری عەرەبی زۆر بە بڕشتە دەشێ دەوڵەمەندتر بێت لە شیعری ئێستای عەرەبی.**

***گۆڤار: چی فێر بوویت لە ڕێی پەیوەندیتەوە بەو هونەرمەندانەوە؟**

–ئەدۆنیس: لە نزیکەوە بە بەرهەمەکانیان ئاشنابووم و هەمان کات بەرهەمە شیعرییەکانی خۆمم باشتر ناسی، بەتایبەت هاوڕێیەتیان وایلێکردم بونیادی فۆرمی شیعر باشتر تێبگەم و پەیوەندی ئەو بونیادە لەگەڵ ئەو شوێنەی کە قەسیدەکەی لەسەرە. واتە کاغەزەکە..

***گۆڤار: بەڵام بۆ هونەری (کۆلاژ) ئەنجام دەدەیت؟**

–ئەدۆنیس: لە ڕاستیدا کاتێك ئاماژە بە کارە هونەرییەکانم دەکەم دەستەواژەی (کۆلاژ) بەکارناهێنم. بەڵکە بە باشتری دەزانم دەستەواژەیەکی عەرەبی بەکار بهێنم ئەویش (ڕەکیمە)یە. کە وردکردنەوەی وشەی (ركام)ە. کە ئاماژەیە بۆ لاپەڕەیەك لەیەك کاتدا نووسین و وێنە لەخۆ بگرێت. دەستەواژەی (کولاژ) هەستێکی گەورەمان دەداتێ بۆ ئەو کارە هونەرییەی ئەنجام دراوە لە کاتێکدا وشەی (ڕەکیمە) پەیوەست و پابەندترە بە شێوەو جۆری ئەم کارە داهێنەرانەیە.

***گۆڤار: ئایا ئەم وشەیە ئاماژەیە بە جۆرە ئەدەبێك یان وشەیەکی تایەتە بەشێوەیەکی باوی کەلچەری عەرەبییەوە؟**

–ئەدۆنیس: نەخێر، ئەم وشەیە لە هەمان کاتدا بە مانای: ڕەنگ، و شێوە، و نووسین دێت. هەڵگری خۆکردییەکە لە ناخیدا کە ئاماژە بە یەکگەیشتنی ئەو سێ توخمە دەکات.

***گۆڤاری: بەڵام شاعیرەکان چ پێویستیەکیان بە دۆزینەوەی ئەو شوێنە نەبینراوە هەیە؟**

–ئەدۆنیس: هەموو کارە شیعرییەکانم لەسەر ئەو باوەڕە پتەوە بە هونەر ستاریان گرتووە. شیعر دەربڕین نیە لە بوون یان لە مرۆڤ بەڵکە تەواوکەرییەتی. دەربڕین لە هەر شتێك کامڵ نابێت بەڵکە دەربڕینی بەشێکی دەبێت. من تەعبیر لە خۆم ناکەم بەڵکە لە خواست و نیاز و ئەوەی مەبەستمە. کەواتە، دەتوانین بڵێین هونەر و شیعر درێژبوونەوەی بوون و ژیانن و هەوڵ نادەم لە ڕێییانەوە جارێکی دی واقیع بەرهەم بهێنمەوە و تەنانەت هەڵگرتنەوەی ماناکەشی، بەڵکە هەوڵ دەدەم شتێکی دی کە هەنگاو دەنێ و دەڕژێ و بەردەوام پەرش دەبێتەوە.

***گۆڤار: مەبەستت وتە دێرینەکەتە کە دەڵێیت: (من لە ئایندەوە هاتووم)؟.**

–ئەدۆنیس: بەشێوەی گشتی بەڵێ، نووسینی قەسیدە و نیگارکێشانی (ڕەکیمە) کرانەوەیە، لە ڕاستیدا ئاسۆیەکی نوێ دەتوانێت هاندەر بێت بۆ دروستبوونی پەیوەندی نوێی نێوان وشە و شتەکان. وەك ئەوەی تۆ پشتگیر و بەهێزکەری بوون بیت تاکو لەگەڵت بجووڵێت. بێگومان لێرەدا مەسەلەی بینراو و نەبینراو پەنهانە. لای من ئەم دووانە زۆر بە توندی و قووڵی پێکەوە بەستراون. ناتوانین لە یەکەم – بینراو – بگەین گەر ڕەهەندە شاردراوەکانی نەکەینەوە. تاکو بینراو ببینین دەبێ لە نەبینراو بڕوانین. ئەمەیە ئەو مەرجەی لە ڕێیەوە ئاسۆی نوێی بوونەوەر دەکرێتەوە کە لە هەمان کاتدا لە ڕێیەوە لە خود بێنە دەرێ و درێژی بکەینەوە. ڕەنگە ئەمەبێت کە هەوڵی بۆ ئەدەم کاتێك پەنا بۆ (ڕەکیمە) دەبەم: واتە بتوانم لە نەبینراو بڕوانم.

***گۆڤار: تێبینی دەکەین نووسین لە (ڕەکیمە)دا شوێنێکی بنچینەیی دەگرێت و دەشێ یەکەم ئاسۆشی هەبێت.. ئایا وشەکان لە (ڕەکیمە)دا شیعر پێك دێنن؟**

–ئەدۆنیس: هەندێك جار شیعری شاعیرانی دین و هەندێ جاریش وشەی سانای تیا دەبینین، یان هەڵبژاردەی رستەن. بەڵام شێوەی هێڵەکانی جێی مەبەستمە. لە کەلچەری عەرەبیدا نووسین (خط)

تەنها نووسینی ساکار نییە. بەڵکە مانای داهێنانی شێوەگەرییە و هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە لەوە گەیشتووم، جوان نووسین ئاماژە بە جوانی — لە مانای دەستەواژەکە بڵندتر —ی خودی خۆشنووسەکە. نووسین خۆی هونەرێکی ئەبستراکتە: ئەو دەربڕی شتەکان نییە کە وشەکان دروستی دەکەن بەڵکە هێزی شتەکان و نەبینراوەکانە، واتە روحی ئەوە. کەواتە بەشێوەیەکی سروشتی درێژبوونەوەی کارەکەم وەك شاعیرێك لە نووسیندا دۆزییەوە. لە ڕێی ئەم و ئەوەوە دەتوانم دەربڕی توانا ناوەکیە خوازراوەکانیان بم، کەواتە دەتوانم دەربڕی هێزی ناوەکییان بم.

***گۆڤار: بەڵێ: بەڵام لە تابلۆکانتدا کە پێت باشە بە (رەکیمە) ناوزەدیان بکەیت دەبینین نووسینەکانت هەڵگری (جوانی)نین؟ لەسەر ئاستی نیگارکێشان ئەنجامێك نابینین، بەڵکە دووبارە گەڕانەوەو وەبیرهێنانەوە هەیە. تۆ لە خولیای چیدایت؟**

—ئەدۆنیس: سانایی. من وشەکان دەنووسم، پاشان زۆر جار دەست بە هەڵوەشاندنیان دەکەم. بۆ ئەوەی لێکدانەوەیەکی زۆر بەرایی پیتەکان بکەم کە وشەکانیان دروستکردووە هەتا دوای ئەوە وای لێ دێت ئەو وشانە توانای خوێندنەوەیان نامێنێت.

***گۆڤار: لەبەر نائامادەیی جۆرەکی و واتاکانیان، کەرەستەی دی هەڵدەبژێریت بیانخەیتە پێکهاتە (رەکیمە)کانتەوە؟**

—ئەدۆنیس: لە ڕاستیدا من کاتێك ڕێدەکەم ئەو کەرەستانە هەڵدەگرمەوە. هەندێك جار جانتایەکی بچوك لەگەڵ خۆم هەڵدەگرم تاکو ئەو وردە واڵانە.. لە پارچە تەنەکەی تەنك و پارچەی کاغەزی جوان و تەڵەزم و پارچەی تەختە. بەڵام خەڵکی بەسەرسامییەوە سەیرم دەکەن وەك بڵێی تووشی جۆرێك شێتی بووبم. لەگەڵ ئەوەشدا سلاوێان لێدەکەم، ئەمەش زیاتر سەرسامیان دەکات. لەسەر کۆکردنەوەی ئەو کەلوپەلانە بەردەوام دەبم، ئەو کاری کۆکردنەوەو هەڵگرتنەوەیە زۆر چێژبەخشە.

***گۆڤار: نووسینی هەڵوەشاوو تێکشکێنراو، کەرەستەی بێ کەڵکی بێ مانا.. ئایا ئەو پارچە کۆلاژانەی لە تابلۆکانتدا بەکاریان دێنیت لە فەراهەمکردنی جوانیەکی شێوە پاشماوە بەشداری دەکەن؟**

—ئەدۆنیس: بەڵێ، بەو شێوەیە، لە ڕاستیدا (رەکیمە) لەو شتانە پێکدێت کە خۆیان هیچ نین و بێ ماناو پێنەگەیشتوون. بەڵام لە ڕێی ئەم پارچانەوە دەکرێت شێوەیەك پێکبهێنرێت واتایەکی دەوڵەمەند لە خۆبگرێت، لە پێناو نووسینی قەسیدەیەکی نوێدا بەردەوام دەبێ وشەکان لە ناوەڕۆکە کۆنەکانیان بەتاڵ بکەمەوە تاکو پەیوەندی و پەیوەست بوون لە نێوان وشەو شتەکاندا ئامادەبێت، بەوپێیە دەتوانین مانای نوێ بەرهەم بهێنین. بەڵام ئەنجامدانی (رەکیمە) بە پێچەوانەی ئەم رەوتانەوە دەبێت: ئەو توخمانەی (رەکیمە) پێك دەهێنن لە بناغەدا لەمانا بەتاڵە. بەڵام هەر کە دەستم بە کارکردن کرد، دەبینم خەریکە شتێك دروستدەبێت بەهۆی بەکارهێنانی ئەو پارچە تێکشکاوانەوە، هەتا پیت و وشەکانیش بۆ خەسڵەتەکانیان دەگەڕێنەوە، بەدەگمەن دەپشکنرێن. نووسین لەناو (رەکیمە)دا لە گواستنەوەو پڕکردنەوەی مێژوویی و ڕەگ و ڕابوردووی شاردراوەی کە کەلچەری عەرەبی باسی لێوە ناکات بەتاڵکراوەتەوە.

***گۆڤار: بەڵام چۆن (رەکیمە) لەدایك دەبێت؟**

—ئەدۆنیس: ڕێباز و شێوازێکی دیاریکراو نیە بۆ ئەمە. من هەوڵدەدەم یاری بکەم و پێکهاتەی

شێوەکان بونیادبنێم لە دووی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان کەرەستەکان دەگەڕێم کە هیچ پەیوەستیەك لە نێوانیاندا نیە. بێ ئەوەی بزانم لەم کارەدا بەرەو کوێ هەنگاو دەنێم، تا ئەوساتەی پێموایە گەیشتوومەتە ئەنجام و هاوسەنگی بوون ئەوسا دەست لە کار هەڵدەگرم. بەو پێیە ئەو رەهەندە تایبەتەی یاریکردن شتێکی گەوهەرییە. ئەمەش لە قەسیدەی شیعریدا دەبینیەوە چونکە هەرگیز ناتوانین دەست بە نووسینی قەسیدەیەکی شیعری بکەین هەتا نەختێك یاری نەکەین، بەڵام لە خۆیدا یاریکردن لەگەڵ وشەکاندا هەڵگری مەترسی بونیادی پیشەسازی خالیسەیە کە وشەکان وزەو زیندوێتیان لە دەست دەدەن و دەبنە بەرد یان چەو. بەڵام کاتێك مامەڵەی دەستی لەگەڵ کەرەستەکان دەکەین و کۆیاندەکەینەوە، دەشێ شێوەیەکی نوێدا بهێنین. بەڵام موعالەجەکردنی لەگەڵ وشەکاندا کارێکی تەواو جیاوازە و ئەستەمە هەمان کات زۆر دەگمەنە!

***گۆڤار: تۆ پێشبینی یان هیچ ژیریەکت بۆ شێوە هەیە کە (رەکیمە)ی نوێ لە خۆی دەگرێت؟**

-ئەدۆنیس: نەخێر، هەرگیز من بە بیرۆکەیەکی لەوەو پێشەوە دەستبەکارناکەم، لەلایەکی دیپەوە پێم وایە کاتێك دەست بەکار دەکەم گەر بیرۆکەیەکی لەوەوپێشم هەبێت، ناتوانم بگەمە هیچ ئەمڕۆ لە جیهانێکدا کە تیایدا هەموو حسابی حسابەکانی خۆیان و پێوانەی پێوانەکانیان دەکەن و لەوەوبەر شتەکانیان دیاریدەکەن جگە لە ئازادی هیچمان نەماوە.. لەلای من پێناسەکردنی توانای داهێنەران قورسە و ناچێتە ژێر باری هیچ پێوانە بۆ کردنێکەوە: من بە توندی بەرهەڵستی ئەو ئەدەبەی ئێستا دەکەم کە هەڵگری مەرج و پێوانەکانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنە بەشێوەیەك لە بەرامبەریا دەچەمێتەوەو کڕنووش بۆ داخوازییەکانیان دەبات، بۆ ئەوەی پاش ئەوە ببێتە کەرەستەی پەسەندی پووچ. ئەستەمە قەسیدە یان کارێکی ئەدەبی بکەیتە شتێکی بەسوود! بێ سوودی سامانی ئێمەیە.

***گۆڤار: چ هزرێك لە (رەکیمە) کانتدا هەیە کە لە شیعرەکانتدا نایدۆزینەوە؟**

-ئەدۆنیس: رەنگە شێوەی ئازادی ڕەها. ئەوەی دەیزانم کە شیعرەکانم لە خۆیان نەگرتووە بەهۆی چاودێرییەوەیە. من لێرەدا باس لە چاودێری سیاسی یان ئایدۆلۆژی ناکەم، بەڵکە لەبارەی چاودێرییەکی ئۆرگانیکی رێکوپێکی تایبەت بە کەلچەری عەرەبەو.. تەماشا بکەن چۆن لە کەلچەری شیعری ئەمڕۆماندا هەژموونی ئیلهامی ئایینی و نیشتمانی و سیاسی رەنگی داوەتەوە. ئەوە وەك شیعر هیچ بەهایەکی نییە.. شیعر سەرچڵییەکی رۆحی گشتی ڕەهایە و سەرچڵییەکی هزری ئازادە دەبینین لە جیهانی عەرەبیدا وندەبێت و پەنهان دەبێ. لەبەرئەوە (رەکیمە)کان فەزایەك لە هەڵسوکەوتی چاودێر دەرباز بوون بۆ کردوومەتەوەو هەر جۆرێك لە جۆرەکانی چاودێر رەتدەکاتەوەو ئەمەی دوایی ناتوانێت هیچ کاریگەرییەکی لەسەر (رەکیمە)کان هەبێت.

## سەرچاوە:


رۆژنامەی (الاتحاد) ژمارە 977 سێشەممە 2005/4/5.

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە بۆ عەرەبی: بەتول حسێن ئەلئەغا لە گۆڤاری (*Beaux arts*)ەوە.

# ئەدۆنیس و نوێکردنەوەی ئەقڵی عەرەبی

## "گفتوگۆ – توێژینەوە"

**لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد**



ئەم بابەتە لە شێوەی گفتوگۆدا ئامادەکراوەو لە چاپی هەشتەمی کتێبی ستاتیک و دینامیک (الپابت و المتحول)دا بڵاوکراوەتەوە[1]، ئەدۆنیس دەبوو موحازەرەیەك پێشکەش بکات بەڵام خۆی وای پێ باش بووە گوێگرانیش بەشداریی بکەن و لە شێوەی پرسیار و وەڵامدا بابەتی نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی بخەنەڕوو، بەمجۆرە ئەم بابەتە لە شێوەی (توێژینەوە – گفتوگۆ)دا ئەنجام دراوە بەو پێیەی ئەمە جۆرێکی دیکەیە لە گفتوگۆ هەروەکو لە هەمان کاتدا چەشنێکی دیکەیە لە توێژینەوە.

**ئەسەد غەندور: بەخێربێن بۆ سیمیناری "دیموکراتیخوازە عەلمانییەکان". ئێمە پێشتر لێرەدا لەگەڵ دکتۆر محەمەد ئارکۆن لە بارەی "نوێکردنەوەی فیکری ئیسلامی" گفتوگۆمان کردووەو پاشان لەگەڵ مامۆستا ئەلیاس مەرقوس لە بارەی "نوێکردنەوەی فیکری نەتەوەیی" دیدارێکمان سازداوە، ئەمڕۆش گفتوگۆ و وتووێژێك لەگەڵ دکتۆر ئەدۆنیس (عەلی ئەحمەد سەعید) ساز دەکەین لە بارەی "مەسەلەی نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی"، وابزانم ئەم سیمینارە لە رێگەی پرسیارەکانی ئێوەوە ئەنجامدەدرێ کە ئەدۆنیس وەڵامیان دەداتەوە و ئیدی گفتوگۆیەکە فراوان**

دەبێتەوەو هەر کەسێك دەتوانێت بەشداری بکات، دکتۆر ئەدۆنیس ئەم ڕێگەیەی پێ باشترە بۆ پێشکەشکردنی بابەتەکەی.

**ئەدۆنیس:** من بەم دیدەنییە زۆر خۆشحاڵم. بەڕای من پێویستە جۆری موحازەرەکان بگۆڕدرێ بە چەشنێك ئەو کەسەی بابەتی موحازەرەکە پێشکەش دەکات خۆیشی ببێت بە گوێگر و ڕێگە بدات ئەوانیدیش قسە و پرسیار بکەن، ئەمەش وا لە توێژینەوەکە دەکات بەشداریی هەمووانی تیادابێت، کەواتە، من هاتووم تا گوێ لە ئێوەش بگرم و وتووێژ بکەین.

**غەسان ئیستیفان:** بابەتی "نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی" بابەتێکی زۆر فراوانە، لە خستنە ڕووی بابەتێکی لەم چەشنەدا دەیان بیری جۆراوجۆر بەزەیندا تێدەپەڕێ. من لە ڕاستیدا کۆمەڵێ پرسیارم هەیە، بەڵام ئێستا تەنها ئەم پرسیارە دەخەمە ڕوو:

لە زۆربەی کتێب و گۆڤارە عەرەبییەکاندا. لەوانە گۆڤاری (مواقف)یش[2]، دەستەواژەی "تایبەتمەندیی عەرەبی" یان "تایبەتمەندیی ئیسلامی" یان "تایبەتمەندیی عەرەبی – ئیسلامی" یان "تایبەتمەندی خۆرهەڵاتی" بەکاردەهێنرێت. ئەم دەستەواژەیە لەلای ئەدۆنیس چیدەگەیەنێت؟ شوێنگەی ئەم دەستەواژەیە لە تێگەیشتنی ئەدۆنیس بۆ تازەکردنەوەی عەقڵی عەرەبی چییە؟ ئەم دەستەواژەیە و ناوەڕۆکە جۆراوجۆرەکانی، چۆن ئیشکالییەتی تازەگەری (مۆدێرنیزم) بە مانا خۆرئاواییەکەی (یان بە مانای بەخۆرئاواییکراوەکەی) شیدەکاتەوە، هەروەها پەیوەندی ئەم ئیشکالییەتە بە ئیشکالییەتی "تەقلیدییەتی ئیسلامی" یان "تەقلیدییەتی عەرەبی – ئیسلامی" یان "تەقلیدییەتی خۆرهەڵاتی"؟ بە بۆچوونی من ئەم دوو ئیشکالییەتە ماوەیەکی ئێجگار زۆرە قسەوباس یاخود گفتوگۆیەکی جەدەلی پێکدەهێنن و ئەمەش زۆر جار یەکێ بووە لە هۆیە بنچینەییەکانی زاڵ بوونی لاساییکردنەوە (یان ستاتیک) بەسەر تازەگەریدا (یان دینامیک).

**ئەدۆنیس:** ئەم پرسیارە لە هەلومەرجی ئەمڕۆماندا و لە ڕووی کولتوورییەوە بایەخ و گرنگیەکی گەورەی هەیە و باوەڕیشم وایە هەمیشە بەکراوەیی دەمێنێتەوە بۆ وتووێژکردن. زەحمەتیشە وەڵامی ئەم جۆرە گرفتانە بدرێتەوە. بەڵام، من هەندێ بۆچوون و گۆشە نیگام هەیە، هەوڵدەدەم لێرەدا بیانخەمە ڕوو، باوەڕم وایە ئێمە ئەمڕۆ لە قۆناغی گواستنەوەدا دەژین بەڵام بەجۆرێك لە تەم داپۆشراوە، دەبینین مادەی مەعریفە و کەرەستەکانی مەعریفەش پەرتدەبن. من وایدەبینم بەرهەمهێنانی مەعریفی لە سەرەتاکانی چەرخی ڕێنیسانسەوە تا ئەمڕۆ بەرهەمهێنانێکی ئایدیۆلۆژی بووە، لەبەرئەوەی ئەم بەرهەمە پتر خەریکی شاردنەوەی واقیع و ڕاستییەکان بووە وەك لەوەی کەشفیان بکات. لێرەوە، دەبێ قۆناغی داهاتوومان هەر لە ئێستاوە، بریتی بێت لە: قۆناغی نا ئایدیۆلۆژیی مەعریفە، واتە دوورخستنەوە و بگرە سڕینەوەی ئایدیۆلۆژیا لە مەعریفە، واتە دەبێ لە میرات و کەلەپووری عەرەبییەوە و هەروەها لە ئێستای عەرەبییەوە گۆڕەپانێك یان بوارێك بۆ مەعریفەی بابەتی بگرین. لەم ئاستەشدا باوەڕم وایە دەبێ هەموو ئەو شتانە جێبهێڵین کە بە زۆر سەپاندوومانە، بۆ نموونە، با چیتر نەڵێین (ابو ذر الغفاري)[3] کەسێکی مارکسیست یان سۆشیالیست بووە، یان شۆڕشی قرمتییەکان[4] سەرەتایەك بووە بۆ شۆڕشی کۆمۆنیزم.. هتد، ئەمە لە قۆناغێکدا و لە ئاستی ڕاگەیاندنی سیاسی پڕوپاگەندە بۆ

کراودا تاڕادەیەك مەقبول بوو، بەڵام ئەمڕۆ زۆر زەحمەتە ئەم جۆرە بیرۆکانە وەربگرین.

دەبێ بەو جۆرە لە کەلەپوور بخوێنین کە هەیە و لە پەرەسەندنی خۆیدا لێی بکۆڵینەوە، چونکە کەلەپوور بەو جۆرەی خۆی و لە پەرەسەندنی خۆیدا باشترین بواری مەعریفییە کە لە ئێستاو لە داهاتووشدا سوودی لێوەردەگرین. تایبەتمەندێتی و هەر شتێکی دی پەیوەست بەو، لە راستیدا دەچێتە ناو تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆژییانەوە. مۆرکی گشتیی چەمکی تایبەتمەندیش لە توێژینەوە جۆراوجۆرەکاندا بەو شێوەیە دیاریکراوە کە: تایبەتمەندی جۆرێکە لە خاڵێکی جێگیر لە رابردوودا و دەبێ ئێمە هەمووومان پەیوەست بین بەو خاڵە جێگیرەوە، بەڵام ئەو خاڵە جێگیرە چییە؟ دەبینین ئایدیۆلۆژیستێکی موسڵمان ئەو خاڵە جێگیرە لە ناو ئایدیۆلۆژییەکەی خۆیدا دیاریدەکات. عەرەبێکی ناسیونالیستیش لەناو سنوورەکانی ئایدیۆلۆژیاکەیدا دەستنیشانی ئەو خاڵە جێگیرە دەکات. ئەوەندەی من بزانم تا ئێستا مارکسیستێك ئەو خاڵە جێگیرەی دیاری نەکردووە، بەڵام دەشێت ئەویش دیسان لەناو چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیاکەی خۆیدا دەستنیشانی بکات.

ئەمە، لە سەرێکی دیکەوە تا ئەمڕۆ توێژینەوە لەسەر تایبەتمەندی نەکراوە تەنها بەبەراوردکردن لەگەڵ خۆرئاوادا نەبێت. مەسەلەی پەیوەندی لەگەڵ خۆرئاوادا مەسەلەیەکە ئەمڕۆ زۆر بە توندی گرفتی تایبەتمەندی دەهێنێتە پێشەوە و دەیخاتە ڕوو. لەبەرئەوە پێموایە، دەبێ یەکەمین شت، وەك توێژەرێك، ئەنجامی بدەین، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە نییە کە دەڵێ: تایبەتمەندی چییە؟ بەڵکو بریتییە لە لێکۆڵینەوەی رێچکەی شیکاریی وەڵامە جۆراوجۆرەکانی ماهیەتی تایبەتمەندی، واتە لێکۆڵینەوە و خوێندنی ئەو بابەتەی لەبەر دەستمانە بۆ ئەوەی بزانین چۆن لەم مەسەلەیە کۆڵراوەتەوە. پاشان لە قۆناغی دووەم یان لە هەنگاوی دووەمدا دەبێ لە ئیشکالییەتی پەیوەندی خۆرهەڵات بە خۆرئاواوە بکۆڵینەوە، هەروەها پەیوەندی عەرەب بە خۆرئاواو چۆن ئەم پەیوەندییە سەریهەڵداوەو گەشەی کردووە؟ ئاخۆ جۆری ئەو پەیوەندییە چییە و بۆچی بەو چەشنەیە؟ لەوانەیە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ئەم ئیشکالییەتە بەرەو جۆرێك لە وەڵامدانەوەی (گرفتی تایبەتمەندی)مان ببات.

سەبارەت بەخۆم، من ئێستا لە قۆناغێکدام چاو بە هەموو شتێکدا دەخشێنمەوە، باوەڕیشم وایە دەبێ جارێکی دیکە و سەر لە نوێ لە ئیشکالییەتی پەیوەندی خۆرهەڵات بە خۆرئاوا بکۆڵینەوە و پێویستە لە رەگوڕیشەوە لەم پەیوەندییە بتوێژینەوە. بگرە لەوەش زیاتر: من پێم وایە ئەم مەسەلەیە لە چوارچێوەیەکی تەواو داگیرکاریدا خراوەتەڕوو چونکە خۆرهەڵات لە رابردوودا سێنتەری شارستانیەت و چەقی ڕۆشنایی ژیاری بووە. ئەوسا خۆرهەڵاتی عەرەبی ڕۆشنایی پەخش دەکرد و خۆرئاواش وەرگربوو. بەڵام لە چەرخە نوێیەکاندا ئەم مەسەلەیە تەواو پێچەوانە بووەوەو ئێستا عەرەبەکان وەرگرن و ئەوەیشی کە پێیدەڵێین "خۆرئاوا" بریتییە لە چەقی پەخش و ناوەندی بەخشین و بڵاوکردنەوە.

لە ئاستی قووڵی شارستانیدا من باوەڕم وانییە لێرەدا خۆرهەڵات و خۆرئاوا هەبێت. بەڵکو لێرەدا مرۆڤ هەیە دەگەڕێ و زانیاری کەشف دەکا و لەگەڵ پێدراوە مێژووییەکانی خۆیدا خۆی دەگونجێنێ. لەبەرئەوە، دیسان دەڵێم مەسەلەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا، ئەمڕۆ لەناو چوارچێوەیەکی داگیرکاری و ئیمپریالیدا دەخرێتە ڕوو پتر لەوەی لەناو

چوارچێوەیەکی شارستانیدا بخرێتەڕوو، واتە یەکێ لە ئامانجە ئایدیۆلۆژییە گرنگەکانی خۆرئاوا بریتییە لە هێشتنەوەی لێکترازانی نێوان ئەوەی پێیدەوترێ "خۆرئاوا" و ئەوەی پێیدەوترێ "خۆرهەڵات"، بۆ ئەوەی خۆرهەڵات بەمانایەك لە ماناکان هەمیشە پاشکۆی خۆرئاوا بێت. لێرەوە، پێم وایە شۆڕشی ئێرانی ڕووداوێکی گرنگە، چونکە بەچاو پۆشین لە هەموو هەڵە و کەموکورتیەکانی – گەڕانەوەیەکە بۆ ئاگایی خود کە لە ئیسلامەوە دەست پێدەکات. لەبەرئەوە بواری ئەم بابەتە بوارێکی فراوان و گەورە و ئاڵۆزیشە، من خۆم هیچ وەڵامێك و هیچ چارەسەرێکی کۆتاییم پێ نییە، من ئێستا پرسیار دەکەم و دەگەڕێم.

**جان تەننوس:** تۆ لە یەکێ لە وتارەکانتدا پێت وایە "شۆڕشی ئێرانی هەناسە وەرگرتن و هەناسەدانەوەی ئێرانە"[5]، پاشان دکتۆر ناسیف نەسسار وەڵامی دایتەوە و وتی ئەم قسانەی تۆ ئایدیالیستی و سۆفیگەراییە[6]. ئاخۆ دەشێت شۆڕشی ئێرانی بەو جۆرە بێت کە تۆ وەسفت کردووە بێ ئەوەی بکەوینە ناو یۆتۆپیاو سۆفیگەرایی و ئایدیالیزمەوە؟

**ئەدۆنیس:** ئەو دەستەواژەیەی ئاماژەی پێدەدەیت لە سیاقی وەڵامدانەوەی وتارێك وتراوە کە ئەنوەر عەبدولمەلیك نووسیویەتی[7] ئەنوەر عەبدولمەلیك وایدەبینی شۆڕشی ئێرانی دیاردەیەکی ئیسلامییە بەڵام تەنها لە ئاستی سیاسیدا. بەڵام من وتم شۆڕشی ئێرانی تەنها ئاستی سیاسی نییە، لەوەش زیاترە و دەگاتە ئاستی قەوارەیی (یان بوونی قەوارەیی) لە پرۆسیسە و لە تێڕوانینیدا. لە بەرئەوە، هەڵەیە ئەگەر تەنها لە ئاستی سیاسیدا تەماشای شۆڕشی ئێرانی بکرێت، دیسان هەڵەیە ئەگەر بڵێین ئیسلامی شۆڕشی ئێرانی بریتییە لە ئیسلامی سیاسی. من باوەڕم وایە ئەم چەشنە تەفسیرکردنە ناتەواو و هەڵەیە. ئەم شۆڕشە، لە ڕاستیدا، شۆڕشێکی قەوارەیی و سەرجەمگیرە بە هەموو مانایەك. هەر لێرەشەوە وتوومە ئەمە هەناسە وەرگرتن و هەناسەدانەوەی ئێرانە. بەڵام ئەم قسەیەش بەهیچ جۆرێك ئەوە ناگەیەنێت کە من بە تەواوی پشتگیری یاخود لایەنگری شۆڕشی ئێرانیم، من هەڵوێستگەل و تێبینگەلێکی زۆرم لەمەڕ هەندێ لەو پرۆسیسانە هەیە کە بە ناوی شۆڕشەوە ئەنجام دەدرێن و دەشێت هەڵوێست و تێبینییەکانی من لەوەش زیاتر بێت کە لەلای هەریەکێ لە ئێوەدا هەیە. بەڵام لە بارودۆخێکی وەکو ئەم دۆخەی شۆڕشی ئێرانی کە لەبەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چارەنووس سازدایە، تەفاسیلەکان دەبن بەشتێکی لاوەکی، مومکین نییە ئێمە لە قووڵایی دەریادا بین و باسی تەڕبوون بکەین.

**جان تەنوس:** کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکی پاشکەوتووە. بە چ شێوەیەك دەتوانین ئەم کۆمەڵگایە بگۆڕین: بە ئایین یان بە ناسیونالیزم، یاخود بە سۆشیالیزم و مارکسیزم؟

**ئەدۆنیس:** با جارێ لە چوارچێوەی پرسیاری یەکەمدا بمێنینەوە با بزانین کەسی دیکە قسە و تێبینی هەیە، دوای ئەوە دەچینە سەر بابەتێکی دی.

**د. مونیر شەماعە:** تۆ لە سەرەتادا وتت پێویستە جارێکی دی چاو بە بابەتی پەیوەندییەکانی خۆرهەڵات بەخۆرئاوا بخشێنینەوە، پاشان وتت شۆڕشی ئێرانی یەکێکە لەو دیاردانەی دەبێ جارێکی دیکە چاوی پێدا بگێڕینەوە. ئاخۆ چاوپێداگێڕانەوەی پەیوەندیمان لەگەڵ خۆرئاوادا گریمانی گەڕانەوەمان دەکات بۆ

قۆناغی پێش بیرکردنەوەی داگیرکاری ئیمپریالی؟ چونکە خۆرئاوا، وەك ئیدوارد سەعید لە دوا کتێبیدا[8] دەڵێ، خۆی وێنەی خۆرهەڵاتی داناوە بەو چەشنەی لەگەڵ خۆیدا و بۆ خۆی دەگونجێت. ئاخۆ ناچارمان دەکات بگەڕێینەوە بۆ قۆناغی پێش ئەو وێنەیەی خۆرئاوا کێشاویەتی؟

**ئەدۆنیس:** پێشتر وتوومە و ئێستاش دووپاتی دەکەمەوە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەمای یەکەم (ئەسڵی یەکەم)، چونکە ئەم ناوچەیە لەوەتەی ئیسلامی چووەتە ناو، لە جەنگێکی بەردەوامدایە لەگەڵ دەرەوەی خۆی: لەگەڵ فارس و پاشان ڕۆم و دواتر عوسمانییەکان و ئینجا خۆرئاوا، واتە ئەوروپا، کەواتە لێرەدا بەردەوام جەنگێك هەبووە لەگەڵ دەرەوەدا، لەبەرئەوە هەمیشە کێشمە کێشێك هەبووە لە نێوان توێژێك دەیویست لەگەڵ دەرەوەدا بکرێتەوە و توێژێکی دی لە دژی دەرەوە دەوەستا، بێگومان بە گەڕانەوەی بۆ ڕیشە ئەسڵییەکانی خۆی و بەداکۆکیکردن لێی. لە چەرخی ڕێنیسانسدا جارێکی دی ئەو گرفتە خرایەڕوو کە لە چەرخی عەباسیدا گەڵاڵەببوو. ئەوەی جێی سەرنجە ئەو کەسانەی مێژووی چەرخی ڕێنیسانسیان نووسیوەتەوە (مەبەست لە ڕێنیسانسی عەرەبییە –و–) دەڵێن سەرەتای ئەم چەرخە لەگەڵ هاتنی ناپلیۆن بۆ میسر دەستی پێکردووە، وەك بڵێی ڕێنیسانس لە دەرەوە بۆمان هاتبێ، وەك بڵێی بووژانەوەی ئێمە بەرهەمی شکستی ئێمە بێت. بۆچی؟ چونکە ناپلیون لەگەڵ خۆیدا چاپخانە و زاناکانی هێنا. لە بەرامبەر ئەمەشدا کەسانێك هەبوون ئەو شتانەیان ڕەتدەکردەوە کە ناپلیۆن لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی و وایاندەبینی کە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، پاشان لە نێوان ئەو دوو ڕەوتەدا ڕەوتێکی میانڕەو سەریهەڵدا.

باوەڕم وایە کە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بنەمای یەکەم، چونکە کۆمەڵگای عەرەبی لە ئەنجامی ململانێی ئەو ڕەوتانەدا پەرت بووە، دەبینین چینی ڕۆشنبیر لە سەرێك لە ئاستێکی فیکری و عەقڵیی خۆیدا دەژی، واتە ئاستی تەواو تیۆری، کەچی لە سەرێکی دی ئاستی ژیانی چینی ڕۆشنبیر بە تەواوی فەرامۆشکراوە. واتە بونیادی خێزان و مەسەلەی ئایین و دابونەریت و ئەو کەلەپوورەی وەك بایۆلۆژی یاوەریی مرۆڤ دەکات، هەموو ئەمانە فەرامۆشکراون، بۆیە هەستدەکەین ژیانی عەرەبی پەرت بووە، هەرکەسێ لە ئێمە وا هەست دەکات کە خۆی پەرت بووە و لە چەند بەشێك پێك دێت: هەر کەسێ لە ئێمە وا هەست دەکات عەقڵی بەخۆرئاوایی کراوە ئیتر بیەوێت یان نەیەوێت، چونکە ڕۆشنبیرییەکەی ڕۆشنبیرییەکی خۆرئاواییە، زمان و زاراوەکانی خۆرئاواییین، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەشدا هەموو کەسێ لە ئێمە لە ماڵەوەدا خۆرهەڵاتییە: لە پەیوەندییدا لەگەڵ ژن، لە ڕەفتار و مامەڵەیدا لەگەڵ خەڵکی، لە پێکهاتی کۆمەڵایەتی، لە نەریت و هەڵسوکەوتیدا، لەو پاشماوە کەڵەکە کراوە مێژووییانەی تیایدا ماوەتەوە. ئەم پەرتبوونە وەك چۆن لە ئاستی تاکەکەسدا هەیە بە هەمان شێوە لە ئاستی کۆمەڵیشدا هەیە، لەبەرئەوە تاکی عەرەبی لە قووڵاییدا پەرت بووە، هەروەها کۆمەڵگای عەرەبیش. هەندێجار ڕێکەوتی کەسانێك دەکەیت کە لە بواری نوژداری و ئەتۆم و گەردوونیدا دەخوێنن کەچی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا و لە ڕەفتار و هەڵسوکەوت و دابونەریتیاندا لەو جووتیارە دەچن کە لە گوندێکی دوور و سادەوە هاتووە. ئەگەر لێرەدا پەیوەستێك یاخود گونجانێك

لە نێوان ڕەفتار و سلوکی مرۆڤی عەرەبی و فیکر و تێڕوانینەکەیدا نەبێت، ئەوسا بە بەردەوامی دەستکەوتە زانستی و شارستانییەکان لە خۆرئاوا وەردەگرین و کەچی عەقڵی خۆرئاوا ڕەتدەکەینەوە، واتە ئەو عەقڵەی ئەو هەموو زانستە گەورەیەی بەرهەمهێناوە، ڕەتدەکەینەوە. (واتە کۆمەڵگاکانی ئێمە لە رووکاردا لەناو تازەگەرییەکی ماددیدا دەژی بەڵام لە قووڵاییدا لە قۆناغی پێش تازەگەریدا دەژی لەبەرئەوەی دوورە لە تازەگەریی عەقڵی –و–)

**یەکێ لە ئامادەبووان:** مامۆستا ئەدۆنیس، لە سەرەتای قسەکانتدا ئاماژەت بۆ پێویستیی هەڵوەشاندنەوە و ڕەتکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا کرد، پاشان وتت دەشێت قۆناغێکی سیاسی دیاریکراو لەسەر تەسویەی ئایدیۆلۆژی بنیات بنرێ. ئایا لەو باوەڕەدایت ئەم قسەیە قسەیەکی ئایدیۆلۆژیانەیە؟

**ئەدۆنیس:** هەموو ئاخاوتنێك بەمانایەك لە ماناکان ئایدیۆلۆژییە، لێرەدا فەرقێك هەیە لە نێوان ئەوەی ئایدیۆلۆژیا بووبێتە خاڵێکی گەیشتن–ی پێشوەخت بە جۆرێك هەر کە دەست پێدەکەین دەزانین دەگەینە چ خاڵێك، وە لە نێوان ئەوەی ئایدیۆلۆژیا بووبێتە فیکرێکی زانستی کە بەبێ هیچ پێشینەیەك بە دوای راستیدا بگەڕێت و پێشوەخت نەزانێت دەگاتە چ خاڵێك. من لە قسەکانمدا مەبەستم لە مانای یەکەمی ئایدیۆلۆژیا بووە کە هیچ فیکرێك و هیچ شیکارییەکی تیادا نییە بەڵکو بریتییە لە هەندێ هاوکێشە کە ئەنجامەکانی زانراو و ئاشکران و پێشوەخت دەزانین دەگەینە کوێ و ئیدی شیکردنەوەی سیاسیش مۆرکێکی پروپاگەندەیی ڕاستەوخۆ لەخۆ دەگرێ. بەداخەوە لەلای ئێمە ئەم مانایەی ئایدۆلۆژیا پتر باوو بڵاوە و منیش دژی ئەو جۆرە مەعریفە ئایدیۆلۆژییەم.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** باوەڕم وایە لێرەدا هەندێ ئایدیۆلۆژیا هەیە، مێژوو بواری بۆ نەڕەخساندوون تا لە واقیعدا پرۆسەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. مامۆستا ئەدۆنیس تۆ لە بارەی مەسەلەی نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی دەدوێیت و ئەمەش بەر لەوەی داین ببێت پێویستی بە ساڵانێکی دوور و درێژ هەیە. جا لەبەرئەوەی لێرەدا ئایدیۆلۆژیای وا هەیە کە دەشێت گونجاوبێت بۆ ئەم واقیعە و وزەیەکی گەورە هەڵدەگرێ و ئێستا حاڵی حازر تێدەکۆشێ، ئەوا دەشێت لە ئایندەدا نزیك بێتەوە لەو بۆچوونەی تۆ دەیخەیتە ڕوو.

**ئەدۆنیس:** زۆر باشە. بەڵام من حوکم لەسەر ئایندە نادەم بەڵکو لەسەر ئەو شتانەی ئەنجام دراون، واتە حوکم لەسەر ڕابردوو دەدەم.

**جەمال عەون:** قسەکان لە بارەی بنەمای یەکەم و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو بوون، بێگومان ناشبێ ڕابردوو و کەلەپووری خۆمان فەرامۆش بکەین. بەڵام چۆن دەشێت تەماشای ئەو کەلەپوورە بکەین و تێی بگەین؟ ئەو پەیوەندییە چییە کە دەشێت تایبەتمەندیی ڕابردوویەکی سادە ببەستێتەوە بە کۆمەڵگایەکی زۆر ئاڵۆز و زۆر گەردوونی و پڕ لە ئیشکالیات و بەرەنگاری؟ ئەگەر گەڕانەوە بۆ بنەما ئامانجی ئەوە بێت جۆرێك لە خاڵی خۆگرتن یان خاڵی متمانەی خودی ونبوومان بخوڵقێنێت، ئیدی چۆن دەگەینە پێکهێنانی خودی عەرەبیی خاوەن ڕەهەندێکی هیومانیستی و عەقڵانیی نوێ؟ ئەوەی لێی دەترسم ئەوەیە: ئەوەی ئەمڕۆ لە ئێراندا ڕوودەدات لەوانەیە گوزارشت بێت لە خود بەڵام دەشێت بەشێوەیەکی هەڵە و وەهمی و سەرەتایی گوزارشتی لێبکات. باشە چۆن دەکرێ خودی عەرەبی – واتە ئەم ئەسڵە – ڕووبەڕووی خۆرئاوا

بێتەوە، خۆرئاوا وەکو بونیادێکی سیاسی و وەکو داگیرکار؟ ئایا دەتوانێت بەرەنگاریی خۆرئاوا بێتەوە بیٚ ئەوەی ئەم خودە خودێکی نویٚ بێت و بە هەموو مانای وشەکە هەڵگری مانای بەرەنگاری بێت؟

**ئەدۆنیس:** زۆر زەحمەتە ئێستا حوکمێك بەسەر شۆڕشی ئێرانیدا بدەین و بڵێین ئەم شۆڕشە دەگەڕێتەوە بۆ بنەمایەك دەشێت بەرەو ونبوونی ببات، چونکە ئەم شۆڕشە هێشتا بە تەواوی پێنەگەیشتووە و کامڵ نەبووە، بەڵکو هێشتا لە قۆناغی پێگەیشتن و ململانێدایە، لەوانەیشە لەم قۆناغەدا بە تەواوی بگۆڕدرێت. بەڵام لە تێڕوانینی ئێستادا وا دەردەکەویٚ کە ململانێی شۆڕشی ئێرانی تا ئەم ساتەوەختەش ململانێیەکە بە پلەی یەکەم لە دژی داگیرکەرە، کە ململانێیەکی نێگەتیڤ لە دژی دەرەوە، کەچی ململانێی پۆزەتیڤ لەگەڵ خودی خۆیدا هێشتا دەستی پیٚ نەکردووە دەشێت لە ململانێی پۆزەتیڤیدا کۆمەڵیٚ شت ئاشکرا بن، کە پێشتر بیرمان لێنەکردبۆوە و مومکین نەبووە پێشبینی بکەین. جا تا ئەو دەمەی کە ئەم ململانێیە پۆزەتیڤییە روودەدات و شێوە و ئیشکالییەتەکانی دەردەکەویٚ و هەڵوێستێك لە دەرەنجامەکەی وەردەگرین، تا ئەو دەمە مومکین نییە دان بە مەشروعیەتی ململانێی شۆڕشی ئێرانیدا بنێین لە دژی دەرەوەی بیانی، لێرەدا ئاماژە بەوە دەدەم کە بایەخ و گرنگیی ئەم شۆڕشە لەسەر کەوتن بەسەر دەرەوەدا نییە، بەڵکو بایەخی ئەم شۆڕشە لەو تەقینەوە ناوەکییانەدایە کە لە پاش ئەو سەرکەوتنەوە دێن من لەلای خۆمەوە ناتوانم پێشوەخت قسە لەسەر ئەو تەقینەوە ناوەکییانە بکەم کە دەشێت رووبدات و بگرە بە مسۆگەری روودەدات.

**جەمال عەون:** لێرەدا چەند نیشانەیەك هەن ئاماژە بۆ جەختکردنێکی هەڵەی خود دەکەن، یان تێڕوانینێکی ناواقیعی بۆ خود..

**ئەدۆنیس:** وەکو چی؟

**جەمال عەون:** بۆ نموونە هەڵوێست لە کەمایەتییە ئایینی و غەیرە ئاینییەکان، هەڵوێست لە دیموکراسییەت.

**ئەدۆنیس:** من لە بەرامبەر ئەم مەسەلانەدا خۆم دوورە پەرێز دەگرم و هەڵوێستێکیان لە بەرامبەردا وەرناگرم تەنها ئەگەر بە چاوی خۆم بیبینم و پەیوەندی بە چەند کەسێکەوە بکەم تا زانیاریی راست و دروستم دەست بکەوێت. زۆربەی ئەو شتانەی لە بارەی ئێرانەوە پێمان دەگات لە رێگەی رۆژنامەکانی خۆرئاواوەیەو ئەمانیش برێکی ئێجگار زۆریان لە شێواندن تیایە.

**جان تەنووس:** شۆڕشی ئێرانی پشتی بە ئایین بەستووە و شوێنگەی خۆی لەسەر ئایین قایم کردووە، واتە لەسەر بنەمای ئایینی ئیسلامی. ئاخۆ ئایین بە کەڵکی نوێکردنەوەی کۆمەڵگاکانی ئێمە دێت؟

**ئەدۆنیس:** چۆن وەڵامی ئەوە بدەمەوە کە ئاخۆ ئایین بە کەڵك دێت یان نا؟

**جان تەننوس:** شۆڕشێکی ئیسلامی لە ئێراندا لەسەر ئیسلام وەستاوە، بۆیە دەبیٚ بنچینەکانی شیبکەینەوە بۆ ئەوەی لە بنەماو روخسارەکانی تێبگەین هەروەها لە ئەگەری گۆڕانکارییەکانی. باشە هەڵوێستمان لە بەرامبەر ئیسلامدا چییە؟

**ئەدۆنیس:** دەبیٚ یەکەمجار لە مەشروعیەتی ئیسلامیی شۆڕشی ئێرانی تێبگەین: تەواو میللەتێك لە ئەزموونی ئایدیۆلۆژیایەکی نا ئیسلامیدا ژیاوە و پاشان لە فەشەل و شکستی ئەو ئایدیۆلۆژیایەدا ژیاوە و ئیدی لە رووی

ئاینییەوە راپەڕیوەو شۆڕشی کردووە، بەڵام ئایا ئایین بەکەڵك دێت یان بەکەڵك نایەت، ئەمە لێدوانی ئێستامان نییە.

**ئەسعەد غەندور:** دەگەڕێینەوە بۆ مێژوو. ئایا بە بۆچوونی تۆ لێرەدا قۆناغگەلێکی زەمەنی هەیە کە سەبارەت بە مێژووی عەرەبی بە قۆناغگەلی زێڕین دابنرێت؟ ئەمە لە چ سەردەمێکدا بووە؟

**ئەدۆنیس:** من دژی چەمکگەلی وەکو (قۆناغ زێڕین)م، و دژی تایبەتمەندی و دژی رەسانەیەتیم ئەگەر بەو مانایە وەربگیرێت، رەسەنایەتی لەلای من لە رابردوودا نییە بەڵکو لە ئایندەدایە. چەرخی یان قۆناغی زێڕین هەمیشە لە ئایندەدایە نەك لە رابردوودا. خۆ ئەگەر هەندێ کەس قۆناغەکانی گەشەسەندنی فیکری عەرەبی بە قۆناغی زێڕین – کە من ئەمە رەتدەکەمەوە – وەسف بکەن، ئەوا گرنگترین قۆناغی گەشەسەندنی فیکری عەرەبی لە چەرخی عەباسیدا بووە، لەو سەروبەندەدا، زۆربەی ئەو ئیشکالییەتانەی ئەمڕۆ خراونەتەڕوو، بە جورئەت و بوێرییەکی دەگمەنەوە خرابوونەڕوو، تەنانەت کەسێکی تاتەئیست (مولحید)یش بیروباوەڕەکانی خۆی دەردەخست، کەچی ئەمڕۆ ناوێرین بەشێکی کەمی ئەو بیروباوەڕانە بخەینە ڕوو کە هەندێ لە پێشینەکانی ئێمە تەعبیریان لێکردووم. بە مانایە ئێمە بە بەراورد بەو قۆناغە، پاشکەوتووین.

**غەسان ئیستیفان:** بۆچی ئەو هەوڵە فیکرییە نوێگەرییانە لاواز و خامۆش بوونەوە؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە بابەتێکە پێویستی بە سیمینارێك یان کۆنگرەیەك هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی و کولتووری، بەڵام من لەو باوەڕەدام گرنگترین هۆکاری خامۆشبوونی فیکری عەرەبی بریتییە لە پێکەوە گرێدانێکی بەهێزی نێوان فیکر و رژێمی سیاسی، ئەوەی کە ئەمڕۆکە بە ئاشکرا بەرجەستە بووە. کاتێك رژێمی سیاسی دەبێتە تیشکۆیەك سەرجەمی چالاکییەکانی کۆمەڵگا بەرجەستە دەکات، ئەوسا رژێم وەکو خواوەندێکی لێدێت و خەڵکیش یان لایەنگرین یانیش دژی دەوەستن، یان کافرن یانیش ئیماندار، ئیدی ئەم دوو چەشنە لە خەڵکی لەسەر زەویدا شایستەی هەمان ئەو شتەن کە باوەڕدار و بێباوەڕ لە ئاسماندا دوچاری دەبن. ئەمەش بە پلەی یەکەم دەبێتە مایەی ئیفلیجبوونی فیکری عەرەبی، پێم وایە بەرپرسیاریش بە تەنها ناکەوێتە ئەستۆی رژێم، بەڵکو بەشێکی گەورەی ئەو بەرپرسیارییە دەکەوێتە سەرشانی ئێمەی رۆشنبیران، پێویستە فیکر و رژێم بە تەواوی لە یەکدی بترازێن، بەبێ ئەم لێکترازانەی نێوان فیکر و رژێم مومکین نییە فیکری عەرەبی بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێت. بەڵکو هەروەکو فیکرێکی بەرگریکارو پاساودەر دەمێنێتەوەو تەنها دەبێت بە فیکرێکی پڕوپاگەندە ئامێز.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** ئایا هیچ جارێ ئەم لێکترازانە روویداوە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، ئەم چەشنە لێکترازانە هەرگیز روونەداوە. بەڵام لێرەدا پەراوێزێکی بەرفراوان هەبوە بۆ سەربەخۆیی فیکری لە رژێمی سیاسی، ئەمەش لە چەرخی عەباسیدا هەبوە. جا بۆ ئەوەی واقیعی ئێستامان بەدیار بخەین، دەبێ – بەداخەوە – بگەڕێینەوە بۆ نۆرم و پێوەرەکانی خۆرئاوا.. لە هەندێ لە وڵاتە ئەوروپییەکاندا جیابوونەوەیەکی تەواو هەیە لە نێوان رژێمە سیاسییەکان و فیکر. بێگومان ئەو رژێمانە رۆشنبیری و رۆشنبیرانی خۆیان هەیە، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەشدا چەندین کولتوور و چەندین رۆشنبیر لە دەرەوەی ئەو

رژێمانەدا هەن، رژێمەکانیش دادگایی ئەو رۆشنبیرانە ناکەن بەو پێیەی ئەمانە لە رووی سیاسییەوە لە دژی رژێمن. کەچی لەلای ئێمە وەك چۆن دز و تاوانبار دادگایی دەکرێن، هەر بەو چەشنە رۆشنبیر و بیریاریش دادگایی دەکرێن، بگرە دادگاییکردنی دز و تاوانبار زۆر نەرمترە لە دادگاییکردنی ئەو بیریارەی لە رژێم جیابۆتەوە.

دیاردەی پابەندبونی فیکر بە رژێمی سیاسییەوە، شیعری ستایش و شیعری داشۆرینم بیردەخاتەوە کە لە دەرباری خەلیفەدا ئەنجام دراوە. شاعیری ستایشکار یاخود شاعیری داشۆرین شیعرەکانی خۆیان بە خەلیفە دەفرۆشت، سا ئەو شیعرە لە ستایشکردنی خەلیفە یان لە داشۆرینی دوژمنانیدا هەرچەندێ مەزن بوایە، بەقەدەر ئەوە نرخەکەی بەرز دەبوەوە، ئەمە چونکە شیعر شتومەك بوو، رۆشنبیریی عەرەبیش ئەمڕۆکە شتومەکە.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** چ رۆشنبیرییەك؟

**ئەدۆنیس:** بێگومان رۆشنبیریی باو.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** لەسەرەتای ئەم وتووێژەدا وتت پێویستە بەرهەمی مەعریفی لە ئایدیۆلۆژیا دووربخرێتەوە و بکرێ بە مەیدانێك بۆ مەعریفەی بابەتی. تا چ مەودایەك دەشێت ئەم کارە بکرێت؟ لەلایەکی دی، شۆڕشی ئێرانی ناوی لە خۆی ناوە ئیسلامی، لێرەوە چ جۆرە گونجاندنێك دەبینی لە نێوان پێویستی نوێکردنەوەی فیکر و عەقڵی عەرەبی و نێوان ئەو لایەنە پۆزەتیڤییانەی لە پێدراوەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا دەیبینیت؟

**ئەدۆنیس:** سەبارەت بە مەسەلەی یەکەم یان سەبارەت بە بەشی یەکەمی پرسیارەکەت، بەرهەمهێنانی مەعریفی لەلای ئێمە تا ئێستاش بەرهەمهێنانێکی شیعرییە بە مانای خراپی وشەکە، واتە توێژینەوەو زانستە مرۆڤایەتییەکان تا ئێستا بەکردەوە نەچوونەتە ناو گۆڕەپانی مەعریفەی ئێمە. ئێمە تا ئەمڕۆش نە سایکۆلۆژیامان هەیە نە ئەنترۆپۆلۆژیا، نە لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژیمان هەیە نە نووسینەوەیەکی تازەی مێژوو. لەلای ئێمە بۆ نموونە هەندێ سۆسیۆلۆژیستمان هەیە تیۆرییە سۆسیۆلۆژییەکانی خۆرئاوا دێنن و بەسەر کۆمەڵگای عەرەبیدا پراکتیزەی دەکەن.

ئەگەر ئەو زانستانە نەهێنینە ناو مەیدانی مەعریفەی عەرەبییەوە ئەوا مەعریفەی ئێمە پڕ دەبێت لە ناتەواوی و کەموکورتی. ئێمە تا ئەمڕۆش لەناو مەعریفەیەکی ئایدیۆلۆژیدا دەژین بە مانا سیاسییە پڕوپاگەندە ئامێزە راستەوخۆکەی. ئیتر دەبێ دەرچین و بەرەو مەیدانی راستەقینەی مەعریفە هەنگاو بنێین.

سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکەت، دەشێت پرسیار لەوە بکەین کە ئاخۆ ئێمە مەبەستمان ئەوەبووە ئیسلام وەکو ئیسلام لە دژی تازەگەرییە یان ئیسلام وەکو موسڵمانان دژی تازەگەرییە لێرەدا چەند ئاستێك هەیە بۆ توێژینەوە لە ئیسلام، ئەمەش دەمانخاتە ناو کۆمەڵێ گیروگرفتی زۆر ئاڵۆزەوە. من لە هەموو کەسێ زیاتر رووبەڕووی بەدحاڵیبوون بوومەتەوەو لە کتێبی "ستاتیك و دینامیك"[9] (الثابت و المتحول) بە هەڵە لێم تێگەیشتوون.

من لەم کتێبەدا هەوڵم داوە بە پێی توانا تێڕوانینی ئایدیۆلۆژی دووربخەمەوە، کۆششێکی زۆرم کردووە بۆ ئەوەی کەلەپووری عەرەبی بزانم و بناسم، کەلەپووری عەرەبی وەکو ئەوەی هەبووە و پەرەی سەندووە بە هەموو رووداوو دۆکیومێنتەکانیەوە. ویستوومە رووکار و

ڕواڵەتەکانی ئاشکرا بکەم، واتە لە سەرەتادا و یەکەمجار بیزانم و بیناسم و پاشان هەڵیسەنگێنم. لەبەرئەوە باوەڕم وانییە لە توانادا بێت لە ئیسلام وەك ئیسلام لە خۆیدا، بتوێژینەوە، چونکە لێرەدا ئیسلام و موسڵمانان هەیە، هەروەها لێرەدا چەندین قۆناغی مێژوویی جیاواز بۆ ئیسلام و بۆ موسڵمانان هەیە. ئاخۆ ئیسلام تەنها بریتییە لە قورئان و سوننە و حەدیس؟ ئایا دەشێت قورئان و سوننە و فەرموودەکانی پێغەمبەر لە تێگەیشتن و موعانات و تەفسیر و پرۆسیسەکانی قۆناغە جیاوازەکانی مێژوو جیابکەینەوە؟ پاشان چۆن پرۆسیسەکان دیاری بکەین و بە چ نۆرم و پێوەرێك دەستنیشانیان بکەین؟ هەموو ئەم مەسەلانە پێویستییان بە کاتێکی زۆر هەیە بۆ توێژینەوە و لێرەدا هەڵەی حوکمە گشتی و پێشوەختەکان دەردەکەوێت.

من گومانم هەیە لەوەی ئەمڕۆ لە توانادا بێت دەوڵەتێك لەسەر ئایین دابمەزرێت، من لەو وتارانەمدا کە وەڵامی ئەنوەر عەبدولمەلیکم داوەتەوە تەعبیرم لەم مەسەلەیە کردووە، بەڵام کەسێك وتاری سێیەمی منی[10] نەخوێندۆتەوە یان فەرامۆشی کردووە و من لەوێدا لە بارەی ئەو گومانە قسە دەکەم. بەڵێ من گومان دەکەم لەوەی ئەمڕۆکە لە توانادا هەبێت دەوڵەتێك لەسەر ئایین دابمەزرێت، بەڵام، وەختێك سەرجەمی میللەتێك بەناوی ئایینەوە رادەبێ و شۆڕش بەرپا دەکات، چ دەکەیت؟ لە بەرامبەر ئەم دیاردە زیندووەدا تەنها ئەوەت بۆ دەمێنێتەوە چاودێری بکەیت و لە شتەکان رابمێنیت بۆ ئەوەی پێشهات و گۆڕانکاری و دەرەنجامەکان ببینیت، دوای ئەوە بگەڕێیت و شتەکان بپشکنیت و حوکمێك بدەیت.

گومانی تیا نییە کە تێگەیشتنی موسڵمانان لەسەرێك، لە هەندێ قۆناغ و هەلومەرجدا، تێگەیشتنێك بووە دژ بە تازەگەری. بەڵام لەسەرێکی دی مومکین نییە لە توێژینەوەی ئیسلامدا پرۆسەی موسڵمانان جیابکەینەوە.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئاخۆ ئیسلام بە مانا گشتییەکەی لەگەڵ تازەگەریدایە یان لە دژیەتی، بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە ئاخۆ ئیسلام وەك قورئان و حەدیس و سوننە، دەتوانێت چوارچێوەی دەوڵەتێکی نوێمان بداتێ کە لەگەڵ ئەم چەرخەدا بگونجێت و بگرە لەگەڵ هەلومەرجی ئەم قۆناغەی ئێستاماندا بگونجێت؟

**ئەدۆنیس:** من بە پرسیارێکی دی وەڵام دەدەمەوە: بۆچی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا سێنتەری بلێسەی شارستانی بوو لە جیهاندا؟

**عیسام عەبدوڵلا:** نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە لێرەدا ئیسلامێکی شیعر هەیە و تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی هەیە. شیعە بە حوکمی ئەوەی لە مێژووی ئیسلامیدا بەردەوام لە ئۆپۆزیسیۆنێکی سیاسیدا بوونە، دەبینین شیعییەتی ئەوان تایبەتمەندییەکی فیکری لە ئیسلامدا بەدەستهێناوە، دەشێت کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد لەلای ئەوان یەکێ بێت لە گرنگترین رووی ئەو تایبەتمەندییە. راوبۆچوونی مامۆستا ئەدۆنیس چییە؟

**ئەدۆنیس:** ئەم تایبەتمەندییە لەو ململانێ مێژووییەدا روونتر دەردەکەوێ کە شیعەگەرایی لە دژی رژێمەکاندا بەرپای کردووە. بەڵام لە حاڵێکدا شیعە بگاتە ئەوەی خۆی ببێت بە رژێم، ئەوسا چەندین گیروگرفتی ئاڵۆز سەرهەڵدەدەن. هیچ

شتێکیش نییە ڕێ لەوە بگرێت ڕژێمی نوێ هەروەکو ڕژێمی کۆن، ببێت بە ڕژێمێکی ستەمکار و داپڵۆسێنەر. مەسەلەی ڕژێم مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** کاتێ وتت گۆڕەپانی مەعریفەی عەرەبی خاڵییە لە زانستە نوێیەکانی سۆسیۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆژیا و.. هتد وام هەستکرد کە دەتەوێ بڵێیت عەقڵی عەرەبی ناتوانێت ئەم جۆرە زانستانە هەڵبگرێت، لە کاتێکدا چەندین هەوڵ هەن لەم بوارەدا کە شایستەی ئاماژە پێدانن، هەر بۆ نموونە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە عەبدوڵڵا عورەوی[11] لە ئاستی ڕۆشنبیریی گشتیدا ئەنجامی داون، هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەی سەلمان ئەلحەسەن[12] لە عێراقدا لە بواری ئابووریدا ئەنجامی داون. دیسان ئاماژە بۆ ئەوەش دەدەم کە هەندێ لە ڕژێمە عەرەبییەکان ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی ناو و بەرهەمی ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیرانی عەرەب دەگرن. تکایە ئەم خاڵە ڕوون بکەرەوە.

**ئەدۆنیس:** بێگومان من مەبەستم ئەوە نییە کە عەقڵی عەرەبی لە خۆیدا بێتوانایە لە بەدەستهێنانی ئەو زانستانە، چونکە لێرەدا عەقڵێك نییە لە عەقڵێکی دیکە باشتر بێت، یان مرۆڤێك لە مرۆڤێکی دیکە باشتربێت، ئینسانی عەرەبی وەك هەر ئینسانێکی دی قودرەتی بیرکردنەوەو نوێکردنەوەی هەیە و بەڵگەش زۆرە. لە دەرەوەدا چەندین زانا و بلیمەتی عەرەب هەن بەشداری لە دوا دەستکەوتی زانستی و لە وردترین و زەحمەتترین دەستکەوتی زانستیدا دەکەن، چونکە لەوێدا چەندین دەزگا و دامەزراوی زانستی هەن ئەو کەسانە لەخۆ دەگرن، کەچی لەلای ئێمە بە پێچەوانەوەیە.

ئەو هەوڵانەی ئاماژەت پێدان، بە مەزەنەی من، هەوڵگەلێکی تاکەکەسین و ڕەوتێك یان تەوژمێك دروست ناکەن و بە گشتی دەچنە ناو چوارچێوەی مەعریفەی خۆرئاواییەوە، هەموو چەمکەکان لە زاراوە خۆرئاواییەکانەوە وەرگیراون، لەلای ئێمە زاراوەگەلێکی وەها دەرنەکەوتوون کە بشێت بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگای عەرەبی بەکاربهێنرێن. ئەمە بە گشتی هەڵەی مارکسیستە عەرەبەکانە، مارکسیزم لە هەندێ لە وڵاتانی دنیادا لە تەك ئاتاج و پێداویستییەکانی ئەو وڵاتانەدا پەرەی سەندووە و پێشکەوتووە و خۆی گونجاندووە. لێرەدا مارکسیزم لینینیزم و، مارکسیزم – ماویزم هەیە و کەچی – ئەوەندەی من بزانم – مارکسیزمێکی عەرەبی نییە.

**غەسان ئستیفان:** دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئەو مەسەلەیەی کە دەڵێ: "هۆکاری پاشکەوتوویی لە موسڵمانەکان خۆیاندایە نەك لە ئیسلام". ئەم مەسەلەیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا خرایەڕوو، ئەمە لەگەڵ ئەو بزاوتانەدا دەستی پێکرد کە بە "سەلەفیەت"[13] ناودەبرێن و دیارترینیان بزاوتی "وەهابی"[14]یە تا دەگاتە "ڕەوتی ریفۆرمخوازی ئیسلامی[15]" کە دیارترین بیریارانی ئەو ڕەوتە بریتین لە: جەمالوددین ئەفغانی[16] و ئیمام محەمەد عەبدە[17] و شێخ ڕەشید ڕەزا[18] بەڵام ئەو بۆچوونەی ئەوان – واتە بۆچوونی بزاوت و ڕەوتە فیکرییەکان – ئێمەیان نەگەیاندە سەر ڕێگەی دۆزینەوەی دەرمانێك بۆ ئەو نەخۆشییە، بگرە بە پێچەوانەوە ڕەوتە فیکرییە ئیسلامییەکان پتر بەرەو داخران و ستاتیك خزین. بیرمەندی میسری ڕەفعەت ئەلسەعید لە چەندین لێکۆڵینەوەدا[19] دەریدەخات چۆن ئەو خزینە لە ئەفغانییەوە بۆ محەمەد عەبدەو لەویشەوە بۆ ڕەشید ڕەزا بەردەوام بووە تا سەرەنجام گەیشتۆتە پێکهێنانی "ئیخوان

موسلمین". به بۆچوونی من ئەم خزینە دەگەڕێتەوە بۆ دوو فاکتەر: فاکتەری یەکەم ناکاو و دەرەکییە، دووەمیشیان خودییە و لەناو ئیسلام خۆیەوە هەڵقوڵاوە. ئەو ڕەوتە ئیسلامییانەی ناومان هێنان، بە تەرکیز کردنیان لەسەر ئەوەی کە "نەخۆشییەکە لە موسڵمانەکاندایە نەك لە ئیسلام"، لە سنووری ڕەخنەگرتن لە ریشەی عەقیدەی ئیسلامی وەستان و ئیتر بڕستیان لێبڕا، واتە ڕووبەڕووی ئەو کێشە و ئاستەنگ و گرفتانە نەبوونەوە کە دەتوانن بە فیعلی بەشداری لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکاندا بکەن و موسڵمانان چاکسازی بکەن. گومانی تیا نییە کە لەسەرێکی دی داگیرکەریش دەوری خۆی گێڕا لە هەڵگەڕانەوە و خزینی بزاوتە ئیسلامییەکان کە بە ئەنقەست کاردانەوەیەکی نێگەتیڤانەیان لە بەرامبەر داگیرکەردا هەبووە، بەڵام سەرکەوتنی داگیرکەر لە وروژاندنی کاردانەوە سەلبییەکاندا بەدی نەدەهات ئەگەر لە بنەڕەتدا ناتەواوییەك لە عەقیدەی ئیسلامی یان ڕاستتر لە جۆری تێگەیشتن لەو عەقیدەیە نەبوایە. دیسان ئەگەر بیرمەندە ئیسلامییەکان وایان لە چاوپێداگێڕانەوەی ئەو عەقیدەیەو ئەو تێگەیشتنە نەهێنایەو ئەگەر بە کردەوە ڕەخنەیەکی ریشەییان لێبگرتایە ئەوا داگیرکەریش مەرامەکانی نەدەهاتەدی. ئایا بۆچوونی ئەدۆنیس لەم بارەیەوە چییە؟

**ئەدۆنیس:** ڕاستە مەسەلەی "دەردەکە لە موسڵماناندایە نەك لە ئیسلام" مەسەلەیەکی کۆنەو لەو سەردەمەدا خراوەتەڕوو کە بە "چەرخی ڕێنیسانس" ناودەبرێ، بەڵام من کاتێ ئەم مەسەلەیە دەخەمە ڕوو مەبەستم شتێکی دیکەیە. باسکردنی ئەم مەسەلەیە لە کۆندا لەو باوەڕە پێشوەختەوە دەستی پێکرد کە ئیسلام شتێکە بە میرات بۆمان ماوەتەوەو بە پێی بارودۆخ و هەلومەرجیش ملکەچی چاوپێداگێڕانەوەو تەئویل نییە.. هتد، بەڵام من لەو باوەڕەوە مەسەلەکە دەخەمە ڕوو کە ڕەسەنایەتی لە ئایندەدایە و تایبەتمەندیش لە گۆڕانکاریدا، واتە لەوێوە کە دەبێ ئیسلام دینامیکی بێت (المتحول) نەك ستاتیك (الثابت).

پاشان ئێمە ناتوانین بە ئیسلام بڵێین لە شوێنی خۆتدا ڕابوەستە تا ئێمە دەوڵەتێکی دیکە لەسەر بنەمایەکی نائیسلامی دادەمەزرێنین بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی لەو چەشنە پێویستە ڕەوتگەلێکی فیکریی بەهێز هەبن و توانای ئەوەیان هەبێت بونیادی گشتیی فیکری بگۆڕن. باوەڕم وایە کەموکورتی و ناتەواوی لەو بزاوتە ریشەییانەدایە کە هەوڵیانداوە سیستمێکی فیکری وا بخوڵقێنن جیاوازبێت لە سیستمی فیکری ئیسلامی و، بەڵام شکستیان هێنا، بەڵێ ناتەواوییەکە لە ئێمەدایە. ئێمە وەکو: چەند کەسایەتییەك و چەند بزووتنەوەیەك و چەند ڕێکخراوێك کە هەوڵیانداوە فیکرێکی دیکە بخوڵقێنن و فەشەلیان هێنا. کەواتە پێویستە لەسەرمان جارێکی دیکە بە خۆمان و بە فیکرماندا بچینەوە بۆ ئەوەی بتوانین لە کۆمەڵگادا کارێك بکەین.

**غەسان ئیستیفان:** کەواتە، بەڕای من، پێویستە نوێکردنەوەی نوێکاریی ئێمە دوو دیوو دوو ڕووی هەبێت: نوێکردنەوەیەك لە فیکری عەرەبیدا بەشێوەیەکی گشتی، نوێکردنەوەیەکیش لە فیکری ئایینی ئیسلامی بەشێوەیەکی تایبەتی.

**ئەدۆنیس:** فیعلەن دەبێ ئەوە بکەین.

**غەسان ئیستیفان:** گومانی تیا نییە ڕژێمە عەرەبییەکان کاتی گۆرییە بنچینەییەکانی خۆیان لە

ئایدیۆلۆژیای باوەوە وەردەگرن، کە ئەویش ئایدیۆلۆژیای ئیسلامییە، هەر ئەو رژێمانە لە شوێنگەی خۆیانەوە پارێزگاری لەو ئایدیۆلۆژیانە دەکەن. لە تەك تێکۆشانمان لە دژی ئایدیۆلۆژیای باو، دەبێ خەبات لە دژی رژێمی فەرمانڕەواش بکەین. ئێمەش وەکو کەسانی دیموکراتیخوازی عەلمانی، عەلمانییەت وەکو یەکێ لە چارەسەرەکان دەخەینەڕوو، مەبەستمان لە عەلمانییەتی بێلایەنە، واتە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت. بۆچوونی ئەدۆنیس لە بارەی عەلمانییەتەوە چییە و چ هەڵوێستێکی لە بەرامبەردا هەیە؟ پاشان عەلمانییەت وەکو رەوتێکی مێژوویی و مرۆیی و عەقلانی لە کوێی پرۆسەی نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی و فیکری ئیسلامیدایە؟ ئینجا پەیوەندیی عەلمانییەت بە دیموکراسییەتەوە چییە؟

**ئەدۆنیس:** من باوەڕم بە عەلمانییەت هەیە و بگرە لەوەش دورتر دەڕۆم و دەڵێم هەر کۆمەڵگایەك هەرچەندێ ئایینخواز بێ ئەگەر بوارێك بۆ ناتەئیزمیش نەکاتەوە ئەوا پرۆسەی ئایینی تیایدا پرۆسەیەکی ناتەواو و ناکامڵە، باوەڕی ئایینی قووڵ و راستەقینە رێگە دەدات لە بەرامبەریدا ئاتەئیزمێکی راستەقینە هەبێت، هەر کۆمەڵگایەك تەنها ئیمانی تیادا باوبێت و تاتەئیزم قەدەغە کرابێت ئەوە ئیمانەکەیشی ئیمانێکی لێڵ و چەواشەیە. دواجار لە مرۆڤدا هەمیشە مەیلێك دەمێنێتەوە کە لە هەموو شتێك یاخی دەبێت، تەنانەت لە خوداو لە ئیمانیش. سا ئەگەر ئایین لێبووردە و دیموکراسی بێت و لایەنگرانی باوەڕیان بە لێبوردەیی و دیموکراسیەت هەبێ ئەوا دەبێ دان بە بوونی ئاتەئیست و بێباوەڕو عەلمانییەکانیشدا بنێن دەنا نابن بە کەسی ئیماندار، واتە خۆیان ئیمانی خۆیان نەفیدەکەن.

**جەمال عەون:** لە سەرەتای قسەکانتدا شتێکت گوت بەو مانایە دێت کە خۆرئاوا خۆرهەلاتیزەکراوە، ئێمە نکوڵی لە کاریگەری کولتوری عەرەبی بەسەر خۆرئاوادا ناکەین، بێگومان بەر لەوەش کولتووری عەرەبی کەوتبووە ژێر کاریگەریی فەلسەفە و کولتوورەکانی دیکەی خۆرهەلاتی و خۆرئاوایی. ئێمە لە میانی خوێندنەوەی مێژوودا دەبینین کولتووری ئەوروپی تا ئەندازەیەکی گەورە لە کولتوورەکانی رابردوو قووڵتر و سەرجەمگیرترە. ئەم کولتوورە ئەگەرچی کاریگەربووە بەسەرچاوە عەرەبی و یۆنانییەکان، بەلام ئەمە دەرئەنجامی بەرەو پێشەوچوونێکی تایبەتییە کە کۆمەڵگای ئەوروپی لە هەموو بوارەکاندا تیایدا ژیاوە نەك تەنها لە بواری فیکریدا، ئێمە لە میانی قسەکانی شارستانیەتێکمان هەبووە و پاشان گواستوومانەتەوە بۆ خۆرئاوا.

**ئەدۆنیس:** خۆرئاوا چەمکێکی تەمومژاوییە، مەبەستمان لە کام خۆرئاوایە؟ لێرەدا چەند جۆرێك لە خۆرئاوادا هەیە و هەروەها چەند جۆرێکیش لە خۆرهەلات هەیە. کاتێ دەڵێین خۆرئاوای ئێستا ئەوا باوەڕ ناکەم مەبەستمان لە خۆرئاوای نیچە یان خۆرئاوای مارکس یان هیگل یان رامبۆ و بۆدلێر بێت، بە پێچەوانە لەو باوەڕەدام مەبەست لە خۆرئاوای ئێستا خۆرئاوای سەرمایەداری ئیمپریالی داگیرکارییە. لەم ئاستەدا دەبێ چاو بە مەسەلەی خۆرهەلات و خۆرئاوادا بگێڕینەوە. لێرەدا هەمیشە ئەو پرسیارە دێتە پێشێ: کام خۆرئاوا؟ من دژی خۆرئاوای مارکس نیم، هەروەها دژی خۆرئاوای عەقلانی نیم، دژی خۆرئاوای رامبۆ و بۆدلێریش نیم. کاتێ دەڵێم خۆرئاوا بە خۆرهەلاتیکراوە مەبەستم ئەوەیە بزوتنەوە فیکرییەکان لە خۆرئاوادا بزوتنەوەگەلێکی

ناخۆرئاوایین، واته ئەمانه بزووتنەوەیەكن له خۆرئاوا یاخی دەبن، یاخیبوون له وێنه هەنووكەییەكەی خۆرئاوا، له هەمان كاتدا ئیلهام له خۆرهەڵات وەردەگرن به تایبەتی له ئاستی شیعریدا. شاعیره گەورەو داهێنەرەكانی خۆرئاوا كه ئاسۆیەكی تازەیان بۆ هەستیاریی شیعریی خۆرئاوایی كردەوە، دنیای شیعرییان لەسەرێك دژی خۆرئاوا بوو یاخود یاخیبوون بوو له خۆرئاوا، له سەرێكی دیكەوە بەهره وەرگرتن بوو له خۆرهەڵات.

**یەكێ له ئامادەبووان:** كەواته دەبێ زۆر وریابین له بەكارهێنانی وشەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا. قسەكردن لەسەر خۆرئاوای داگیركاری دەبێ روون و ئاشكرا بێت و بڵێین ئیمپریالیزمی خۆرئاوایی نەك خۆرئاوا چونكه سەلەفییەكان دەتوانن ئیستغلالی ئەو چەمكه بكەن و بڵێن سەرانسەری خۆرئاوا خراپه و خۆرئاوا داگیركەر و ئیمپریالیزمەو دەبێت هەر شتێك خۆرئاوایی بێت تووڕ هەڵبدرێ و هەموو شتێكی خۆرئاوایی له خۆمان دوور بخەینەوە.

**د. پەترۆس لەبكی:** دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ كێشەی بەرهەمهێنانی مێژوویی و سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی لەلای عەرەب. ئەوەی پەیوەسته به زانسته كۆمەڵایەتییەكانەوە باوەڕم وایه دەبێ وەك قۆناغی یەكەم تیۆرییه خۆرئاواییەكان وەربگرین لەبەرئەوەی لەلای ئێمەدا شتێك نییه، (دەشبێ وەرگرتنی تیۆره خۆرئاواییەكان سیفەتێكی سەرجەمگیر و جیهانییان هەیە)، بێگومان دەشێت وەرگرتنی حەرفی و تەواوی ئەو تیۆرانه به كەڵكی كۆمەڵگای ئێمه نەیەت، بەڵام وەرگرتنی رەخنەگرانه دەشێت بۆشاییەكی گەوره پڕ بكاتەوە و زەمینه بۆ سازدانی تیۆرگەلێكی نوێی تایبەت به خۆمان سازبكرێ. گرنگ ئەوەیە — وەك ئەو برادەرەی پێش من وتی — هەستی دوژمنكارییانەی خۆرئاوا به سیفەتی داگیركەر نەبێته مایەی دژایەتیكردنی ئێمه بۆ سەرانسەری خۆرئاوا و بۆ سەرجەمی لایەنەكانی خۆرئاوا. هەروەها ئاماژه بۆ ئەو هەوڵدانانه دەكەم كه له بواری نووسینەوەی مێژوودا دەدرێ كه له میانی نووسینەوەی مێژوودا دەشێت چوونه نێو چەرخی نوێ مەیسەر ببێت.

**ئەدۆنیس:** پێشتر وتم هەوڵه تاكەكەسییه جوزئییەكان رەت ناكەمەوە، بەڵام ئەو هەوڵه فەردیانه بەشێك له پێكهاتەی كولتووریی ئێمه پێكناهێننو نابنه بەشێك له ژیانی رۆشنبیریی ئێمه. بەم مانایه من وتم ئێمه كەموكورتی و ناتەواویمان زۆره و داهێنانی تایبەت به خۆمان نییه تەنها له شیعردا نەبێت. بۆ پتر روونكردنەوە دەكرێت بڵێین لێرەدا چەند شاعیرێكی عەرەبیمان هەن بەشدارییان له خوڵقاندنی هەستیارییەكی شیعریدا كردووه له ئاستی جیهاندا. بەڵام ناتوانین بڵێین ئێمه زانایەكی سۆسیۆلۆژیستی عەرەبمان هەیە — بەپێی زانیاریی من — كه له كایه و بوارەكەی خۆیدا كارێكی گەورەی كردبێت وەك ئەوەی ئەو شاعیرانه كردوویانه. هەمان شت سەبارەت به زانستی مێژووش.

**د. پەترۆس لەبكی:** وا تێدەگەم ژمارەیەكی زۆری شاعیری عەرەب هەن، لەوانەی تۆ باسیان دەكەیت، له شاعیرانی خۆرئاوا وە ئیلهامیان وەرگرتووه.

**ئەدۆنیس:** ئەمه راسته بێ ئەوەی بچینه ناو تەفاسیلەوە. بەڵام ئەو شاعیرانه توانیویانه كارێكی وا بكەن تایبەتمەندیی خۆیان هەبێت. له ملاتر ئایا سۆسیۆلۆژیستێكی عەرەب یان ئەنترۆپۆلۆژیستێكی عەرەب یان مێژوونوسێكی عەرەب هەیە توانیبێتی ئەو تایبەتمەندییه بۆ خۆی دروست بكات؟ مەسەله

ئەوە نییە سوود لە خۆرئاوا وەربگیرێ، مەسەلە ئەوەیە کە زانستە نوێیەکان بەرەسەنایەتی و داهێنانەوە بچنە نێو چنینی ژیانی کولتووری و ژیانی ڕۆژانەمانەوە.

**غەسان ئیستیفان:** قسەکردن لە بارەی داهێنانی شیعرییەوە بەرەو ئەوەم دەبات پرسیار لە بارەی زمانەوە بکەم، بە تایبەتی کە ئەدۆنیس تەرکیز دەکاتە سەر نوێکردنەوەی زمان، بە تایبەتی نوێکاریی زمانی شیعری. ئایا بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندیی نوێکاریی زمانی عەرەبی بە نوێکاریی فیکری عەرەبییەوە چییە؟ ئەی توانای نوێکردنەوەی زمانی عەرەبی چییە؟

**ئەدۆنیس:** بێگومان گرفتی نوێکردنەوەی زمانی عەرەبی یەکێکە لە گرفتە کۆنەکان. هەندێجار هەندێ کەس دەڵێن زمانی پەتی مردووەو دەبێ زمانی میللی شوێنی بگرێتەوە. من لە رووی مەبدەئییەوە باوەڕم وایە عەقڵ دروستکەری زمانە نەك بە پێچەوانەوە. زمان بریتییە لە ئامرازی عەقڵ، هەرچەندێ عەقڵ بەهێز و خوڵقێنەر بێت بەقەدەر ئەوە زمانیش خوڵقێنەر و بەهێز دەبێت، هەرچەندێکیش عەقڵ گرژ و بێتوانا و مردوو بێت زمانەکەیشی بەو جۆرە دەبێت: کەسێ موتابەعەی مێژووی پەرەسەندنی زمانی عەرەبی و پەیوەندیی ئەم پەرەسەندنە بەداهێنانی گشتیی عەرەبییەوە بکات، بۆی دەردەکەوێت زمانی عەرەبی لە قۆناغەکانی داهێنانی عەقڵی عەرەبیدا گەشەی کردووە و لە قۆناغی کەم وزەیی و دۆگمای عەقڵیشدا ئەو زمانە خامۆش و بێتوانا بووە. زمان هەرچەندێ جوان بێت ناتوانێت عەقڵێکی گەورە یان بیرێکی جوان دابهێنێت. ئینسان وەکو عەقڵ بنچینەی شتەکانە. ئەگەر وایدابنێین ئەمڕۆ ئینسانی عەرەبی واز لە زمانی پەتی بهێنێ و زمانی میللی بە کاربهێنێ، ئاخۆ ئەو ئینسانە دەبێتە ڕووناکبیرێکی داهێنەر؟ من باوەڕم وانییە. کەواتە جارێکی دی دەڵێم مەسەلەکە لە عەقڵدایە و لە زماندا نییە. پەرەسەندنی زمانەکان پێمان دەڵێن عەقڵ هەمیشە داهێنەری شتەکان و چەمکەکان بووەو دوای ئەوە ئیتر بەدوای ناولێنانێکی زمانەوانیدا گەڕاوە. پێشکەوتنی زمان بەندە بە توانای عەقڵ لەو پێشکەوتنەدا، هەروەها لە فراوانکردنی بەکارهێنانی زمان و هێنانی شتی تازە بۆ ناو ئەو زمانە. زمانیش هەرچەندێ بگاتە داهێنان و خوڵقاندن هێشتا ناتوانێت تەعبیر لە ئیبداعیەتی عەقڵی داهێنەر و خوڵقێنەر بکات، لێرەوە شاعیر پەنا دەباتە بەر وێنەی شیعری، چونکە وشەکان لە خۆیاندا ناتوانن گوزارشت لەو شتە بکەن کە شاعیر دەیەوێ، ئیدی پەنا دەباتە بەر میتافۆر — مەجاز بۆ ئەوەی بتوانێت بە دیقەتەوە جیهانەکەی خۆی دەرببڕێ. ئەمە لە شیعردا و هەروەها لە زانستیشدا. هەموو زمانەکان لە یەکتر وەردەگرن. با بۆ نموونە نووسینەکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی مارتن هایدگەر وەربگرین، ئەگەر سەیری ئەو نووسینانەی هایدگەر بکەین کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فەرەنسی، دەبینین وەرگێڕانەکە کەمدەست بووە لە دۆزینەوەی زاراوەکانی هایدگەر بە فەرەنسی، بۆیە زۆر بە ئاسایی هەر هەمان زاراوە ئەڵمانییەکەیان بەکارهێناوەتەوە. تاوانبارکردنی مەعریفە نوێیەکانی نییە، هەڵەیە، چونکە عەرەبەکان بە تەواوی شارەزای زمانەکەی خۆیان نین. ئێمە ئەمڕۆ لە دۆخێکی نائاسایی و لە حاڵەتی دواکەوتنێکی فیرکی و سیاسیدا دەژین، ئەمەش بێگومان دەبێتە مایەی دواکەوتنی زمانەوانیش. بەڵام نابێت ئەمە وامان لێبکات بڵێین خودی زمانی عەرەبی بێتوانایە.

جەهلی ئێمە بۆ زمانی عەرەبی، وەك بەشێك لە داكەوتنی گشتیی فیكریمان، وامان لێدەكات حوكمێكی سەلبی بەسەردا بدەین، بەڵام ئەگەر ئێمە لە حاڵەتی گەشەسەندنێكی فیكریدا بووینایە ئەوسا زمانی عەرەبی پێگەیشتوو و پێشكەوتوو دەبوو. بەڵگەشم بۆ ئەم قسەیە، دەڵێم، زمانی عەرەبی كە زمانی قورئانە، لە چەرخی عەباسیدا و وشەگەل و زاراوەیەكی ئێجگار زۆری بوارەكانی فەلسەفە و كیمیا و ماتماتیكی وەرگرت و زمانی عەرەبییان بەپیت كرد، ئەمە چونكە لەو دەمەدا عەقڵی عەرەبی لەو بوارانەدا خوڵقێنەر بوو. كەواتە هەر دەبێ زاراوە نوێیەكان بهێنرێنە ناو زمانی عەرەبییەوە، باوەڕیش ناكەم كەسێ هەبێت — جگە لە هەندێ كەسی توندڕەو — ئەم پرۆسەیەی پێ ناخۆشبێت و ڕێگەی لێبگرێ. بێگومان بە تەنها هێنانی زاراوە نوێیەكان نابێتە هۆی نوێكردنەوەی زمان، بەڵكو ئەم پرۆسەیە دوو مەسەلەی دیكەی پێویستە: یەكەم ئازادكردنی زمان بە جۆرێك بتوانێت پێداویستیی تەعبیركردن دابین بكات ئیتر جۆری ئەو تەعبیركردنە هەرچییەك بێت. دووەم وا لە زمان بكرێت جووت و گونجاو بێت لەگەڵ ژیان و كارو كردەوە ڕۆژانەییەكانی زمان، لە منداڵییەوە تاوەكو پیری. ئێمە خۆمان نەك زمانی عەرەبی ناتەواویمان هەبوو لە زانینی زمانی خۆمان و لە پەروەردە و لە هۆیەكانی فێركردن. ناتەواویی زمان لە ڕاستیدا ناتەواوییە لە پرۆگرام و میتۆدەكانمان، ناتەواوییە لە پلانڕێژیمان، ناتەواوییە لە كەرەستەكانمان، دواجار ناتەواوییەكە لە خۆماندایە.

**یەكێ لە ئامادەبووان:** من باوەڕم وایە قورئان دەورێكی گەورەی لە تەجمیدكردنی زماندا هەبووە، چونكە وای لە دەقی عەرەبی كردبێت بە دەقێكی ئیلاهی و نزیكبوونەوە لێی حەرام بێت. لەم بارەیەوە رات چییە؟

**ئەدۆنیس:** لە كۆنەوە ئەم گرفتە خراوەتەڕوو. كەسانێك هەبوون دەیانووت مەسەلەی "ئیعجازی قورئان" بەبێ پێشكەوتنی زمانەوانی مومكین نییە دەستكاری بكرێت. منیش وایدەبینم پێویستە قورئان دەقێكی كراوە بێت بۆ گفتوگۆیەكی هەمەلایەن. دەشێت ئەوانەی لەم لایەنەوە كاریان كردبێت دوچاری گرفت و گێچەڵی زۆر بووبێتن، دكتۆر محەمەد ئاركۆن لەم بارەیەوە بۆچوونێكی هەیە و وایدەبینێ مەسەلەی "ئیعجازی قورئان" مەسەلەیەكی زمانەوانی نییە، ئەمە سنوورەكانی زمانیش جێدەهێڵێ و ئەمە لە ڕاستیدا مەسەلەی ئیمانداریییە. دەبێ لەم بابەتە بكۆڵرێتەوە، بەڵام ئایا جورئەتی ئەوەمان هەیە توێژینەوەی لەسەر بكەین، ئەمەش مەسەلەیەكی دیكەیە.

**یەكێ لە ئامادەبووان:** تا چ مەودایەك نوێكردنەوەی زمان مومكینە ئەگەر لەسەرێك بەدەستكەوتی زانستی و لەسەرێكی دی بە داهێنانی هونەری بەراورد نەكرێت. بە وشەیەكی دی: ئایا دەتوانین پەرە بە زمانەكەمان بدەین و نوێكاری تیادا بكەین لە كاتێكدا دەستكەوتی زانستی و داهێنانی هونەریمان هەر لەم ئاستەی ئەمڕۆماندا بێت؟

**ئەدۆنیس:** نوێكردنەوەی هاوشانە لەگەڵ توانای گشتیی داهێنان. هەر چەندێ داهێنان هەبێت بە قەدەر ئەوە نوێكردنەوە هەیە. نوێكردنەوەش جوڵێنەر و بزێوەو كۆتایی نایەت، واتە مومكین نییە بگەینە خاڵێكی دیاریكراو و بڵێین لێرەدا نوێكاریمان ئەنجامدا. مادامەكی مرۆڤ زیندووە نوێكاریش بەردەوامە. لەم بارەیەوە نموونەیەك هەیە سەبارەت بە هەوڵێكی دێرینی نوێكاری،

ئەویش (قطرب)ە[20] کە یەکێکە لە زانا زمانەوانییە دێرینەکان و دەیووت پێویستە لە کۆتایی وشەکاندا حەرەکاتی ئیعرابی نەهێڵرێ (واتە تەنها سکون دابنرێ).

**یەکێ لە ئامادەبووان:** ئەی باشە بۆچوونی ئەدۆنیس لەم بارەیەوە چییە؟

**ئەدۆنیس:** زمانی پەتی (اللغة الفصحى) بریتییە لە حەرەکە، واتە بریتییە لە مۆسیقا. گرنگ ئەوەیە ئەم کێشەیە ملکەچی ئیرادەیەك نییە. چونکە زمانیش بوونەوەرێکی زیندووە و پێدەگا و پێشدەکەوێ و دەمرێ. لێرەدا هیچ رێگرێکی سۆسیۆلۆژی یان مێژوویی نییە نەهێڵێ بگەینە ساتەوەختێك کە تیایدا زمانی عەرەبی دەمرێت. بەڵام ئایا ئەمڕۆ لە مردنی زمانی عەرەبی و لە عەقڵی عەرەبی بتوێژینەوە وەك کۆمەڵگای عەرەبی کە ئەویش بە تەواوی زیندوو نییە؟

**غەسان ئستیفان:** بەڕای من، زمان سیستمی بیرکردنەوەیە، دەشێت ئەم زمانە لە چەند ساتەوەختێکی دیاریکراودا ببێت بە ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگا..

**ئەدۆنیس:** لە ساتەوەختەکانی داکەوتن و شکستیدا.

**غەسان ئستیفان:**.. و دەشێت ئایدیۆلۆژیا لە دواوەی پێشکەوتنەوە بێت (واتە ئایدیۆلۆژیا باو بێت و پەرەسەندنیش درەنگ بێتە دی یان بە خاوو خلیچکی رێبکات). ئاخۆ ئێمە ئێستا لە چ قۆناغێکداین؟

**ئەدۆنیس:** بۆ ئەوەی بە وردی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە ئەوا دەبێ کۆمەڵگای عەرەبی کۆمەڵگایەکی تەبا و گونجاو وپێکەوە بەستراو بێت و چینەکان و ئاگایی چینایەتیی تیابێت و.. هتد، بەڵام کە کۆمەڵگای ئێمە بەو جۆرە نییە، ئەوا باوەڕم وایە لێرەدا چەند کەسێك هەن بە ئاگایی و هۆشیاریی خۆیان پێش زمانەکەیان دەکەون، واتە داهێنانەکانیان لە موفرەدەو وشەکانیان فراوانترە. هەروەکو لێرەدا کەسانی دیکەش هەن — کە زۆرینە پێکدەهێنن — زمان سەبارەت بەوان زۆر پێشکەوتوو ترەو زۆر لە فیکرەکانیان لە پێشترە، هەروەها لێرەدا توێژگەلێك هەیە نقە ناکات بەڵکو دەنگ دەدات، قسە ناکات بەڵکو دەنگ دەردەکات، واتە وشەکان لەلای ئەو توێژگەلە هەڵگری مانا و دەلالاتی نوێ نییە و داهێنانێك ناگوازێتەوە لە دیاریکردنی پەیوەندییەك لەگەڵ شت و لەگەڵ ئینسانی دیکە و لەگەڵ دونیا.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** ئایا تۆ قسە لە بارەی خۆتەوە دەکەیت وەك داهێنەرێك؟

**ئەدۆنیس:** نا. من قسە لە بارەی سەرجەمی داهێنەران دەکەم. بێگومان ئەو قسەیەشم پشت بە ئەزموونی خۆم و ئەزموونی کەسانیدی دەبەستێ. کاتێ شاعیری داهێنەر بە بەردەوامی پەنا دەباتەبەر چەند شێوازێك کە وشە و موفرەدەکان جێدەهێڵێ، ئەمە مانای وایە لە ناخی ئەو شاعیرەدا دنیایەك هەیە وشەکان ناتوانن بەڕاستەوخۆیی تەعبیری لێبکەن، ئیدی وشە بارگاوی دەکات بەبەکارهێنانی رێگەی بەیانی یان وەسیلەی بەیانی رەوانبێژی، تا وشە و موفرەدە دەکاتە پلەی تەقینەوە.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** ئایا ئەم کەموکورتییە دەگەڕێتەوە بۆ زمانی عەرەبی؟

**ئەدۆنیس:** نا، ئەم کەموکورتییە لە هەموو زمانەکانی دنیادا هەیە. هەموو زمانێك تەعبیر لە دەروونی ئینسانی داهێنەر ناکات چونکە ئەو دەروونە لە زمان فراوانترە، ئیتر هەر زمانێك بێ.

**یەکێ لە ئامادەبووان:** دەمەوێ لە مەسەلەی نوێکردنەوەی زمانەوە بچینە سەر مەسەلەی

دیموکراسییەت، ئەوەی کە وایدەبینم پتر پەیوەندی بە بابەتی "نوێکردنەوەی عەقڵی عەرەبی"یەوە هەیە. ئەگەر بە دوای ئەو گرفتە جەوهەرییەدا بگەڕێین کە بووەتە بەربەستێك لە بەردەم جووڵە و پێشکەوتنی عەقڵی عەرەبیدا، ئەوا دەبینین ئەو گرفتە جەوهەرییە بریتییە لە گرفتی دەوڵەتی عەرەبیی ئێستا. لەسەر ئەم پێگەیەو بەو پێیەش کە گۆڕانکاریی ئایدیۆلۆژی پرۆسەیەکی دوور و درێژ و زەحمەتە، ئەوا دەبێ کار بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی عەرەبی بکەین ئەوەی ئەمڕۆ باوە و حوکم دەکات.

**ئەدۆنیس:** باشە، خەباتکردن شتێکی داواکراوەو پێویستیشە بۆ روخاندنی دەوڵەتی عەرەبیی فەرمانڕەوا. بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە ئەم دەوڵەتە بەرهەمی دۆخێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە. تا ئەمڕۆش– بەپێی زانیاریی من – لێکۆڵەرەوەیەك نییە خەریکی لێکۆڵینەوەیەك بووبێت لە بارەی پەرەسەندنی بونیادی ڕژێمی باوی عەرەبی وەك میکانیزمێکی ناوەکی نەك وەکو ئەشخاس و وەکو حکومەت. باشە لە دەسەڵاتی ئومەوییەوە تا ئەمڕۆ چ فەرقێك هەیە لە نێوان ڕژێمی "پێشکەوتنخواز"ی ئەمڕۆی عەرەبی و ڕژێمی خەلافەتی ئومەوی، لە بونیاد و میکانیزمی ناوەکییاندا؟ لەسەرێکی دی، بۆچی عەرەب لە ململانێکانیاندا تەواوکەری یەکدی نین و یەکتر نەفیدەکەنەوە؟ تاکی عەرەبی، هەروەها هەموو ڕژێمی عەرەبییش، دان بە (ئەویدی) نانێن تەنها ئەگەر ئەو (ئەویدی)یە ئاوێنەی خۆی بێت، واتە هەرچەندێ ئەویدی سەر بەو بێت و پاشکۆی ئەو بێت، ئەوا سەبارەت بەو بوونی هەیە، هەرچەندێکیش جیاوازبێت، ڕەتدەکرێتەوە. لە کوێوە ئەو بونیادەمان بۆ هاتووە کە هەر لە چەرخی ئومەوییەوە تیاماندا دەژی؟ بۆچی ئێمە یەکدی نەفیدەکەینەوە و تەواوکەری یەکتر نین؟ من کەسانێکی زۆر دەناسم دوچاری ستەم و چەوسانەوە بوونەو ئاوارەکراون، کاتێکیش لە پێناوی کێشەکانیاندا داوای دەرکردنی بەیانێکمان کردووە، کەچی بەشێك لە ڕۆشنبیران ڕازی نەبوون لەسەر بەیاننامەکە ئیمزا بکەن و یارمەتییان بدەن، لەبەرهیچ نا هەر لەبەر ئەوەی سەر بەو ئایدیۆلۆژیایە نەبوون کە ئەمان هەڵگرین. ئەو کەسانەش کە ئیمزا و بەیاننامەیان ڕەتدەکردەوە لە قۆناغێکی دیکەدا پێچ دەکەنەوە و بانگەشەی دیموکراسی دەکەن و گوایە داکۆکی لە دیموکراسییەت دەکەن.

لەلای ئێمە نەدیموکراسییەت هەیە نەڕێزگرتنی ئەویدی. بەڵام کەسێك ڕێز لە ئەویدی نەگرێت مانای وایە لە قووڵاییدا خۆی ڕەتدەکاتەوە. من بۆیە بە تەواوی کەسێتیی خۆمەوە بوونم هەیە چونکە تۆی دژ و پێچەوانەشم بونت هەیە، من بۆیە هەم چونکە تۆی پێچەوانەش هەیت. من تەواوکەری دژەکەمم. ئایا لەناو ئێمەی عەرەبدا کەسێ هەیە وا بڵێت؟ گشت ئەم کێشانە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی هەیە بۆ ئەوەی بتوانین لێیان تێبگەین و ڕووبەڕوویان ببینەوە. سەرجەمی ڕژێمەکانی ئێمە بەناوی دیموکراسییەتەوە هاتوون، بەڵام هەر کە مومارەسەی دەسەڵاتیان کردووە، جگە لە دیکتاتۆریەت شتێکی دیکەیان پیادە نەکردووە. بۆچی؟ ئەم میکانیزمە چییە؟ هەموو یەکێ لە ئێمە کە خۆمان بە دیموکراسی دەزانین، ئەگەر دەسەڵات بگرینە دەست، گومانم هەیە لەوەی دیموکراسی بین، بێگومان دەشتوانین دەیان پاساوی جیاجیا بۆ دیموکراسی نەبوونمان بهێنینەوە، پاساوگەلی

جیاجیا كه له راستیدا عەقڵ بەهیچ جۆرێ پاساویان نادات.

رژێمە عەرەبییەكانی ئەمڕۆ، ژمارەیان هەرچەندێ بێت، تەنها یەك رژێمە: رژێمێكی ستەمكار و داپڵۆسێنەر، رژێمێك لە جەوهەردا لەسەر ستەمكاری راوەستاوە. بۆیە دەبێ لە هەموو ئاستەكاندا دژایەتی بكرێن و رەت بكرێنەوە، بەلاّم دژایەتیكردن و رووخاندنشیان بە پێویست گرەنتیی هاتنی رژێمێكی دیموكراتی نادەن، چونكە بونیادی ژێرەوە: واتە بونیادە كۆمەلاّیەتی و ئابوورییەكان، بونیادی ستەمكارین. بونیادی ژێرەوەی عەرەبی – ژێرخان – بونیادێكی ستەمكارییە و لەسەر داپڵۆسین دامەزراوە. كەواتە دەبێ لە بناغەوە هەڵبوەشێنرێتەوە. لێرەوە بایەخ و گرنگیی شۆڕش دێتە پێشێ، بەلاّم دەبێ جەخت لەوەش بكەین كە ئاستی سیاسی لە شۆڕشدا نزمترین ئاستە و هەر بە تەنها گەیشتن بە دەسەلاّت و فەرمانڕەوایی مانایەكی نییە. گەیشتنە سەر حوكم دەبێت لوتكەی قۆناغێكی گەورە و گرنگی هەڵوەشاندنەوە بێت. بەبێ ئەم قۆناغەش – واتە قۆناغی هەڵوەشاندنەوە – گەیشتنە سەر حوكم هیچ شتێك ناگۆڕێت.

## پەراوێزەكان:

1–ئەمە دەقی سیمینارێكە كە رێكخراوی "دیموكراتیخوازە عەلمانییەكان" لە ساڵی (1980)دا لە بەیروت سازی داوە و غەسان ئستیفان ئامادەی كردووە و پەراوێزی بۆ داناوە.

2–بۆ نموونە بڕوانە گۆڤاری (مواقف) ژمارە (34) ساڵی (1979) كە دۆسییەكی لە بارەی "ئیسلام و تایبەتمەندی" تێدایە.

3–ابو ذر الغفاری: ناوی (جندب بن جنادە)، لە ساڵی 32 هیجری 652 زایینی كۆچی دوایی كردووە. ژمارەیەكی زۆری لە فەرموودەكانی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە. لە دوای مەرگی پێغەمبەر لە ولاّتی شامدا ژیاوەو ئیدی سەعلوك و هەژاران لە دەوری كۆبوونەوەو ئەویش ئەو فەرموودانەی بۆ دەوتن كە رەخنە لە دەوڵەمەندان دەگرێ، هەروەها كردەوەكانی موعاویەی ئاشكراكرد كە پارەی موسڵمانان بۆ بەزم و رابواردنی خۆی سەرف دەكات، ئەویش گەڕاندیەوە بۆ مەدینە، پاشان خەلیفە عوسمان دووری خستەوە بۆ رەبزەو لەوێ لە تاراوگەدا مرد.

4–(القرمطیة): بزووتنەوەیەكی ئایینی سیاسی كۆمەلاّیەتی بوو، حەمدان بن قرمط لە عیراق دامەزرێنەرێتی. لە بەحرەیندا وەك بزاوتێكی بەهێز دەركەوت و پاشان دەسەلاّتی كەوتە سەر زۆربەی ولاّتە ئیسلامییەكان. قرمتییەكان لە ساڵی (930ز)دا دەستیان بەسەر مەككەدا گرت و حەجەرلئەسوەدیان تیادا گواستەوە بەلاّم لە پاش 22 ساڵ گەڕاندیانەوە. لە ساڵی (970ز)دا ولاّتی میسریان لە ژێر دەستی فاتیمییەكان دەرهێناو پاشان لە ساڵی (1027)یشدا مەسەلەی قرمتییەكان بۆ یەكجاری لەسەر دەستی میرەكانی بەحرەین كۆتایی پێهات.

5–ئەم سێ وتارەی ئەدۆنیس لە بارەی شۆڕشی ئێرانی بەمجۆرەن:

أ–الاسلام و الاسلام السیاسی، النهار العربی و الدولی –العدد (90) 1979/1/22.

ب–حول المعنی الحضاري للحركة الاسلامية الايرانية، النهار العربي و الدولي العدد (93) – 1979/2/12.

ج–انطلاقا من فرح النصر الاولي: شيء من القلق و الخوف، النهار العربي و الدولي – العدد (95) – 1979/2/26.

شایانی باسە ئەم سێ وتارەی ئەدۆنیس جارێکی دیکە و لە بەشی سێیەمی چاپی هەشتەمی (الثابت و المتحول)دا بلأوکراوەتەوە.

6-ناصیف نصار، حرکە التحرر و الاستعمال السیاسی للاسلام، النهار العربی و الدولی - العدد (92) 1979./2/5

7-النهار العربی و الدولي - العدد (89) - 1979./1/15

8-ادوارد سعید، الاستشراق، منشورات بانثیون، نیویورك .1978

9-ستاتیك و دینامیك (الثابت و المتحول) تێزی دکتۆراکەی ئەدۆنیسە کە لە ساڵی (1973)دا پێشکەشی زانکۆی قەدیس یوسفی کردووە لە بەیروت و لەسێ بەشی سەرەکی پێکدێت و تا ئێستا هەشت جار چاپکراوەتەوە.

10-بڕوانە پەراوێزی ژمارە (7).

11-گرنگترین کتێبەکانی عەبدوڵڵا عوڕەوی کە مەنهەجی فیکریی ئەو نیشاندەدەن، ئەمانەن: (الایدیولوجیة العربیة المعاصرة - 1970)، (العرب و الفکر التاریخي - 1973)، (ازمة المثقفین العرب: تقلیدیة ام تاریخیة؟ - 1978).

لە دوای ئەمانە چەندین کتێبی گرنگی دیکەی چاپکردووە، بۆ نموونە (مفهوم الدولة) و (مفهوم الحریة) و (مفهوم التاریخ) و (مفهوم العقل).

12-محەممەد سەلمان حەسەن، لە عێراق لە دایك بووە، چەندین کتێبی لە بارەی ئابووری عێراقەوە هەیە، بۆ نموونە (بەرەو خۆماڵیکردنی نەوت لە عێراقدا)، (پلانڕێژی پیشەسازی)، (چەند لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی ئابووری عێراقی).

13-بۆیە ناونراوە "سەلەفییەت" چونکە ئەم رەوتە وایدەبینێ پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سەلەفی پیاوچاکانی موسڵمانان (السلف الصالح) واتە بە تایبەتی بۆ سەردەمی خولەفای راشدین. رەوتە سەلەفییەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری تەعالیمەکانی (ابن تیمیە - 1262ز -1327ز) و (ابن الجوزیە - 1291ز -1350ز)، جگە لە بزوتنەوەی وەهابی وەك بزوتنەوەیەکی سەلەفی، هەروەها بزوتنەوەی: سنوسی لە لیبیا، مەهدی لە سودان، ئالوسی لە عێراق، شەوکانی لە یەمەن.

14-(بزوتنەوەی وەهابی): بزوتنەوەیەکی ئایینیە و لە نیمچە دوورگەی عەرەب سەریهەڵداوە و، دەگەڕێتەوە بۆ موحەممەد کوڕی عەبدولوەهاب (1703ز-1787ز) کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی مەزهەبی حەنبەلی (جگە لە کاریگەریی ئیبن تەیمیە). دوژمنانی ئەم بزوتنەوەیە ناوی (وەهابی) یان لێناوە بەو پێیەی ئەمە بیدعەیە و لە دەرەوەی پرەنسیپەکانی ئیسلامدایە، بەلأم ئەوان ناوی دیکەیان لە خۆیان نابوو، وەك: "حەنبەلییەکان" یان "یەکگرتووەکان" یان "سەلەفییەکان". بزوتنەوەی وەهابی توانی یەکەمین دەوڵەتی سعودی لە ساڵانی (1786-1818) و دووەمین دەوڵەتی سعودی لە ساڵی (1904)دا دابمەزرێنێ کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە.

15-هیشام شەرابی دەڵێت: "لەتەك تەقلیدگەرایی پارێزگاران (واتە گرووپی - العلماء - کە پشتگیری دەسەڵاتی عوسمانییان دەکرد، هەروەها "رەوتە سەلەفییەکان") و نوێگەری پێشکەوتنخواز (واتە" رەوتی ئیسلامیی عەلمانی، رەوتی مەسیحی عەلمانی) بزوتنەوەیەکی دیکەی میانڕەو سەریهەڵدا کە دەشێت ناوی بنێین هەڵوێستی ریفۆرمخوازی، چونکە جگە لە بزاوتێکی موحافیزکار شتێکی دی نەبوو، بەلأم تا ئەندازەیەك رۆشنگەربوون و دەرکێکی عەقلأنییان بۆ بارودۆخەکە هەبوو..) بڕوانە (المثقفون العرب و الغرب، دار النهار للنشر، بیروت - 1971، ص 31).

16-جەمالوددین ئەفغانی: ئێرانییەو لە ساڵی (1839ز) لە ئەفغانستان لە دایکبووە. لەسەردەمی ئەمیر محمد الاعظم دا کرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی

ئەفغانستان، سەر بەرەوتی ریفۆرمی ئیسلامی بوو، بیروباوەڕەکانی ئەفغانی لە گۆڤاری (العروە الوثقي)دا بلاۆکراونەتەوە کە لەگەڵ محەمەد عەبدە لە ساڵی 1884 لە پاریس دەریاندەکرد و ئەوکاتە هەردووکیان لە تاراوگەدا دەژیان. لە ساڵی 1896 کۆچی دوایی کردووە.

17–ئیمام محەمەد عەبدە: لە ساڵی 1849 لە میسر لەدایکبووە، لە شۆڕشی ئەحمەد عورابیدا بەشداریی کردووە و پاشان بۆ ماوەی سێ مانگ خرایە زیندانەوە و دواتر بۆ ماوەی سێ ساڵ دوورخرایەوە بۆ بەیرووت و پاریس، لە ساڵی 1888دا گەڕایەوە بۆ میسر و ئیدی سەرگەرمی چاکسازیی ئایینی و چاکسازیی دامەزراوەکان بوو. لە ساڵی 1902 کۆچی دوایی کردووە.

18–شێخ رەشید رەزا: لە ساڵی 1865 لە نزیک شاری تەرابلوس (لوبنان) لە دایکبووە، سەرسام بووە بە سۆفیزم و سۆفیگەرایی، بەلاّم دواتر لێی هەڵگەڕایەوە، لە ساڵی 1894 دا محەمەد عەبدەی ناسی و لە ساڵی 1897دا سەفەری بۆ میسر کرد، لەوێدا گۆڤاری (المنار)ی دەردەکرد و بیروباوەڕەکانی خۆی تیادا بلاۆکردەوە. چەندین دانراوی هەیە لە بارەی ریفۆرمی ئایینی و سیاسی و کۆمەلاّیەتی. لە ساڵی 1965دا کۆچی دوایی کردوە.

19–بۆ نموونە بڕوانە ئەم وتارە: (الحركات الاسلامية من الارتداد الى مزيد من الارتداد – مجلة دراسات عربية – العدد 1 – سنة 1977).

هەروەها بڕوانە ئەم کتێبە: (حسن البنا – مؤسس حركة الاخوان المسلمين – متى.. كيف.. و لماذا؟) دار الطليعة – بيروت – 1979.

20–ئەبو عەلی موحەممەد بن ئەلموستەنیر، لە ساڵی (821ز) کۆچی دوایی کردووە، زمانزان و موفەسیر بووە. لە بەسرە لە دایکبووە و هەر لەوێشدا مردووە. لە کتێبە گرنگەکانی: (كتاب الاضداد) و (كتاب المثلث).

## سەرچاوە

ادونیس، الثابت و المتحول – بحث في الابداع و الاتباع عند العرب، الجزء الثالث: صدمة الحداثة و سلطة الموروث الديني، دار الساقي – لندن – ط 8، 2002.

# ئایا "ئەدۆنیس" شایەنی خەڵاتی نۆبڵە؟

هاشم سالح

لە عەرەبییەوە: سەردەم

شتێکی سەیرە: هەر کاتێك سەروەختی خەڵاتی نۆبڵ دێت، سەرنج دەدەین قەڵەمی ڕۆژنامەنوسان بە گشتی دەورو خولی ناوی تەنها یەك کەس دەدەن، ئەویش "ئەدۆنیس"ە. بە ترس و هەڵچونێکەوە دەورو خولی دەدەن، نەبادا بەخت یاوەری بێت و خەڵاتەکەی بەنسیب بێت. هەموو شتێك وەها ڕوودەدات وەك ئەوەی بیانەوێت، بەر بە مەترسی گەورەی ڕوودانی ئەو ئەگەرە ناخۆشە بگرن، بۆیە دەست دەکەن بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی نابەجێ لەسەر "ئەدۆنیس". وەك بڵێی بیانەوێت ناڕاستەوخۆ پەیامێك بگەیەننە لیژنەی خەڵاتەکە لە ستۆکهۆڵم، بۆ ئەوەی خەڵاتەکەی پێ نەبەخشێت، لەبەر ئەوەی ئەو نوێنەری عەرەب نییە!! ئەڵبەتە ئەگەر ڕوبدات و خەڵاتەکەی پێ بدرێت ئەوا ئەوانە قوشقی دەبن. کەواتە ئەکادیمیای سویدی دەیەوێت عەرەب ڕازی بکات یان تورەیان بکات؟

هەندێ جار مرۆڤ مەزندەی ئەوە دەکات، گەر هاتوو وا کەوتەوەو خەڵاتەکە درا بەو، ئەوا دەیان نوسەر و ڕۆشنبیری عەرەب جەڵدەی دڵ لێیان



دەدات!.. ئەم هەموو هەرایە لە پای شتێك بۆچی، کەڕووی نەداوە و ڕەنگە هەر ڕووش نەدات؟ ئەم هەموو شالاوە نارەوایە بۆچی؟ تەنانەت بۆتە کێشەیەکی گەورەو بگرە بۆتە مەسەلەیەك کە لە خودی خەڵاتەکە گرنگترە؟ باشە چی تێدایە گەر ئەو خەڵاتە بدرێتە گەورەترین شاعیری عەرەب لە سەدەی بیستەمدا؟ ئەی ئەو خەڵاتە نەدرایە

گەورەترین ڕۆماننوسی عەرەب؟ کە من ئەم قسانە دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە بڵێم "ئەدۆنیس" تاکە شاعیرێکی مەزنی ئێمەیە، چونکە شاعیرانی وەك "نزار قەبانی و بەدر شاکر سەیاب و خەلیل حاوی و سەمیح قاسم و مەحمود دەرویش"یشمان هەیە. بەڵام ئەوەندەی پەیوەندی بە نوێگەری شیعری عەرەبییەوە هەیە، پێموایە "ئەدۆنیس" لە هەموویان گرنگتر و قوڵترە. هەموو ئەوانەی کە ئاگاداری مەسەلەی شیعرن، ئەوە دەزانن. خاوەنی (گۆرانیەکانی میهاری دیمەشقی)، هەر لە ساتەوەختی دەرچوونی دیوانی (قصائد اولی) و (اوراق في الريح)، تا دەگاتە (مفرد في صيغة الجمع) و (التحولات و الهجرة في اقاليم الليل و النهار) و (وقت بين الرماد و الورد).. هتد، لە ئاسمانی شیعردا دای لە شەقەی باڵ و بەرز فڕی.

ئەو توانی گۆڕانکاری زۆر سەیر لە شیعری عەرەبیدا بکات و بەشێوەیەکی زۆر سەیریش کەوتە لەقکردنی بنەماکانی سستمی تیۆلۆژی – سیاسی لای عەرەب. ئەمە ئەو تاوانە بوو کە "ئەدۆنیس" کردی و لێیخۆش بوونی نەبوو. ئەم تاوانەش تا هەنوکە لێی نەبۆتەوە.. "ئەدۆنیس" تەکانێکی گەورەی بەشیعری عەرەبیدا، مەبەستم لە شیعر ئەو گێنگڵدانە مەزنەیە یاخود (ئەو ڕوبارە گەورەو بە بڕشتەیە) کە "لۆتریامۆن" باسی دەکات.

"ئەدۆنیس" سەرکێش و ڕسکی گەورەی کرد و نەخشەی شیعری عەرەبیشی بەرفراوانترکرد. نەك هەر ئەوەندە، بگرە نەخشەی تازەشی دۆزییەوەو پێشبینی ئەوەشی دەکرد کە چی ڕوودەدات. پێشبینی ئەو (وێرانە قەشەنگەی) ئێستا دەیگوزەرێنین. کەواتە "ئەدۆنیس" شاعیرێکی پێشبینی کارە، پێشبینی کار بەو مانایەی کە "ڕامبۆ" بەم وتەزایەی بەخشی. دەکرێت بڵێین "ئەدۆنیس" دواتر لە ڕسکردنی وشە سازیدا زیاد لە پێویست زیادەڕۆیی کرد؟ یاخود زیاد لە پێویست کەوتە داوی خۆ دووبارە کردنەوە و شیعر گەلێکی زیاد لە پێویستی نوسی کە نەدەبوو بینوسیایە؟ ئەمە مەسەلەیەکی ترە، بەڵام هیچ یەك لەمانە لە گرنگی و بەهای داهێنانە شیعریەکانی سەرەتای کەم ناکەنەوە. بەڵگەش بۆ ڕاستی ئەم قسەیە ئەوەیە کە زۆربەی شاعیرە نوێگەرەکان لەژێر کاریگەری دنیای شیعریی ئەمدا دەنووسن.

"ئەدۆنیس" لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا توانی، گۆڕانکاریەکی گەورە (لەسەر ئاستی فۆرم و بابەت) لە شیعری عەرەبیدا دروست بکات. لێرەوە دەتوانین بڵێین: (گۆرانیەکانی مهیاری دیمەشقی)، بنەماکانی تازەگەری شیعری عەرەبی داڕشت، وەك چۆن "گوڵەبەدەکان"ی "بۆدلێر" و (سرودەکانی مالدورور) ی "لۆتریامۆن" و بەتایبەتیش (بەشێك لە دۆزەخ)ی "ڕامبۆ" شیعری نوێی فەرەنسیان هێنایە ئارا. ئەمەش هیچ لەو ڕۆڵە کەمناکاتەوە کە ئەو کات ئەندامانی دیکەی ستاف نوسینی گۆڤاری بەناوبانگی (شیعر) گێڕایان.

بەڵام بۆ بایەخ و گرنگی "ئەدۆنیس"، جگە لەوە شتێکی دیکە هەیە: ئەویش ئەوەیە کە ئەو لە شیعرەکانیدا بیریارێکی قوڵە. ئەمەش لە تەواوی شاعیرانی نەوەی خۆی جیای دەکاتەوە.. گەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەکادیمیای سویدی خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشی، ئەوا بێ چەند و چوون لەبەر ئەم هۆیە دەبێت. بە مانایەکی تر ئەوەی لە "ئەدۆنیس"دا، عەرەب لێی تورەیە و ناڕازییە لێی، هەمان ئەو شتەیە کە هانای خۆرئاوا دەدات سەرسام بن پێی.

پێویستە بزانین کە "ئەدۆنیس" گەورەترین شاعیری یاخییە لە سەردەمی نوێدا، یاخی بوونیشی بەشێوەیەکی سەرەکی دژ بە چەقبەستنی

کەلەپووری عەرەبی و فێندەمێنتالیستە دزێوەکەی بوو. بێگومان شیعری "نزار قەبانی"یش، بەشێوەیەکی داهێنەرانەی جوان، هەمان ڕەهەندی لەخۆی گرتووە، بەڵام نەبۆتە بنەمای شیعرەکانی. لە کاتێکدا "ئەدۆنیس" تەواوی ئیشکالیەتی شیعری و فیکری خۆی لەسەر ئەو خاڵە بونیاد ناوە. مەسەلەی یاخی بوون لە کەلەپوور و بەگژاچوونەوەی ئسولیەت، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەشیعرەکانیەوە دیارە و لەم دوو دێڕە شیعرە قەشەنگەیدا چڕبۆتەوە:

مسافر تركت وجهي على زجاج قنديلي

خريطتي ارض بلا خالق و الرفض انجيلي

بە مانایەکی تر "ئەدۆنیس" توانی بلیمەتی شیعر و بلیمەتی فیکر، پێکەوە کۆ بکاتەوە. ئەمەش بۆ خۆی بەسە بۆ ئەوەی خەلاتی نۆبلی بدرێتێ. مەزنی ڕاستەقینەی ئەو هۆکاری نەمری شیعرەکانی لێرەدایە، لانی کەم لە قۆناغی داهێنان و ئەفراندن لە مێژووی ئەزمونی شیعری ئەودا. جگە لە "ڕامبۆ" شاعیرێکی دیکەی عەرەبی یاخود جیهانی شك نابەم، وەك "ئەدۆنیس" هەستی توڕەیی و ناڕەزایی لە دژی کەلەپوری سەرکوتکەر و داپڵۆسێنەر دەربڕی بێت. لێرەوە ڕەنگە ڕووی لێکچوون لە نێوان (گۆرانیەکانی مهیاری دیمەشقی) و "بەشێك لە دۆزەخ"ی "ڕامبۆ"دا هەبێت، لەبەرئەوە هەردووکیان بوونە دوو تێکستی شێوە پیرۆز بۆ نوێگەری شیعری. سەروەختێك ئەو دوو دیوانە بەیەکتر بەراورد دەکەم، ئەوا بێگومان "ڕامبۆ" لە پێشترە.

کەواتە ئەگەر "ئەدۆنیس" خەلاتی نۆبڵ بەرێت یان نەیبات، ئەوا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، سەبارەت بە "ئەدۆنیس" و خەلاتی نۆبڵ ئەوەندە وتراوە، وای لێهاتووە وەك ئەوەی خەلاتەکەی وەرگرتبێت. بەهەرحاڵ خەلاتی نۆبڵ بۆ "ئەدۆنیس" زۆرنییە، لەبەرئەوەی بە کەسانێك دراوە کە لە ئاستی ئەودا نین.

لە کۆتایدا سەبارەت بە "ئەدۆنیس" ئەو قسەیەی "جان کۆکتۆ" دەکەمەوە کە دەربارەی "تەها حسێن" کردبووی، وەختێك لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا سەردانی میسری کردبوو. "کۆکتۆ" ئەو کات وتبوی: (کێشەی تەها حسێن ئەوەیە، زۆر لەوە دوورتر دەڕوانێت کەمیسر توانای ئەوەی هەبێت بەرگەی بگرێت). منیش دەڵێم: (کێشەی ئەدۆنیس ئەوەیە زۆر لەوە دورتری بینی کە عەرەب بتوانن بەرگەی بگرن.. بۆیە کەوتنە سزادانی!!). کێشەی فێندەمێنتالیزم کە لە ساتەوەختی ئێستادا تاوی سەندووە، بەر لە چل ساڵ لە ئێستا "ئەدۆنیس" بە دووچاوی خۆی بینیویەتی. خەسڵەتی نبوئی شیعری ئەویش لێرەدایە. بایەخ و گرنگیشی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت کە هیچ شاعیرێکی دی ناتوانێت ببێتە ڕکابەری.

## سەرچاوە:

الشرق الاوسط 2005/10/18.

- **پاولو کویلو**

له عەرەبییەوە: فەرهاد

- **ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە**

ربیع جابر

له عەرەبییەوە: ئازاد

- **شیعری تازە لە وەرگێڕاندا لە نێوان زمانەکاندا**

ڕانان: شێرزاد حەسەن

- **چەند کورتە ڕۆمانێك**

ربیع جابر

له عەرەبییەوە: سەردەم

- **ڕێخراوەکەی فرانز کافکا**

ربیع جابر

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# پاولو کویلو

له عەرەبییەوە: فەرهاد



له پاشکۆی روناکبیری رۆژنامەی "النهار"ی لوبنانیدا گۆشەیەکی تایبەتی جومانه حەداد هەیە که هەموو هەفتەیەك میوانداری نووسەر و ئەدیبێکی ناسراو دەکات، بۆ ئەوەی سەربوردی رۆژێك له ژیانی تایبەتی خۆی بۆ باس بکات. ئەم بابەتەیان تایبەته به رۆژێك له ژیانی گەورە رۆمان نووسی بەرازیلی پاولوکۆیلو.

**دەتانەوێت ڕۆژێك له ژیانی من بزانن؟ چاکه، له ئێستادا سێ جۆرە رۆژی ژیانم هەیە، لێرەدا یەکێك لەو جۆرە رۆژەتان بۆ باس دەکەم. بێگومان دەپرسن مەبەستی کۆیلۆ لەو رۆژی سێیەمەی چیە. مەسەلەیەك نییە، بۆتانی باس دەکەم: لەم ماوەیەدا ژیانم لەسەمفۆنیایەك دەچێت: سەمفۆنیایەك له سێ نەزم پێك هاتبێت. یەکەمیان زۆر خێرا که ناونیشانه پانەکەی "خەڵکانی زۆر"ە، دوەمیان نەزمەکەی لەوخاوترە بەناوی "هەندێك خەڵك" بەڵام سێیەمیان تەواو هێورە و حەزدەکەم تاڕادەیەك به "هیچ کەس" ناودێری بکەم.**

**"خەڵکانی زۆر" ئەو کاتانەیە که نقومی ژیانی رۆژانەی خۆمم وەك نووسەرێك: دیدار لەگەڵ خوێنەراندا، ئاهەنگی واژۆ له هەر چوار قورنەی دنیاوە، دیمانەی تەلەفزیونی و رادیۆو رۆژنامە. پەیوەندی لەگەڵ بڵاوکەرەوەکان و ڕۆژنامەنووسان و وەرگێڕەکان، خۆیشتان، بێگومان، زۆرتر لەو رۆژە دەزانن و پێویست به وتن ناکات.**

**"هەندێك خەڵك" نەزمی ئەو ماوەیەیە که بەردەوام دەچم بۆ وڵاتەکەم، بەرازیل، لەوێ کەسوکارو هاوڕێی منداڵی و گەنجیم دەبینم، بەدرێژایی کەناری کوناکابانادا پیاسە دەکەم، هەندێك جار لێرەولەوێ ئامادەی ئاهەنگی کۆمەڵایەتی دەبم، بەڵام زوربەی کات لەماڵەوەم، وادەزانم ئێوە لەم جۆرە رۆژەیش باش دەزانن و پێویست به درێژەپێدان ناکات. بۆیە لێی دەگەڕێم دزە بکەنه نێو نەزمی سێیەمەوە، نەزمی "تاڕادەیەك، هیچ کەس"**

**(له ئێستادا بێجگه له ئێوە کەسی ترم لەگەڵدا نیە)**

**ئەمڕۆ لەگەڵ قووقوی کەڵەشێردا له خەو هەستام، نانی بەیانیم خوارد، هەر به پیاسه چووم بۆ ناو گاگەل و ڕانه مەڕەکان، بەناو کێڵگەی گەنم و کایەدا تێپەڕیم که بەپاڵ ئەو ئاشه کۆنەوەیە که ماوەیەکه کڕیومەو کردوومەته خانوو بۆ خۆم. له گوندێکی بچووکی بیرینیەدا که ژمارەی دانیشتوانی له دووسەد کەس تێناپەڕێت و حەزیش دەکەم خاوەنەکەی هەر به نهێنی بمێنێتەوە. تەماشای چیاکانم کرد. دەمویست لەو خولیایه خۆم بدزمەوە که هەمیشه لێم نابێتەوە، خولیای بیرکردنەوە له پرسیاری "من کێم؟" به خۆم وت نەوەڵامم لایه و نه پرسیار، به تەواوی لەگەڵ چرکەساتەکەی ئێستادا ژیام لەگەڵ ئەو واقیعەدا خۆم گونجاند که دەڵێت ساڵ چوار وەرزە (بەڵێ) دەزانم، ڕەنگه ئەمه لەو ڕاستیانه بێت که بەڵگەنەویستە، بەڵام زۆررجار بەڵگەنەویستەکان**

لەبیر دەکەین) لێگەڕام کە خودەکەم بگۆڕێت و بگۆڕێت. تا لەو دیمەنە سروشتیە هەراوە بچم کە لە دەورو بەرمدا بوو. کە دەکەومە ئەم چرکەساتانەی ژیانەوە زۆر خۆم بەوەوە خەریك ناکەم چی لە جیهاندا ڕوودەدات. لە عیراق یان لە ئەمریکا یان لە ئەفغانستاندا. تەواو وەك کەسێکی لادێیی، گرنگترین هەواڵ بۆ من دەبێتە ئاووهەوا. هەموو ئەوانەی لەم گوندەدا دەژین دەزانن کەی باران دەبارێت، کەی سارد دەکات، کەی ڕەشەبا هەڵدەکات، چونکە ئەمانە کاریگەریەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر ژیان و پرۆژە و کشتوکاڵ و دروێنەیان هەیە.

بەلای جوتیارێکدا تێپەڕیم کە خەریکی کێڵگەکەی بوو، سلاّومان لەیەکدی کرد، "بەیانیت باش هاوڕێ" قسەمان لەسەر ئاوو هەواو چاوەڕوانیەکانی ئەو کرد، پاشان هەریەکەمان چووینەوە بەلای کاری خۆمانەوە: ئاسایی بۆ جووت کردن و منیش بۆ پیاسەی ناو چیا.

گەڕامەوە ماڵێ، لە سنووقی پۆستم ڕوانی، ڕۆژنامە لۆکاڵەکانم خوێندەوە کەپڕبوون لە هەواڵی ناوچەکە، زانیم سبەی ئێوارە زەماوەندێك لە گوندێکی دراوسێدا هەیە. بیرم کردەوە ڕەنگە بچم، بۆ نا؟

هاتمەوە دەرەوە، لە پاڵ ئەو جۆگەلەیەدا کە بەلای ئاشە خۆشەویستەکەمدا تێدەپەڕێت لەسەر گیاکە ڕاکشام. تەماشای ئاسمانم کرد و بۆ چرکەیەك لەگەڵ پەڵە هەورەکانیدا ئاخافتم، تۆ ناتوانیت لە چەند چرکەساتێك زیاتر لەگەڵ پەڵە هەورێکدا بدوێیت، لەبەرئەوەی زوو لێت دەگەڕێ و بەرەو چارەنووسی خۆی هەڵدێت. پاشان هەستام بۆ کیودۆ کردن، کیودۆ وەرزشێکە پشت بە ڕامان دەبەستێت و ماوەیەکە لەگەڵیدا ڕاهاتووم، لەگەڵ تیروکەوانیشدا، ئەمە نزیکەی سەعاتێکی خایاند، تا کاتی خواردنی نیوەڕۆ هات.

نانێکی سووکەڵەم خوارد وەك هەموو نیوەڕوانێك پێی ڕاهاتووم، پاشان کەمێك دانیشتم، لە دوورەوە دەنگێکم هاتە گوێ کە بانگی دەکردم: "وەرە، وەرە، پاوڵو" لە پێشا نەمزانی کێیە، بەلاّم وردە وردە توانیم دەنگە غەریبەکەی بناسم کە جیاوازە لە هەموو دەنگەکانی تری ئەم جیهانە: ئەویش دەنگی کۆمپیوتەرە، ئەو سندووقە سەیرو سەمەرەیەی هەموو ڕۆژێك وەك موگناتیس پێوەی دەنووسێم. هەر بانگی دەکردم و منیش بەرگریم دەکرد، چونکە دەزانم ئەگەر بەدەم بانگەوازەکەیەوە بچم دەمگێڕێتەوە بۆ ناو ئەو هەراو زەنایەی کە بە تایبەتی دەمەوێت لێرەدا، لەم شوێنەدا کە لێی دانیشتووم، خۆمی لێ بدزمەوە: چونکە هەزار دەنگ دەگەیەنێتە گوێچکەم و هەزار دەموچاو بۆ چاوم و هەزاران وشەیش بۆ بێدەنگیی ئاشەکەم.

کەمێك بەرگریم کرد، بەلاّم لە دواییدا خۆم بە دەستیەوە دا، هەر ئەوەندەی پەنجەم بە دوگمەی *ON* دا نا ئیتر هەموو دنیا کەوتە ئامێزمەوە: گەلێك وتار لەسەر دواکتێبم "الزهير". داوای گفتوگۆ لەگەڵ کردنم، نامەی خوێنەران، کتێب و نووسراو. هەواڵەکانی عیراق و ئەمریکا و ئەفغانستان. ئیمیل لە هاوڕێیەکمەوە کە دەیەوێت بێت بۆ لام، هەندێك بڕیار کە دەبێت بیدەم، هەندێکی دی وا چاکە دوایان بخەم، گەلێك لەوانەی دەتوانیت دەستبەرداریان بیت لەگەڵ ئەوانەدا تێکەڵ بەیەکتر دەبن کە پێویستن و گرانە جیاکردنەوەیان. بەزۆر و خوایشت چەند سەعاتێك کارم کرد، ئیتر ئەمە ئەو ژیانەیە کە خۆم هەڵمبژاردووە، ئەمەیش

ئەفسانە شەخسییەکەمە کە دەبێت هەموو رۆژێك بەردەوام دروستی بکەم. درك بە لێپرسراویەتی و ئەرکەکانم دەکەم وەك چۆن درك بە بەختەوەری و شانسم دەکەم.

وا ئێستا ئەنگۆرەیە، پەنجەم بە دوگمەی ***OFF*** دانا، هەراو هوریای دنیا نەماو ئەوەی ماوەتەوە ئاش و جۆگەو کێڵگەکانی گەنمە. بۆرە بۆری مانگاو بۆنی گژوگیا و دەنگی شوانەکەمەرەکان بەرەو چەپەرەکە ڕادەدات. هەندێك بە تەلەفون قسەکردن، کاتی ئەوە دەگات بگەڕێمەوە لای خۆم ئەم چەند وشەیەی دوایی کە بۆتی دەنووسم پاشماوەی ئەو ڕۆژەمە. دەگەڕێمەوە سەر نەزمی "تارادەیەك هیچ کەس" کە دەڕۆن زۆر مەیکەنە دەنگەدەنگ و هەرا. لە بیریشتان نەچێت لە دوای خۆتانەوە چراکە بکوژێننەوە.

**سەرچاوە:**

پاشکۆی النهار 2005/6/9.

# ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە

**ربیع جابر**

**لە عەرەبییەوە: ئازاد**



ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە. گرنگ نییە تۆ لە کوێیت. لەمسەری ئەم هەسارەیەدایت یان لەوسەری. (ئەدەبی) واتە (مرۆیی)، مرۆڤ گەوهەری ئەدەبە. (سیاسی) زیان بە (ئەدەبی) دەگەیەنێت. تۆ گەر نەزانیت چۆن بواری سیاسیی بەرتەسك تێپەڕێنیت، ئەوا ئاسۆی بەرفراوانی ئەدەب لە دەست ئەدەیت. ئەدەب لە مێژووەوە دەست پێدەکات، بەڵام ئەدەب لە ناو مێژوودا بە هەڵواسراوی نامێنێتەوە. ئەدەب خۆی واتە شیعر، هەموو ئەدەب شیعرە، ئیدی بە پەخشان نووسرابێ یان بە شیعر، هەر شیعرە. ئەدەب لە مێژووەوە دەستپێدەکات بەڵام پاشان بەرزدەبێتەوە، بەرز دەبێتەوە یان دەچێتە قووڵاییەکانەوە. شتەکان دەگۆڕێت، قایل نابێت مێژوو کۆتی بکات. ئەدەب تێپەڕاندنە. خۆزگەیە بۆ تێپەڕاندن. ڕۆماننوس شارەکەی خۆی نانووسێتەوە، بەڵکو شارێك دەخوڵقێنێت کە هاوتەریبی شارەکەیەتی. ژیانی دۆست و ناسیاوەکانی نانووسێتەوە، بەڵکو ژیانێك دەنووسێتەوە کە هاوتەریبی ژیانی ئەوانە، ئەو ژیانە بە تەواوی لەسەر زاری ئەوان دەقۆزێتەوەو سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە: دەینووسێتەوە. ئایا سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە؟ کەس وەکو ئەوی تر نانووسێت، شێواز بریتییە لە مرۆڤ. شێواز ئەدەب دروستدەکات. نووسەر لە کوێ شێوازی خۆی دەدۆزێتەوە؟

نووسەر هیچ شتێك داناهێنێت. تەنانەت شێوازی خۆیشی داناهێنێت. جیهان شێوازت ئەداتێ. شێواز چییە؟ شێواز بریتییە لەوەی کە تیا دەژیت و تووشت دەبێت و دەیخوێنیتەوە.

چی شێواز دروستدەکات؟ ئەوەی شێواز دروستدەکات بە تەنها ڕستەی تۆکمەنییە. بەڵکو شیعری سپییە. هەروەها چرچ و لۆچییەکانی دەموچاو. لە کوێوە شێواز دەهێنیت؟ زەمەن دروستکەری ئەدەبە. ساڵانێك بەسەر ڕستەدا دەگوزەرێ تا دایدەتاشێت، ڕێکی دەکات و پاکژی دەکاتەوە. وەکو دڵۆپە ئاوی سەر بەرد. زەمەن شێوازت ئەداتێ. ئەی دوای ئەوە چی دروستدەکەیت؟

ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە. خوێنەری ئەلیوت لە بیری دەچێتەوە دابنیشێت. شیعری ئەلیوت بۆ جیهانەکەی خۆیت دەبات. "خاکی بەیار" و ئەو شارەی درێژ دەبێتەوەو بڵاودەبێتەوە. ئەی ئەو ڕوبار و بەلەمانەی پیایاندا دەپەڕیتەوە چیان بەسەر دێت؟

پردێك بەسەر ڕوبارەکەوە دەبینیت، خەڵکێك کە بە پردەکەدا دەپەڕنەوە. ئەلیوت باسی دانتی دەکات کە چۆن ئەو خەڵکە دەبینێت کە بە پردەکەدا دەپەڕنەوە. تۆ کە ئەلیوت و یادەوەرییەکانی دەخوێنیتەوە چی دەبینیت؟ ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە. لە لاپەڕەیەکدا ئەلیوت و دانتی دەخوێنیتەوە. سەدەی بیست ئاوێتەی سەدەی سیانزدە دەبێت. لەندەن لەناو فلۆرەنسا و لە هەمانکاتدا لەناو بازنەکانی دۆزەخەوە دەردەچێت. ئەمە چۆن ڕوو ئەدات؟

تۆ لە کتێبخانەی جیبیر لە پاریس لەسەر قەنەفەیەکی زەرد دانیشتوویت. لەوانەشە لە بەیروت یان دوبەی یان قاهیرە دانیشتبیت.

سنوورەکان کوان؟ تۆ لە کاتێکا دەخوێنیتەوە، لە دەرەوەی سنوورەکاندا دەجووڵێیتەوە. کاتێك دەنووسیت لە دەرەوەی سنوورەکاندا دەجووڵێیتەوە.

ئاخۆ ڤاندایك بەمەی زانیوە؟

ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە. کتێبەکان دەتبەنە ناو بوارێکی خەیاڵییەوە. بەڵام ئاخۆ بواری خەیاڵیش بەشێك نییە لەم جیهانە؟ ئەی ئەگەر بەشێکە لەم جیهانە چۆن لەوساتەدا کە کتێبەکە دادەخەیت و لە کتێبخانەکەدا بیرت دەچێتەوە، ون دەبێت؟ هەموو ئەو شتانەت دێنەوە بیر کە خوێندووتنەتەوە؟ لە بیرت دەچنەوە؟ گەشتەکانی مارکۆ پۆڵۆت بیرماوە کەدەساڵ لەمەوبەر خوێندووتنەتەوە. بەر لە دەساڵ؟ لەوانەشە نەتخوێندبنەوە. بەڵام ناوی مارکۆپۆڵۆت بیستووە. ئەوەت بیستووە چۆن لە سەدەی سیانزەدا لە ڤینیسیاوە بۆ چین گەشت دەکات. ئەوەشت بیستووە چۆن ئەو گەشتەی داهێناوەو کتێبێکی تەواوی پڕ لە درۆی نووسیوە. ئەو دوو چیرۆکەت لە بارەیەوە بیستووە، بەڵام چیرۆکەکەیت نەخوێندۆتەوە. ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە گەشتەکان خۆیان بخوێنیتەوە؟ کەواتە بچۆ بۆ کتێبخانە. ڕۆژێك لە تەمەنی خۆت بدە بە مارکۆ پۆڵۆ. کۆمەڵێك شاری سەیر و سەمەرە دەبینیت. گەر پێشتر چینت نەبینیبێت، دەیبینیت. ئەم چینە لە هیچ وڵاتێکی تر ناچێت. لە جیهان دەچێت و لێشی ناچێت. کوان سنوورەکان؟ ئەدەب دەتباتە ناو قووڵایی جیهانەوە. دەتبات بۆ کۆمەڵێك شوێنی بینراو و نەبینراو. دەتباتە ناو ناخی شتەکانەوە. بۆ ناو شتە ساکار و گەوهەرییەکان. شتی ساکار چییە؟ کالڤینۆ مارکۆپۆڵۆی خوێندەوەو مارکۆپۆڵۆ کتێبێکی بەو بەخشی: "شارە نەبینراوەکان" (1972)، لە مێژووەوە دەستپێدەکات – لە "گەشتەکانی مارکۆپۆڵۆ"وە و پاشان دوور دەکەوێتەوە.

شارەکانی کالڤینۆ دەکەونە کوێوە؟ شارەکانی مارکیز و یاقوت حەمەویی ڕۆمی و

غەرناتەیی و قەزوێنی و ڤیرجیل و ساسکۆند دەکەونە کوێوە؟ ئێستا باران بەسەر ماکۆندۆدا دەباریێت. لە مێژە بارانێکی غەمگین بەسەر ماکۆندۆدا دەباریێت. گرینۆی لەم ساتانەدا پاریسی سەدەی هەژدەیەم تەی دەکات. کۆمەڵێك بۆنی ناخۆش بەر لووتی دەکەون و ئەویش لەو بۆنانە ڕادەکات. یاقووتی حەمەوی بە ناو شارەکانی ئاسیادا دێت و دەچێت. تەتەرەکان کتێبخانەکانیان سووتان و ئەویش کتێبەکانی بیر دەکەوێتەوەو غەمیان بۆ دەخوات. ئەم پیاوە چەند حەزی لە دەسنووسەکانە! دەسنووسەکان ئەخیل سەرقاڵ ناکەن. گەرچی ئەو ناوبەناو وێنە لەسەر لم دەکێشێت. ئێستا لەسەر کەناری دەریا دانیشتووەو پشتی کردۆتە شەپۆلی بەیەکداچووی شەڕەکان. زۆر هەڵدەچێت، بەڵام زریێ ناپۆشێت و هێرش ناکاتە سەر تەروادە. ئەو هێشتا وا لەسەر کەنار دەریاکە و چاوەڕێی عوزرخواییە. دەریاکە بەرینە و کۆمەڵێك کەشتیی ڕەشی بەسەردا بڵاوبۆتەوە. ئایا گەر ئەم دەریایە کرایەوە سوپاکان پیا دەپەڕنەوە؟

ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە، هەر لە گریکەوە تا سفرەکانی تەورات و تا داستانەکانی سەدەی سیانزدە (ئیتالیا و ئیزلەندە) و تاشەکسپیر و شالیر و تا ئەم سەردەمانەش. ئەدەب سنوورەکان دەسڕێتەوە. شوێن و کاتەکان ئاوێتە دەبن، لە ژوورێکدا بەند دەبن کە هەموو دونیا دەبینێت.

**سەرچاوە:**

الحیاة – 2006/1/24

# شیعری تازە لە وەرگێڕاندا لە نێوان زمانەکاندا

**پێشکەشکردن و ڕانان:**

**شێرزاد حەسەن**



*چامەی "دەربەندی پەپوولە"ی شێرکۆ بێکەس لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناوی "شیعری تازەی وەرگێڕدراو" لە تەك دەیەها شاعیری دیکە بڵاوبۆتەوە کە سەر بە وڵات و نەتەوەی جیاوازن. شاعیرەکان جگە لە کاك شێرکۆ بێکەس، بولگاری و پونچاپ و سکۆتلەندی و ئیتاڵی و چینی و میسری و فەلەستینی و عبری و ئەڵمانیا تێکەوتووە. بەشێکی درێژی چامەکە لەم کتێبەدا لەلایەن شاعیر و باسکار خاتوو (چۆمان هەردی) کراوە بە ئینگلیزی کە لەگەڵ پێشەکییەك بۆ ناساندنی شاعیر و چامەکە (27) لاپەڕەی داگیرکردووە کە دەکرێت بوترێت بە بەراورد لەگەڵ شاعیرەکانی دیکە گەورەترین پانتایی لە کتێبەکەدا داگیر کردووە.

وەك پێشەکییەك چۆمان ئاوڕی لە بەروار و مێژووی نووسینی ئەو چامەیە داوەتەوە، شتێك لە ناوەرۆك و خەسڵەتی ئەم چامەیەی بە خوێندەواران ناساندووە کە دیارە ئەوەی تێدا دەرخستووە کە چامەکە لە دوای کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجەوە نووسراوە.

هەڵبەتە دیسانەوە ژمارەی قوربانی و داڕووخانی گوندەکان وەك هەمیشە لەم پێشەکییەدا و لە دەیەها نووسین و بابەتی دیکەدا ژمارەی قوربانییەکانی ئەنفال جیاوازی هەیە کە ئەوەش بۆ خۆی گوناهی هەموو ئەو لایەنانەیە کە ئاماری ورد و تەواویان لەلا نییە، دیارە چۆمان پشتی بەسەرچاوەیەك بەستووە کە تیایدا گوندە وێران کراوەکان بە (3000) مەزەندە کراوە، ژمارەی قوربانییەکانیش بەسەد هەزار و هێرشە کیمیاوییەکانیش بە (40) هێرش مەزەندە کراوە، بەڵام قوربانییە مەدەنییەکانی ناو هەڵەبجە بە (5000) دیاریکراوە، کە دیارە لێرەدا ئاماژەی بەوە داوە کە لە میانەی پرۆسە جەهەننەمییەکانی ئەنفال و کارەساتی هەڵەبجە و لە دەرئەنجامی کاریگەری گازی ژەهراوی بە هەزارەهای دیکە مردن و دەربەدەربوون. ئەم سەرسام و هێدمەگرتی بووە کە هەموو دونیا لە بەرامبەر ئەو کارەساتانەدا بێدەنگ بوون، لەبەردەم درندەیی و دڵڕەقییەکی بێ وێنەدا خامۆش بوون.

شاعیر دەیەوێت بگەڕێتەوە وڵات و بۆ قوربانییەکانی شین و واوەیلا بکات و دڵیان بداتەوە و پرسە دابگرێت بۆ بەردەوامی خوولی مەرگەساتی کورد (چەوسانەوەی بەردەوام و شۆڕش و هەڵگەڕانەوە و پاشان دامرکاندنەوە و کوژانەوەی شۆڕشەکان). لەم چامەیەدا شاعیر هەوڵیداوە هەموو ئەو شاعیرانە بدوێنێت کە وەك ئەم لە تاراوگەدا بوون، لە سەدەی شازدەوە تا ئەمڕۆکە (بە تایبەتی نالی، حاجی و مەولەوی) چامەکە لە کانوونی دووەمی (1991) و لە وڵاتی سوید چاپکرا، لەسەروبەندی جەنگی کەنداودا کە هەڵگەڕانەوەو ڕاپەڕینی کوردان و ناوچە شیعە نشینەکانی بەدوادا هات، لە بەهاری 1991دا شێرکۆ بێکەس توانی دوای چەند مانگێك لە چاپکردنی کتێبەکە بگەڕێتەوە کوردستان. هەر لەو وەختەدا توانی بۆ ماوەی دوو سەعات پتر ئەو چامەیە لە بەردەم جەماوەرێکی وت و وریادا بخوێنێتەوە. یەکەمجار لە کاسێتێکەوە گوێ بیستی ئەم شیعرە بووم هەتا بەرلەوەی کتێبەکە ببینم، من شیعرەکەم خۆشویست و هەندێك پارچە و کۆپلەیم ئەزبەر کرد.

شیعری کوردی نوێ خەسڵەتەکانی دیار و زۆر دامەزراوترە لە شیعری ئینگلیزی، پڕە لە لێکچوون و خوازە و وێنەی سوریالی و ئەبستراکت، ئەوانە فاکتەری گرنگن بۆ نووسینی شیعر لە زمانی کوردیدا. لە خاکێکدا کە چەندەها مەرگەسات خامۆشانە تیایدا ڕوو دەدەن، وڵاتێك کە تیایدا جیاوازی ئاوو هەوا لە نێوان زستانە سەختەکانی و هاوینە سووتاوەکانیدا (50) نمرەیە، شتێکی سەیر و سەمەرە نییە کە شیعرەکەمان ئەوەندە هاوشانی ژیان بێت و ئەوەندە دیوە زۆر جیاواز و دژوارەکانی ژیان دەربخاتەوە. شێرکۆ بێکەس لە چوار دەیەی ڕابردوودا فیگەرێکی سەرەکی ناو شیعری کوردییە، لەگەڵ ئەوەشی کە هەندێك جار ئیماژ و زمانەکەی گران دەکەوێتەوە، بەڵام لە شیعرەکانی تا ئەوپەڕی جەماوەر و خوێندەواران لە دەوری کۆدەبنەوە. ئەم پتر شاعیری بەرگرییە و کەش و هەوای شیعرەکانی بۆنی سیاسەتییان لێدێت، هەتا ئاووهەواو مەل و ئاژەڵەکانیش بەدەر نین لەو بۆن و بەرامەیە، لە دەربەندی پەپوولەدا و لە گەرمەی قسەکردن لەسەر خودی خۆی وەك کەسێك بازێك دەدات و وەك کوردستان قسە

لەسەر خۆی دەکات. ئەم چامەیە بە کۆمەڵێك ئاماژەو گوزارشت دەوڵەمەندە – "شاخی سەرم" و "لق و پۆپی یان چرۆی دەست و پەنجەکانم" و "خونچەی فرمێسکەکان" و "گوڵە خەزیمی فرمێسکەکانی" و "تیشك و تیرێژی قژی".. هتد. هەندێك جار ئیماژەکانی – وێنەکان – ئەوەندە تێکچڕژاون کە کەوتنە دوایان زەحمەت دەبێت، بۆ نموونە: شاعیر باس لە (نالی) دەکات کە چۆن ڕووەو تاراوگە ملی ناوە و چووەتە ئەستەنبول، لە ژێر لێزمەی بارانی پایزدا، پاشان باس لەو بارانە دەکات کە بەسەر "بەردێکی لەجێ لەقیو یان هەڵکەنراودا" دەبارێت کە ئەوەش بۆ خۆی خوازەیەکە کە (نالی) خۆی چی بەسەرهاتووە – پیاوێکی لە جێ هەڵکەنراو. پاشان ئەو بارانە لە لێکچوونێکدا دەبێت بە بارانی فرمێسك و پاشان بە بەفری تواوە چونکە شاخی شنروێ (نزیك بە شاری هەڵەبجەیەو نالی لەوێوە هاتووە) لە ژێر زەبری بۆمباراندا سووتاوە:

سەر پەڵە پاییزەی ئەم کۆچەی
رواوی سەر بەردی هەڵکەنراو
هەلاڵەی فرمێسکی گوێ زەڵمە
گۆرانی بەفرێکی "شنروێ"ی هەڵقرچاو

گرفتێکی دیکەی وەرگێڕانی ئەم شیعرە ئەوەیە کە پڕە لە ئاماژەی مێژوویی و جوگرافیایی و کەلتووری ناو دونیا و ژیانی کوردەواری. گەلێ کەسایەتی زیندوو کراونەتەوە، هەر لە شاعیرانی تاراوگە و سەرهەڵگرتوو (نالی، حاجی، مەولەوی و گۆران) تا بە پێشەوا شۆڕشگێڕەکانی وەك (شێخ مەحمود و خەندان) جگە لە پێشەنگەکانی ئایین (مەولانا) و مێژوونوس (حیلمی) و (جەلادەت) ی رۆژنامەنووس و عاشقە ناودارەکان (برایمۆك، لاس و خەزاڵ). زۆر جاران شوێنەکان، شاخەکان و کێڵگەو باخ و بێستانەکان بەو کەسانەوە پەیوەستن، بۆ نموونە: لە (کەکۆن – حاجی–دا) کە کۆنە گردێکە نزیك شارۆچکەی کۆیسنجق کە حاجی شاعیر لەوێوە هاتووە.

سەرباری هەموو گرفت و کێشەکان، من بۆ خۆم لە ڕادەبەدەر چێژم لە وەرگێڕانی ئەم شیعرە بینی. شێرکۆ بێکەس چەند چامەیەکی درێژی تری هەیە، بەلاَم (دەربەندی پەپوولە) لای من لە هەموویان خۆشەویسترە. ئەم چامەیە لە هەر کتێبێکی دیکە پتر کە من خوێندبێتمەوە دەمخاتەوە بەردەم تاراوگە، ڕەوی بە کۆمەڵ، ستەمی سیاسی مەرگەساتەکانی ناو مێژووی کوردی. هیوادارم کە خوێندەواران بە زمانەکەی ئاشنا بن، ستایل و شێوە و ئاماژەکان، چێژی لێ ببینن وەکو ئەوەی کە شایەستەیە.

دڵۆپ، دڵۆپ باران: گوڵ ئەنووسێتەوەو
نمە نمەیش چاوانم تۆ!..
چ سالاَوێکی نامۆیی و چ ژانێکی بەخشندەیە
وا لەسەرخۆ
بەر بە بەردی
کێوی سەرم ئەپشکوێنن
لق بە لق و چڵ بە چڵی
دەست و پەنجەی وشك هەلاَتووم
شین ئەکەن و وەك باویلکە
ئەمدەن بە دەم بارێزکەی ئەوێنتەوەو
لە شەختە بەندانی گیانتا: ئەمرسکێنن.

لە بەرگی دواوەی ئەم کتێبەدا کۆپلەیەکی نۆ دێری لە چامەکەی کاك شێرکۆ بێکەس – دا بلاَو کراوەتەوە لە پاشبەندی ئەم چەند دێرەدا:

"سەرکێشی نووسەر لەگەڵ وشە و نووسیندا لە شکسپیر–

ەوە دەست پێناكات، بەڵكو لەگەڵ شیعری گاڵتە ئامێز و لایەلایەی دایك دەست پێدەكات، لەگەڵ سلاید-شۆ كە تیایدا چیرۆكی جنۆكان و پەرییەكان و دێوو درنجەكان سەرنجت ڕادەكێشێت، لە ڕێی قووڵترین یادەوەری هەتا بەرلەوەی منداڵ زمانی بپژێت، یادكردنەوەی ئەو گەڵا تەڕانەی پایز بۆ من دەگەڕێتەوە ڕۆژانی ژیانم لە بولگاریا، بە واتا من یادەوەریم بولگارییە، بۆیە من تا ماوم لە ماڵی زمانی ئینگلیزیدا كرێ گرتەم. هەر لەبەر ئەوە من لە ڕووی جوگرافییەوە بێ ئۆقرەم و نائارامم، هەمیشە بۆ ماڵێك دەگەڕێم كە جێگەی ماڵە كۆنەكەم بۆ بگرێتەوە كە ئاشكرا دیارە لەسەر زەمین بوونی زەحمەتە.

(بەشێك لە نووسینی شاعیری بولگاری: كاپكا كەسابۆڤا)

## سەرچاوە:

*MPT/ Modern poetry in Translation*

*Third Series – Number Four*

*Between the Languages*

*Edited by: David & Helen Constantine*

*2005*

# چەند كورتە ڕۆمانێك

**ربیع جابر**

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**



ڕۆمانی كورت هونەرێكی قورسە. هونەرێكی باویش نییە. ئەگەر خوێنەرێكی هاوچەرخ ویستی لیستێك بەو ڕۆمانە كورتانەی كە خوێندوویانەتەوە بكات چی كۆدەكاتەوە؟ یابانییەكان حەز لە ڕۆمانی كورت دەكەن، ئەمریكاییەكان مەیلی ڕۆمانی ئەستووریان هەیە. "پیرەمێرد و دەریا"ی هێمنگوەی دەرچوون بوو لەم بنەمایە. ئەو ڕۆمانە كورتەی هێمنگوەی لەیەك ژمارەی گۆڤاری (تایم)دا بڵاوكرایەوە و لە شەوو ڕۆژێكدا یەك ملیۆن دانەی لێ فرۆشرا. ئایا دەشێت بڵێین ڕۆمانی كورت چیرۆكێكی درێژە؟ وەڵامەكەی نەرێیە. خواستی ڕۆمان خواستی چیرۆك نییە. چیرۆك داخوازیی ئەو شتانە ناكات كە ڕۆمان دەیكات. ڕۆمان داخوازیی داهێنانی دنیایەكی هاوتەریبی دنیاكەمانە. چیرۆك — لەو ڕووبەرە سنووردارەیدا — ئەو توانایەی نییە، هەرچەند ناوبەناو ئارەزووی ئەوە دەكات. چیرۆكەكانی خۆرخەلویس بۆرخس نموونەیەكی بەرچاون.

دەشێت پێناسەی چیرۆكەكانی بە ڕۆمانی زۆر كورت بكەین.

بۆرخس خۆی لە نووسینی ڕۆمان لادا بە بەهانەی ئەوەی كە تەمەڵە. جارێكی دیكە وتی ڕۆمان قایلی ناكات. وتی: ڕۆمان بێ شێوەیە، شێوەی نییە. وتی: چیرۆكی كورت هونەرێكی گێڕانەوەی بیركارییانەی زۆر قایلكەرە و لە بری ئەوەی كە ڕۆمانێك بنووسێت دەربارەی نەهەنگێكی سپی كەناوی "مۆبی دیك"ە، چیرۆكێكی كورت دەنووسێت بەناوی "بەرەنگاربوونەوە"وە بەجۆرێك كە ڕۆمانی "مۆبی دیك" ببێتە پەراوێزێكی كورت بۆی. لە چیرۆكی "بۆچوونێك بۆ پەناگایەك" وا خۆی دەردەخات

کە پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەیی دەربارەی ڕۆمانێکی ڕاستەقینە دەنووسێت، کە دەزانین کەس نەینووسیوە. بۆرخس دەڵێت: دەشێت درێژترین ڕۆمان کورتبکرێتەوە بۆ چەند دێڕێك. ئەمە دەربارەی ژیانی مرۆڤیش دەوترێت. بۆرخس ڕۆمانی نەنووسی، بەڵام ئەمە ڕێگر نەبوو لە هۆگربوونی بە نووسینەکانی (ستیڤنسن). جار لە دوای جار دەگەڕایەوە بۆ خوێندنەوەی "دکتۆر جیکل و مستەر هاید"، ئەو ڕۆمانە کورتەی — لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا نووسراوە — کە دەرگای بەسەر دنیایەکی سەیردا بۆ والآکرد. ڕۆمانەکە بە پیاسەکردنێکی شەوانە لە شەقامێکی بەردیندا کە بە چرای گاز ڕۆشنکراوەتەوە دەستپێدەکات. ئەم وێڵگەیە چییە؟ دوو زەلام ڕۆژێك (نیوەڕۆ؟ دوای نیوەڕۆ؟ دەمەو ئێوارە؟) لە شاری لەندەندا پیاسە دەکەن، یەکێکیان سەرچڵییەکی شەوێکی دێتەوە یاد و دەیگێڕێتەوە. لە گەشتێکەوە شەوێك بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە، شەقامەکان چۆڵبوون و تەمێکی تەنك دایپۆشیبوون، دووریانەکان یەك لەدوای یەك بەرەو ڕووی دەهاتن، هەموو ئارامبوون و لەناو ڕۆشنایی چراکاندا مەلەیان دەکرد، شارەکە ئارامبوو.. شەو بوو کاتی گەڕانەوەکەی کاتێك کە زەلامێکی سەیری بینی، بوونەوەرێکی سەیر کە کچێکی دەشێلاو بەردەوامبوو لەسەر ڕۆیشتنەکەی.. ڕۆمانە ئەندێشەییەکەی ستیڤنسن زەلامێك دەگۆڕێت بۆ شێوەی ئاژەڵێك. لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا گریگۆری سامسا دەگۆڕێت بۆ مێروویەك. کافکا نوسخەیەکی نوێی ڕۆمانەکەی ستیڤنسنی نەنووسییەوە. ڕۆمانی "گۆڕان" ڕۆمانی "دکتۆر جیکل و مستەر هاید" نییە. لە ڕۆژژمێرەکانی کافکادا ڕۆمانێکی دیکەی تەواونەکراویان بەرچاو دەکەوێت. "وێستگەی هێڵی ئاسنی کلدا" نموونەیەکە. کافکا تەمەنێکی کورت ژیا. تۆڵستۆی، لە بەرامبەردا، تەمەنی هەشتا ساڵەی تێپەڕکرد. لە دوا چارەکی تەمەنیدا ژمارەیەك ڕۆمانی کورتی نووسی. هەندێکیان هێشتا لە ژیاندا بوو بلاوکرانەوە، هەندێکیشیان لە پاش مردنی لە ساڵی 1910، ژنەکەی بلاویکردنەوە. "مەرگی ئیڤان ئیلچ" (1886) ڕۆمانێکە کافکا و ستیڤنسن پێکەوە تێپەڕ دەکات.

شێوازی نووسینی تۆڵستۆی هاوشێوەی نەبوو. کافکا بەسەرسامییەوە چەند جارێك خوێندییەوە. هەردوو کافکا و ستیڤنسن هۆگری دانپیدانانەکانی ئەمبراتوری ڕۆمانی مارکۆس ئۆریلیوس بوو. ستیڤنسن لە تەمەنێکی کورتدا مرد. نەگەیشتە سەدەی نۆزدەهەم. تۆڵستۆی لە پێش ستیفنسندا لە دایك ببوو، بەڵام بە لەشێکی ساغەوە و گیانێکی بەرینەوە گەیشتە سەدەی بیستەم. نەخۆشی سیل ستیڤنسنی ماندوو کرد و کافکای کوشت، بەڵام تۆڵستۆی سیل نەیکوشت. لە ڕۆمانی "مەرگی ئیڤان ئیلیچ"دا زەلامێك دەبینین کە خەریکە لە پەیژەیەکە بکەوێت. دەیەویست دڵنیا بێت لە جێگیریی پەردەی سەر پەنجەرەیەك. پێی دەخلیسکێت و خەریکە لە پەیژەکەوە بکەوێتە خوارەوە، بەڵام هاوسەنگیی خۆی ڕادەگرێت و بازدەدات. پتەویی جەستەیی یارمەتییدەدات و تەنها بە سووکی کەمەری بەردەکەوێت. زۆر بایەخ بە زەبرەکە نادات و نازانێت گورچیلەی بەرکەوتووە و لە ناوەوە خوێنی لێدەڕوات و ئەمەش کۆتاییەتی. تۆڵستۆی

بەشێوەیەك وێنای بەرەنگاربوونەوەی زەلامەکە لەگەڵ مەرگدا دەکات دەڵێی وەسفی دیمەنێکی سروشتی دەکات. تۆڵستۆی توانایەکی ترسناکی هەبوو. خوێنەری یاداشت و نامەکانی بۆی دەردەکەوێت کە زۆر هۆگری دانپێدانانەکانی مارکۆس ئۆریلیوس بوو. دوای "شەڕ و ئاشتی" خۆی فێری زمانی یۆنانی کرد و دووبارە نووسینەکانی هۆمیرۆسی خوێندەوە. وزە لە جەستەیەوە هەڵدەقولا. دوای "ئانا کارنینا" فێری زمانی عیبری بوو و دووبارە تەوراتی خوێندەوە. هەندێك چیرۆکی ئایینی و نائایینی نووسی. لە نێوان سالأنی 1896 و 1904 دا "حاجی مراد"ی نووسی. "قەشە سەرجیۆسی"ی لە ساڵی 1898دا تەواو کرد. ئەم دوو کورتە رۆمانە ساڵی 1911، پاش مردنی، بلأوکرانەوە. "حاجی مراد" رۆمانێکە دەربارەی دوو جیهان. پیاوێك خێزان و میللەت و شاخەکانی شیشان بەجێدەهێڵێت و پەیوەندی بەرووسە دووژمنەکانەوە دەکات. رۆژهەلأت بەجێیدەهێڵێت و دەچێت بۆ رۆژئاوا. (لەم رۆژانەدا وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی بلأوکرایەوە). تۆڵستۆی لە "حاجی مراد"دا چی دەنووسێت. وێنای ملهورێکی رۆژهەلأتی (شامیلی سەرکردەی یاخیبووەکانی شیشان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم) و ملهورێکی رۆژئاوایی (نیقولای یەکەم، قەیسەری روسیا) دەکات. لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا "حاجی مراد" دەبینین کە دەچێت بۆ ئەو دیوی سنوور و لە ئاهەنگی رووسەکاندا ژنانی شان رووت و دەم بە پێکەنین و پیاوانی رەنگ سوور دەبینێت کە دەخۆنەوە. ئەمیش بە جلی باوی میللییەوە و دەست لە سەر خەنجەر و بە دوو چاوی وردبینەوە سەیریان دەکات. چارەنووسی چیدەبێت؟

رۆمانە بەسەری بڕاو کۆتایی دێت. خوێنی سوور لە نێوان شانەکانەوە فیچقە دەکات، بەلأم خوێنی رەش لە سەرییەوە دێت. گیای ژێر لاشەکەش سەوزە. ئەم سێ رەنگە چی دەگەیەنێت؟ تۆڵستۆی نووسەرێکی ئاسایی نییە. ئەو وردەکارییانەی ئەندێشەیان دەکات کوشندەن.

کێ قەشە سەرجیۆسی لە یاد دەچێت کە لە پەناگەکەیدا وەستاوە و گوێی لە دەنگی ژنێکە و ورشەی کەراسەکەی لە دەرەوەدا؟ خوا پەرستەکە لە ئەزموونەکە دەترسێت. هێشتا نازانێت کە پەنجەیەك بە تەور دەبڕێت، هێشتا نازانێت رێگاکانی ژیان بەرەو کوێی دەبەن. ئایا تۆڵستۆی هەموو چیرۆکەکەی دەزانی پێش نووسینی؟ قەشە سەرجیوس لە ئەشکەوتە داخراوەکەیدا وەکو پڵنگی ناو قەفەزێك دەخولێتەوە. تەم چۆتە ناو ئەو بەفرەی کە زەویی داپۆشیوە. چرایەك هەڵدەگرێت و نزیکدەبێتەوە. رووناکی چراکە لەسەر شووشەکە تیشکدەداتەوە. رووی نزیکدەکاتەوەو سەرنجدەدات. هەردوو لەپی چەسپاندووە بە لاجانگەکانییەوە و سەرنجی دەرەوە دەدات. لە پڕ روخساری ژنێك سەرسامیدەکات.

ئەمەش لیستی چەند رۆمانی کورتە: "ئاشبەز" نووسینی بانانا یۆشیموتۆ، "جوانە نوستووەکان" نووسینی یاسۆناری کاواباتا، "نارایاما" نووسینی شیچیرۆ فۆکوزاوا، "کۆتر" نووسینی پاتریك ساسکەند، "ئاوریشم" نووسینی ئەلیساندرۆ باریکۆ، "بەدبەختییەکی ئاسایی" نووسینی پیتەر هاندکە، "پێدرۆ

پارامۆ" نووسینی خوان رۆڵفۆ "چەند تێبینییەك لە ژێر خاكەوە" نووسینی دۆستۆیڤسكی.

هەموو ئەم رۆمانانە لە ناخی شتەكانەوە وێنە دروستدەكەن. قارەمانی رۆمانی "ئاشبەز، لەگەڵ ورەوڕی یەخچاڵەدا دەنوێت، پاش مردنی نەنكی لە ژوورێكدا بە ئاگادێتەوە كە هەڵمی قۆریی چایەكە پڕیكردووە. پیرەمێردەكەی رۆمانەكەی كاواباتا لە جێگاكەی راكشاوە و سەیری جوانە نوستووە دەكات و بیر لە درەختێكی گێلاس دەكاتەوە كە پڕە لە گوڵی سپی. پیاوێك دایكە پیرەكەی داوە بە كۆڵیدا و بەسەر چیای (نارا)دا سەردەكەوێت. ریگاكە دژوارە و لە ژێر داربەڕووەكەدا ئێسقان و دەفری دارین بڵاوبووتەوە. پیاوەكە نازانێت كە تۆزێكی دیكە بەفر دەبارێت، بەڵام دایكی دەپاڕێتەوە و داوای ئەم بەفرە دەكات. پیاوێكی دیكە دەكەوێتە چاڵێكەوە و قەلەرەش لە چاڵەوە وەكو ستوونێكی ئاو بەردەوام هەڵدەقوڵن. ئەم وێنە شیعرییانە لە كوێوە بۆ (فۆكۆزاوا) هات؟ لە گۆرانییەكی میللییەوە؟ جۆناسان نوێڵ دوا ژەمی ئێوارەی دەخوات. هەڵووژەكە پاك دەكات و ناوكەكەی دەخوات. پاشان توێكڵەكەشی دەخوات. هەستكردن بە تام. تامی پەنیرەكە (پەنیریش هەبوو. ئەی چۆن لە بیرمچوو؟) دایكی نووسەر لە رۆمانی "بەدبەختییەكی ئاسایی" دەڕوات و دەڕوات و دەڕوات، سەر ئێشەش بێزاری دەكات. گفتوگۆ كورتەكانی خوان رۆڵفۆ. رستە سەرەتاییەكانی و بۆنی لە یادكراوی كۆمالاو كەوتنی میگێل لە ئەسپەكەیەوە لە تەمەكەدا. تەمێك كە دەچێتە كۆنۆچكەكانی لەشەوە، مردنیش نزیكدەبێتەوە و پیاوەكە نازانێت. دێڕە بەراییەكانی رۆمانەكەی دۆستۆیڤسكی. ئەم دەنگە نەخۆشە. پیاوێك گلەیی لە نەخۆشی دەكات. باسی جگەری دەكات. ئایا جگەری نەخۆشە یان رۆحی؟ دەزوویەكی رەش ئەم رۆمانە كورتانە پێكەوە دەبەستێتەوە. كێ دەتوانێت ئەم دەزووە رەشە بكاتەوە.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (الحیاة)

2006/4/18.

# رێخراوەكەی فرانز كافكا

## ربیع جابر

**لە عەرەبییەوە: هەورامان**



**وریا قانع**

پیاوێك نامەیەكی بەدەست دەگات، نامەكە ناونیشانی لەسەر نییە، ئەم نامەیە لە كوێوە هاتووە؟ لەسەر كاغەزی نامەكە هەندێ زانیاری هەیە: (ساڵی 1990 لە براگ رێخراوێك دامەزراوە، ناوی رێخراوەكە: رێخراوی فرانز كافكایە). پیاوەكە كافكا دەناسێ، كافكا ساڵی 1883 لەدایك بووە، ساڵی 1924 كۆچی دوایی كردووە. پیاوەكە بەرهەمەكانی كافكای خوێندووەتەوە، رۆمان و چیرۆك و دەقە سەیر و بچوكەكانی خوێندووەتەوە. نامەكانی خوێندوەتەوە، پیاوەكە كافكا

دەناسیٚ، بەڵام ئەوە یەکەمجارە گوێی لەم ڕێخراوەبێت.

ڕێخراوەکە سیٚ ئامانجی هەیە، یەکەمیان دانانی پەیکەرێکی کافکایە لە گۆڕەپانێك لە گۆڕەپانەکانی شاری (پراگ)، بڵاوکردنەوەی سەرجەم کارەکانی کافکا لە ئەڵمانیەوە بۆ چیکی، دروستکردنی خەلاتێکی جیهانی، ساڵانە بدرێت بە نوسەرێك کە بکەوێتە گفتوگۆکردن لەگەڵ کافکا و ئەدەبەکەی.

نامەکە نە واژۆی لەسەرە نە بەروار، ئایا ئەمە فڕوفێڵێك نییە؟ پیاوەکە ئەنتەرنێت دەکاتەوە، داخۆ ئەم ڕێخراوە ڕاستیە یاخود خەیاڵییە؟ نەڕێخراوەکە خەیاڵییە نە پەیکەرەکە و نە پاداشتەکەش، کارەکانی کافکا وەردەگێڕدرێن و بڵاودەکرێنەوە، ڕەنگە هەموو کارەکانی بڵاوکرابنەوە، تەنها مەسەلەی ئەم نامەیە دەمێنێتەوە، لەوانەیە ئەمە مەتەڵێك بێت.

پەیکەرەکە لە برۆنزە، بەرزییەکەی لە چوار مەتر کەمترە، کێشی 700 کیلۆگرامە، ساڵی 2003 بە بۆنەی تێپەڕینی 120ساڵ بەسەر لەدایك بونی کافکا، پەردەی لەسەرلابرا. خەڵاتەکە خەیاڵی نییە، تاکو ئەمڕۆ بەخشراوە بە شەش کەس، یەکەمجار ساڵی 2001 بەخشرا بە "فلیب ڕۆپ"ی ئەمریکی، دووەمجار ساڵی 2002بەخشرا بە چیکی "ئیڤان کلیما"خاوەنی (خۆشەویستی و پاشەڕۆ)، سێیەمجار ساڵی 2003بەخشرا بە هەنگاری "پیتر ناداس"، چوارەمجار ساڵی 2004 بەخشرا بە نەمسایی "ئەلفریدا یلینك"، پێنجەمجار ساڵی 2005 بەخشرا بە شانۆکار "هارۆلد پنتر"، شەشەمجار ساڵی 2006 بەخشرا بە "هارۆکی مۆراکامی" خاوەنی (کافکا لەسەر ڕۆخی دەریا).

"یلینك"بە چەند مانگیٚ دوای وەرگرتنی خەڵاتی کافکا، خەڵاتی نۆبڵیشی وەرگرت، ساڵی 2005 ئەمە لەگەڵ "هارۆلد پنتر" دوبارە بووەوە، "پنتر" خەڵاتی کافکای وەرگرت پاشان خەڵاتی نۆبڵیشی وەرگرت. ئەمە سەیرە! تۆبڵێی "مۆراکی" خەڵاتی نۆبڵی 2006 وەربگریٚ؟

پاداشتی خەڵاتی کافکا چەندە؟ خەڵاتی کافکا بریتیە لە دانەیەك لەو پەیکەرە برۆنزیەی لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە کە پەیکەرتاشی چیکی "یاروسلاف ڕۆنا" دروستیکردووە، دانەیەکی بچوکی پەیکەرەکە لەگەڵ بڕی دە هەزار دۆلاری ئەمریکی، ئەم زانیاریانە لە نامەکەدا نەهاتبوو، وەلیٚ لە ئەنتەرنێتدا هەبوو، کافکا ئەنتەرنێتی نەزانیوە، ئەو پێش 41 ساڵ لەمەوبەر مردووە، وەك پێویست نەژیا، نەخۆشی (سیل) کوشتی، لە نامەیەکیدا دەڵێ (ئەو ململانیٚ دەرونیە بەردەوامەی لە ناخیدایە– ململانێیەکە لەنێوان ئەو کەسایەتیانەی لە قوڵایی ناخیدایە– "سییەکانی"کون کون کردووە)، کافکا خەوبینینەکانی خۆی دەنوسیەوە، لەکاتی نوسینەوەیاندا دەبوون بە ئەدەب، ئەو ئەدەبەشە کافکای بۆ ئێمە بە زیندووی هێشتوەتەوە؟

(نامەیەکی ئیمپراتۆریانە) تێکستێکی بچوکی کافکایە کە تەنها یەك کەسایەتی لەخۆدەگریٚ، ئەو کەسایەتیە نامەیەکی هەڵگرتووە و مەسافەکان دەبڕیٚ. ڕێکخراوی فرانز کافکا، 650 ئەندامی هەیە، خاوەنی کتێبخانەیەکە کە هەمان کتێبخانە تایبەتەکەی کافکایە و 1000کتێبی لەخۆگرتووە. کتێبخانەکەی کافکا دەمانبات بۆ لای "کتێبخانەکەی بابل".

بۆرخیس ئەو خەڵاتەی کافکا بەدەست ناهێنێت، چونکە ئەو مردووە و خەڵاتەکەش نادرێت

بەوانەی کۆچیان کردووە، بۆرخیس دانی بە کاریگەری ئەدەبی کافکادا ناوە لەسەر ئەدەبەکەی خۆی، بەتایبەتی لە هەردوو چیرۆکی (کتێبخانەکەی بابل) و (کۆنگرە). کێ شایەنی وەرگرتنی خەڵاتی کافکایە؟ ئەو پیاوە شایەنی ئەم خەڵاتەیە کە لەساڵی 1983 ڕۆمانی (ژیانی مایکل "ك" و قەیرانەکانی) نوسیی، هەروەها ئەو پیاوە شایەنی ئەم خەڵاتەیە کە ساڵی 1990 ڕۆمانی (کێوی ڕۆح)ی نوسی. ئەم دوو ڕۆمانە زۆر بە ڕاشکاوانە لە ئەدەبی کافکاوە نزیکن. ڕۆمانی "مۆراکی" کە لە ئەدەبی کافکاوە نزیکبێت، دواهەمین ڕۆمانی نییە، بەڵکو ئەو ڕۆمانەیەتی کە ساڵی 1985 بە ناوی (کۆتایی جیهان و وڵاتی سەیروسەمەرە)وە نوسیویەتی، هەروەها ڕۆمانی (خۆشەویستی و پیسی)ی "کلیما" گفتوگۆیەکی ڕاستەقینەی لەگەڵ کافکادا تێدایە، کافکا لەو ڕۆمانەدا و لە میانەی پەیوەندی گێڕەرەوە (نوسەر) بە هاوسەر و کچە هاوڕێکەیەوە، ئامادەبونێکی قووڵ و بەرچاوی هەیە.

(نامە ئیمپراتۆریەکە) تێکستێکی یەك لاپەڕەییە و دەربارەی پیاوێکە ئێواران لە پشت پەنجەرەکەیەوە دادەنیشێ و چاوەڕوانی نامەیەکە لە ئیمپراتۆرەوە، ئیمپراتۆر پێش ئەوەی بمرێ، لەسەر جێگای مردنەکەی نامەکەی بۆ دەنێرێ، پیاوەکە لە کوخێکدا و لە سنوری دەسەڵاتی ئیمپراتۆردا نیشتەجێیە، ئاخۆ ئیمپراتۆری نەخۆش بۆچی نامەی بۆ دەنێرێ؟ تۆبڵێی نامەکە بگات؟ تەتەرەکە دەبێ کۆشکەکە ببڕێ، دەبێ شار و کێڵگەکان لە سەفەرێکی درێژدا تەیبکات، ئەم مەسافە ناکۆتاییە چۆن چۆنی تەیدەکرێ؟ ناتوانێ ئەو مەسافە درێژە ببڕێ؟ لەگەڵ ئەوەشدا پیاوەکە ئێواران لە پشت پەنجەرەکەوە دادەنیشێ و چاوەڕوانە.

**سەرچاوە:**

دار الحياة – 2006/5/16

